# ئاگادارکردنەوەی عەبدەکان لە حوکمی

# دێمۆکڕاسیەت و دەنگدان

نووسینی:

## عبدالإله عبدالعدل

لە بەرواری

١٣|شعبان|١٤٣٩

بڵاوکراوەتەوە لە ئینتەرنێت

بسم الله الرحمن الرحيم

# ئاگادارکردنەوەی عەبدەکان
# لە حوکمی دێمۆکڕاسیەت و دەنگدان


نووسینی:

**عبدالإله عبدالعدل**

# دەستپێک

**الحَمْدُلله المُشَرِّعِ كَفَرْنا بالأنْداد، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى مَن بُعِثَ بالسَّيفِ رَحْمَةً للْعباد، وَعَلى مَن سارَ عَلى نَهجِهِ وَسَلَّم لأمْرِ رَبِّه وَانْقاد. أما بعد:**

وا بەچاوەکانی خۆمان دەبینین چۆن ئەم قەومە لە زۆربەی ڕووەکانی ژیانیان گەڕاونەتەوە سەر ڕێچکەی جاهیلیەتی قەومە تیاچووەکانی پێش ئیسلام.

ئەی قەومەکەم، ئەمڕۆ ئێوە بەبێ ئەوەی هەست بەخۆتان بکەن خەریکن مومارەسەی پیسترین جۆری شەریعەتی دروستکراوی مرۆڤەکان دەکەن، کە ئەویش شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتە.

قەومەکەم بەجۆرێک بێ ئاگان لە شەریعەتی ألله، تەنانەت دەسەڵاتدارەکان بە ئاشکرا پێناسەی دێمۆکڕاسیەتیان بۆ دەکەن و دەڵێن: دێمۆکڕاسیەت بریتییە لە حوکمی گەل، وە هەر دێمۆکڕاسیەتیش حوکمی هەتا هەتایی دەبێت لە کوردستان!

ئەمە جگە لەوەی بە ئاشکرا ڕۆژانە دەسەڵاتدارەکان دەڵێن دێمۆکڕاسیەت جێبەجێ دەکەین و دەیسەپێنین! کەچی دەبینین ئەم قەومە دڵیان بەم قسانە نالەرزێ، ناڵێن ئەم وشانە مانای چی دەگەیەنن، نازانن ئەم گوفتارانە چەند پێچەوانەن لەگەڵ کتێبەکەی پەروەردگاریان[1]؛ هۆکاریش ئەوەیە کە ئەم قەومە بەتەواویی پشتیان

---

(١) پەروەردگار، یاخود پەروەردەکار: لە زمانی عەرەبیدا واتە "الرب"، جا پەروەردگاری گەردوون و مرۆڤایەتی بریتییە لە ألله. کاتێکیش دەڵێین "ألله پەروەردگارە" مەبەستمان ئەوەیە کە ألله لە تێکڕای کار و کردەوەکانی خۆیدا تاک و تەنهایە و نابێت هاوبەشی بۆ دابنێین، لە نموونەی کردەوە پەروەردگارییەکانی ألله:

یەکەم: لە ڕووی دروستکردنەوە (الخلق).

دووەم: لە ڕووی پێدانی ڕزقەوە (الرزق).

سێیەم: لە ڕووی یاسادانانەوە (الحاكمية).

چوارەم: لە ڕووی بەڕێوەبەرایەتی گەردوونەوە (الإدارة).

پێنجەم: لە ڕووی خاوەندارێتیی گەردوونەوە (الملك).

ئەمانە کردەوە پەروەردگارییەکانی ألله ن، دەبێ موسڵمان لەهەموو ئەمانە ألله تەوحید بکات.

هەڵکردووە لە قورئان. هەرگیز دیراسەی ناکەن و مانا و مەبەست و تەفسیری ئایاتەکان نازانن. تەنانەت ئەمە دەیسەلمێنێ ئەم قەومە بێ ئاگان لە بناغەی موسڵمان بوون، کە ئەویش بریتییە لە تەوحید کردنی ألله؛ چونکە موسڵمان تەنها تەوحیدی بەسە بۆ ئەوەی بزانێت هەموو شەریعەتێک تاغوتە لە غەیری شەریعەتی ألله[1]، هەروەک ألله فەرموویەتی {**... يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ...**}[2]. واتە: {... ئەوانە دەیانەوێت دادگەرێتیی بگەڕێننەوە بۆ تاغوت لەکاتێکدا فەرمانیان پێکراوە کەوا کوفری پێ بکەن ...}.

هەر بۆیەش دەبینین قەومەکەمان ئەسڵەن نازانن تاغوت چییە، بۆیەش بێباکانە دەچنە سەر سندوقەکانی دەنگدان و پەنجەی شایەتومانیان مۆر دەکەن، دەسەڵاتدارانیش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە دەڵێن: دەنگدان پڕۆسەیەکی دیمۆکڕاسییە! قەومەکەشم نازانن دیمۆکڕاسیەت چییە و مانا و مەبەستی چی لەخۆی گرتووە. ألله فەرموویەتی {**أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون**}[3]. واتە: {ئایا ئەوانە حوکمی جاهیلیەتیان دەوێت؟ و ئایا حوکمی کێ باشترە لە حوکمی ألله بۆ قەومێک کە بڕوای تەواویان هەیە؟}. ئەوەتا قەومەکەم، ببینن چۆن ألله پێمان دەڵێت لە غەیری شەریعەت و حوکمی خۆی ئیتر تێکڕای شەریعەت و حوکمەکان بریتین لە حوکمی جاهیلیەت، ئەگەرچی ئەوان دەڵێن ئێمە مۆدێرنە و تازەین، بەڵام لەڕاستیدا ئەوان پەیڕەوی شەریعەتە دەستکردەکانی پێشی ئیسلام دەکەن.

بۆیەش بە ناوی ألله و پشتیوانیی ألله هەوڵدەدەم شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتتان پێ بناسێنم لەگەڵ چەند دروشم و بنچینەیەکی ئەم شەریعەتە. هەروەها حوکمەکانیان ڕوون دەکەمەوە لەسەر بنەمای ئایاتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی نێردراوەکەی –عليه الصلاة والسلام–. هەروەها ئەگەر پێویستی کرد ئەوا گوفتاری

---

(١) لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا بە پوختی باسی تەوحید کراوە لەژێر ڕۆشنایی ئایاتەکانی قورئانی پیرۆز.

(٢) سورەتی النساء، ئایەی ٦٠.

(٣) سورەتی المائدة، ئایەی ٥٠.

زانایانی ئەهلی سوننە –رحمهم الله– دەهێنمە ناو باسەکە. بەڵام زۆرتر دەمەوێ بابەتەکە بە قورئان و سوننە ڕوون بکەمەوە –پشتیوان بە ألله.

داواکارم ألله من و خوێنەران سوودمەند بکات و ڕێنیشاندەرمان بێت بەرەو بەدەست هێنانی عیلمی شەرعیی، هەروەها دڵمان پاک بکاتەوە تاکو لە کتێبەکەی تێبگەین و کردەوەی پێ بکەین و حەق و ناحەق لەیەکتر جیا بکەینەوە –أللهم آمین.

**عبدالإله عبدالعدل || ١/رجب/١٤٣٩**

# بەشی یەکەم

# ناساندنی دێمۆکراسیەت و بنچینەکانی و دروشمەکانی لەگەڵ حوکمەکانیان

بابەتی یەکەم: سەرهەڵدان و مانای دێمۆکراسیەت.
بابەتی دووەم: پاڵنەرەکانی چەسپاندنی دێمۆکراسیەت لە خاکی موسڵمانان.
بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دێمۆکراسیەت.
بابەتی چوارەم: دروشمەکانی دێمۆکراسیەت.

# پێشەکییەکی گرینگ

# پێناسەی تاغوتی شەریعەت

ئەی قەومەکەم، چاک بزانن کەوا ألله فەرمانی پێمان کردووە کەوا کوفر بە تاغوت بکەین ئینجا باوەڕ بە ئەو بهێنین، هەر کەسێک باوەڕی بە ألله هەبێت و بیپەرستێ کەچی کوفری بە تاغوت نەکردبێ ئەوا موسڵمان نییە، ألله فەرموویەتی: {**... فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ...**}[(١)]. واتە: {... هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە ألله بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}.

بێگومان ناشتوانرێت کوفر بە تاغوت بکرێت تاکو نەزانرێت تاغوت چییە، ألله لە کتێبەکەیدا ڕوونی کردووەتەوە کەوا تاغوت چییە و جۆرەکانی چین و چۆنیش کوفر بە تاغوت و تاغوتپەرستەکان بکەین. ئەمەیان بە پوختیی لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا باسکراوە.

یەکێک لە جۆرەکانی تاغوت کە ألله لە کتێبەکەیدا باسی دەکات و پێویستە کوفری پێ بکرێت و بەڕائەتی لێ بکرێت بریتییە لە «تاغوتی شەریعەت».

**پێناسەی تاغوتی شەریعەت:** هەر سیستەم و شەریعەت و دەستوور و یاسا و مەنهەج و پرۆگرامێک دەگرێتەوە لە غەیری شەریعەت و دەستووری ئیسلام. واتە هەر دەستوور و یاسایەک کەوا هەڵبژێردراوە لەلایەن دەسەڵاتداران بۆ حوکمڕانیی کردن، هەروەها داڕێژراوە لەلایەن دادوەر و حاکمەکان بۆ حوکمدان لەنێوان خەڵکیدا لەکاتی بوونی کێشە و ناکۆکییەکان. بەبێ ئەوەی لەسەر بنەمای ئیسلام داڕێژرابێ.

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

بەڵگەشمان لەسەر ئەم پێناسەیە بریتییە لەم ئایەتە پیرۆزە ڕۆشنەی ألله: **{ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم ءامنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا}**[1]. واتە: {–ئەی محمد– ئەوە تۆ ئەو کەسانەت نەبینیوە کە وای پیشان دەدەن گوایە باوەڕیان بەو کتێبە هەیە کەوا بۆتۆ دابەزیوە هەروەها باوەڕیان بەو کتێبانەیشی پێشی تۆ هەیە –کەچی لە هەمان کاتدا– دەیشیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای تاغوت لەکاتێکدا فەرمانیان پێکراوە تاکو کوفری پێ بکەن، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور}.

کاتێک تەدەبوڕ و تێڕامان دەکەین لەم ئایەتە پیرۆزەی ألله، دەگەینە ئەنجامی چەند خاڵێک:

**یەکەم:** ألله لە ئایاتەکەدا ئەو کەسانەی بە درۆ خستەوە کەوا خۆیان وەکو موسڵمان پیشان دەدا؛ ئەمەش چونکە کوفریان بە تاغوت نەکردبوو. کەواتە هەرگیز هیچ کەسێک ئیماندار و موسڵمان نییە ئەگەر سەرەتا تاغوتەکان نەناسێت و کوفر بە تاغوتەکان و تاغوتپەرستەکان نەکات، ئەگەرچی نوێژکەر و ڕۆژووگر و موجاهیدیش بێت، هیچ کامێکیان سوودی نییە و لەلایەن ألله بەدرۆ دەخرێتەوە. جا ئەی قەومەکەم بەجوانیی خۆتان لە تەوحید ئاشنا بکەن، منیش بەپوختیی بۆتانم باس کردووە لەبەشی کۆتایی، دواتر چاک تێی ڕابمێنن بۆ ئەوەی عیبادەت و دینداریيەکەتان بەفیڕۆ نەچێ.

لە هەمان کاتیشدا بۆمان دەرکەوت کە ئیمان تەنها بە دەم و زمان نییە، ئەمەش وەڵامێکە بۆ ئەو مەلایە خائین و دینفرۆش و فێڵبازانەی کەوا دەڵێن: خەڵکینە هەر کەسێک بڵێت "لا إله إلا الله" ئەوا موسڵمانە و نابێ کەس تەکفیری بکات ئەگەرچی کوفر و شیرکیشی لێ ببینرێ! ئەوەتا ألله بە ئاشکرا کەسانێکی تەکفیر کرد کە

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٦٠.

بانگەشەی موسڵمانێتیان دەکرد! ئیتر بۆچی خیانەت لە ألله دەکەن و دینەکەی ألله دەشێوێنن لەم قەومە بەستەزمانە؟

**دووەم:** لە ئایەتە پیرۆزەکەدا چاک دەردەکەوێت کەوا لە غەیری شەریعەتی ئیسلام ئیتر تێکڕای شەریعەت و دەستوورەکانی تر "تاغوت" ن، حوکمی تاغوتیش زۆر ئاشکرایە کە دەبێت تەکفیر بکرێت و نابێ حوکمی پێ بکرێت، و هەروەها دەبێ تەکفیری هەر کەسێک بکرێت کەوا تاغوت دەپەرستێ و باوەڕی بە تاغوتە و حوکمی کێشەکانی دەگەڕێنێتەوە بۆ تاغوت، هەروەک لە لاپەڕی ٧ ئاماژەم پێکرد. کەواتە هەر کەسێک نەیەوێت قوڕئان ببێتە حاکم بۆ چارەسەری کێشەکەی ئەوا بەبێ هیچ گومانێک ئەو کەسە موشریکە و باوەڕی بە تاغوت هەیە، هەر کەسێکیش باوەڕی بە تاغوت هەبێ ئەوا کافرە؛ چونکە ألله دەفەرمووێت کوفری پێ بکەن، کەچی ئەو موماڕەسەی دەکات.

نموونەی حوکم و شەریعەتە تاغوتییەکان زۆرن، وەکو: دیمۆکڕاسیەت، عەلمانیەت، شیوعیەت، لیبراڵیەت، ئیشتیراکیەت، لە هەمان کاتدا کتێبە پووچەڵ و دەستکردەکانی گاور و جولەکەکان. ئەمانە کۆمەڵێک شەریعەتی تاغوتن و لە بری شەریعەتە پاک و بێگەردەکەی ألله حوکمیان پێ دەکرێت لەنێوان خەڵک، هەر کەسێک کێشەکانی بگەڕێنێتەوە بۆ دادگای وڵاتێک کە بە شەریعەتێکی تاغوت بەڕێوە دەچێ ئەوا گومان لە کافربوونی نییە؛ چونکە حوکمی گەڕاندووەتەوە بۆ لای تاغوت، ئیتر ئایەتەکەی پێشووی لەسەر جێبەجێ دەبێت.

**سێیەم:** کاتێک تێڕامان لە ئایەتە پیرۆزەکە دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها شەریعەت و یاسایە دەستکردەکە تاغوت نییە، بەڵکو ئەو دادوەرەش دەبێتە تاغوت کە حوکم دەکات بە شەریعەت و یاسایە تاغوتییەکان.

جا بۆیەش ئەهلی تەوحید هیچ گومانێکیان لەوە نییە کە تێکڕای شەریعەت و یاسایە دەستکردەکان تاغوتن جگە لە شەریعەت و یاسایە پیرۆزەکەی ألله. هەروەها

گومانمان لەوە نییە کە ئەو دادوەرەی حوکم بەو یاسا دەستکردانە دەکات ئەوا ئەویش تاغوتە.

ئەم پێشەکییەش لەبەر دوو هۆکاری گرینگ باسکرا:

**هۆکاری یەکەم:** تاکو خوێنەر بزانێت کەوا لەم کتێبەدا کاتێک باسی "دێمۆکڕاسیەت" دەکەین ئەوا قسەمان لەسەر بابەتێکی زۆر هەستیار و ترسناکە، ئەویش بابەتی "تاغوتی شەریعەت" ـە، بۆیەش دەبێ خوێنەر بەتەواویی خۆی بپارێزێت لەم تاغوتە نوێیە، خۆ ئەگەر کەسێک مومارەسەی هەر دروشمێکی ئەو شەریعەتە تاغوتییە بکات ئەوا بەبێ گومان پێی کافر دەبێت ئەگەرچی خۆیشی بە موسڵمان بزانێت، ئایەتە پیرۆزەکەی پێشووش ڕۆشنترین بەڵگەیە. لە بەشی داهاتوودا باسی چەند بنچینە و دروشمێکی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت دەکەم بۆ ئەوەی خۆتانی لێ بپارێزن. بابەتەکە زۆر لەوە ترسناکترە کە مەلا خائینەکان ئاسانیان کردووە لەبەرچاوی خەڵک.

**هۆکاری دووەم:** دەمەوێت خوێنەران چاک ئەوە بزانن کە بابەتی "تاغوتی شەریعەت" زۆر جیاوازە لە بابەتی "الحكم بغير ما أنزل الله". بۆیەش دەبینین مەلایە دینفرۆشەکان ئەم دوو بابەتە لە خەڵک تێکەڵ دەکەن؛ چونکە چاک دەزانن ئەم قەومە پشتیان لە قورئان کردووە و لێکۆڵینەوە ناکەن، جا با بەیەکەوە بزانین جیاوازیی ئەم دووانە چییە:

**جیاوازیی یەکەم: تاغوتی شەریعەت** بریتییە لە شەریعەت و دەستوورێکی کامل و فراوان و گشتگیر کە پێکهاتووە لە ژمارەیەکی زۆر لە یاسای جۆراوجۆر لە هەموو بوارەکانی ژیان، واتە دەستوورێکی فراوانە و داڕێژراوە بۆ ئەوەی سەروەر بکرێت بۆ بەڕێوەبردنی تەواوی خاکەکە لە هەموو ڕوویێک. یاساکانیشی لەسەر بنەمای خواست

و ئارەزووی کەسانێک دانراون، یاخود بە دەنگدان دانراون، بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ شەریعەتی ألله.

بۆ نموونە: شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت بەتەواویی پێناسەی تاغوتی شەریعەتی لەسەر جێبەجێ دەبێت؛ چونکە شەریعەتێکی فراوانە و دەوڵەتانێکی پێ بەڕێوە دەبرێت، لە هەمان کاتیشدا بنچینە و ئەسڵ و دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت بەتەواویی پێچەوانەی ئیسلامن، بۆیەش دیمۆکڕاسیەت تاغوتی شەریعەتە.

**بەڵام الحكم بغير ما أنزل الله:** حاڵەتێکە کە لە خاکەکە هیچ شەریعەتێکی تاغوت سەروەر نییە بەڵکو شەریعەتی ألله سەروەرە، بەڵام حاکمە موسڵمانەکە لە حاڵەتێک یان چەند حاڵەتێکی کەمدا پشت لە حوکمی قورئان و فەرموودە دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، بەڵکو خۆی بەشێوازێکی تر چارەسەری دەکات، جا ئەمەش بە هەر هۆکارێک بێت. بۆ نموونە حاکمێک هەیە لەناو دەوڵەتێکی ئیسلامیی کەوا حوکمەکانی لەسەر بنەمای شەرع دەدات، بەڵام کاتێک براکەی دەهێننە لای و تۆمەتی زینای دەدەنە پاڵ، ئیتر ئەو حاکمە برای خۆی خۆشدەوێت و نایەوێ ئابڕووی بچێت بۆیەش ئیتر حوکمەکە هەڵدەوەشێنێتەوە و دەڵێت بێ تاوانە و نابێ حەددی زینای لەسەر جێبەجێ بکرێت!

**جیاوازیی دووەم: لە تاغوتی شەریعەت** هەر کەسێک مومارەسەی شەریعەتە تاغوتەکە بکات یاخود باوەڕی بە یەکێک لە بنچینەکانی شەریعەتە تاغوتەکە هەبێت یاخود حوکمی کێشەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە ئەوا بەبێ گومان یەکسەر کافر دەبێت؛ چونکە خودی شەریعەتەکە تاغوتە و دەبێ کوفری پێ بکرێت نەک مومارەسە بکرێت و حوکمی کێشەکانی بۆ لای بگەڕێندرێتەوە!

**بەڵام لە "الحكم بغير ما أنزل الله"** دا بابەتەکە بەپێی حاڵی کەسەکان دەگۆڕێت و نابێ یەکسەر حوکمی کافر بوون بدرێت، واتە ئەگەر –بۆ نموونە– حاکمەکە لە خاکی دەوڵەتی ئیسلامیدا باوەڕی تەواوی بە حوکمی دەست بڕین هەبوو کەچی حوکمی پێ

نەکرد لەپێناوی بەرژەوەندیی خۆی یاخود لەپێناوی بەرژەوەندیی کەسەکە ئەوا لەو حاڵەتەدا کافر نییە، بەڵکو موسڵمانێکی فاسقە، یاخود موسڵمانێکی زاڵمە. بەڵام ئەگەر حوکمی دەست بڕین جێبەجێ نەکات لەبەر ئەوەی باوەڕی بە حوکمەکە نەبێ ئەوا بەبێ گومان پێی کافر دەبێ؛ چونکە حوکمێکی شەرعیی ڕەتکردووەتەوە کە بەڵگەی ڕۆشنی لەسەرە.

بەڵگەش لەسەر ئەو سێ حاڵەتەی "فاسق" و "زاڵم" و "کافر" بریتییە لە هەر سێ ئایەتی ألله: {... **ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الفاسقون**}[١]. واتە: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی کە ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە فاسقن}.

هەروەها: {... **ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الظالمون**}[٢]. واتە: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی کە ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە زاڵمن}.

هەروەها: {... **ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**}[٣]. واتە: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی کە ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە کافرن}.

بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو حاڵەتەی "تاغوتی شەریعەت" و "الحكم بغير ما أنزل الله" تەنها دەبێ بزانین لە خاکەکەدا دەسەڵاتدارەکان چ شەریعەتێکیان سەروەر کردووە و دادوەرانیش حوکم بە چ شەریعەتێک دەکەن، ئەگەر زانرا لە خاکەکەدا شەریعەتێکی غەیری ئیسلام (وەکو دیمۆکراسیەت) سەروەرکراوە و حوکمی پێدەکرێ ئەوا بێگومان خاکەکە دارولکوفرە و دەسەڵاتدار و حاکمەکانیشی تاغوتپەرستن.

بەڵام ئەگەر بینیمان خاکەکە بە شەریعەتی ألله بەڕێوەدەچێت و کێشەکانیش بە قورئان و سوننە یەکلا دەکرێنەوە نەک هیچ شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوتی وەکو

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٧.

(٢) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٥.

(٣) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٤.

عەلمانیەت و دێمۆکڕاسیەت، ئەوا بێگومان خاکەکە دارولئیسلامە و دەسەڵاتدارانیشی وەلی ئەمرن و حاکمەکانیشی موسڵمانن ئەگەرچی کەموکوڕیشیان هەبێت.

مەلا دینفرۆشەکان ئەم دوو باسە لە خەڵک تێکەڵ دەکەن؛ تاکو دەسەڵاتداران بپارێزن لە تەکفیر کردن، بۆ ئەوەی خەڵک هەرگیز بیری بۆ شتێک نەچێت بەناوی "تاغوتی شەریعەت"، ئەوان چاک دەزانن ئەگەر خەڵک بزانن تاغوتی شەریعەت چییە ئەوا هیچیتر بەشداریی لە دروشمەکانی دێمۆکڕاسیەت ناکەن.

# ناساندنی دێمۆکڕاسیەت و بنچینەکانی و دروشمەکانی لەگەڵ حوکمەکانیان

## بابەتی یەکەم: سەرهەڵدان و مانای دێمۆکڕاسیەت.

دێمۆکڕاسیەت (Democracy) لە بنچینەدا لە دوو وشەی یۆنانی پێکهاتووە کە بریتین لە "Demos" کە بەمانای "گەل" دێت. هەروەها وشەی "Kratos" کە بەمانای "دەسەڵات" دێت.

**کەواتە دێمۆکڕاسیەت:** بریتییە لە حوکمڕانی کردنی گەلێک بە دەستی خۆیان، بەجۆرێک کە هیچ حوکم و هێزێک گەورەتر نەبێت لە حوکم و بڕیارەکانی گەلەکە.

شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت لەنێو قەومەکانی ڕابردوودا بوونی هەبووە، بەتایبەت دەگووترێت کەوا دێمۆکڕاسیەت شەریعەتی یۆنانییەکان بووە، بۆ ئەمەیان بەڵگەم لەبەر دەست نییە.

بەهەرحاڵ، ئەوەی کە گومانی تێدا نییە بریتییە لەوەی دێمۆکڕاسیەت لەدوای ڕاپەڕینی خەڵکی فەڕەنساوە بەشێوازێکی نوێتر و فراوانتر لە ساڵی ١٧٨٩ سەریهەڵدا؛ هەموو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بێزاربوونی خەڵک لە حوکمڕانییە پیس و چەوت و پووچەڵەکەی گاورە موشریکەکان، ئەوان ستەمێکی زۆریان لە خەڵک دەکرد و حەقی خەڵکیان بە ناحەق دەخوارد و خۆیان کردبووە پەروەردگار و خوای خەڵک: واتە پاپایەکان ئینجیلی ئەسڵیان دەشاردەوە و بەدڵی خۆیان شەریعەتیان دادەڕشت و خەڵکیان ناچار دەکرد تاکو گوێڕایەڵی حوکمە دەستکردەکانیان بن لەکاتێکدا کەوا

ألله شەریعەتێکی گونجاوی بۆیان ناردبوو بەڵام قەشەکان دەیانشاردەوە. کەواتە قەشەکان هەم خیانەتیان لە ألله دەکرد و هەمیش خیانەتیان لە مرۆڤەکان دەکرد.

خەڵکەکەش هەڵسان بە بەرپاکردنی شۆڕشێک لەدژی قەشەکان، ئەوەبوو لەنێو گێژاوی کوفرێکەوە دەرهاتن و چوونە ناو گێژاوێکی تری کوفر! شەریعەتی دیموکراسیەتیان ڕاگەیاند و بڕیاریاندا ئیتر مرۆڤەکان خۆیان یاسا بۆخۆیان دابنێن ئەگەرچی یاسا و خواستەکانیان پێچەوانەی ئاینەکان بێت.

بەداخەوە، هەر ئەمەیە سەرئەنجامی خیانەت کردن لە ألله –سبحانە وتعالی–، هەر ئەمەیە سەرئەنجامی حوکم نەکردن بە شەریعەتەکەی ألله.

کەواتە زانیمان دیموکراسیەت بەمانای "حوکمی گەل" دێت، بەجۆرێک کە هیچ حوکمێک گەورەتر نییە لە حوکم و بڕیارەکانی گەلەکە.

با بزانین حوکمی ئەمە چییە...

**دەڵێم:** ڕێک بەپێچەوانەی شەریعەتی دیموکراسیەت، لە شەریعەتی ئیسلامدا گەل حاکم نییە و نابێ حوکمە شەرعییەکان دابڕێژێت، هەروەها حوکمەکانی گەل ناکەونە سەرووی هەموو حوکمێک، بەڵکو "شەریعەتی ألله" لە حوکمی مرۆڤەکان گەورەترە، بۆیەش نابێ مرۆڤ هیچ حوکم و یاسایەک دابڕێژێت کەوا پێچەوانەی ئایاتەکانی ألله بێت، بەڵام زۆر ئاساییە ئەگەر مرۆڤەکان یاسا دابڕێژن لە بابەتە جۆراوجۆرەکانی ژیان، بەو مەرجەی یاساکە بەرهەڵستی شەریعەتی ألله نەکات.

ألله فەرموویەتی: {**إن الحكم إلا لله ...**}[1] واتە: {بەڕاستیی حوکمدان تەنها بۆ ألله یە ...}. هەروەها فەرموویەتی: {**... ولا يشرك في حكمه أحدا**}[2] واتە: {... هیچ کەسێک بەشدار نییە لە حوکمەکانی ئەو –واتە ألله}.

---

(١) سوڕەتی یوسف، ئایەی ٤٠.

(٢) سوڕەتی الكهف، ئایەی ٢٦.

لەم ئایاتە پیرۆزانە –هەروەها ژمارەیەک ئایەتی تریش– دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا یەکێک لە کارە پەروەردگارییەکانی ألله (واتە الربوبیة) بریتییە لە یاسادانان و حاکمیەت. پێویستە لەو کارەدا مرۆڤەکان ألله تەوحید بکەن، واتە: نابێ بەهیچ جۆرێک هاوبەش بۆ ألله دابنێین لە یاسادانان (واتە التشریع) و حاکمیەت، هەروەک چۆن نابێ هاوبەش دابنێین لە پەرستن. هەر چ کەسێکیش باوەڕی وابێت کەوا مرۆڤەکانیش دەتوانن شەریعەتێکی بەرفراوان دابڕێژن بەبێ گەڕانەوەیان بۆ شەریعەتی ألله، ئەوا بێگومان موشریکن، زانایان بەم جۆرە شیرکە دەڵێن (شرك الطاعة).

کەوابێ هەر کەسێک باوەڕی بە "حوکمی گەل" هەبوو، واتە باوەڕی وابوو کە مرۆڤەکان هێز و توانایان هەیە تاکو یاسادابنێن لە هەموو ڕوویەکەوە بە ئارەزووی خۆیان و بەبێ هیچ سنوورێک، ئەوا بێگومان ئەو کەسە موشریکە و شیرکەکەیشی گەورەیە؛ چونکە زانایان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە هەر جۆرە شیرکێک کەوا لە قوڕئان باسکرابوو ئەوا شیرکی گەورەیە و ئەنجامدەرەکەی پێی لە دین دەچێتە دەرەوە بەبێ هیچ عوزرێک، ئەگەرچی جاهیل بێت و نەشزانێ کارەکەی کوفرە، ئەگەرچی خۆیشی بە موسڵمان بزانێ، ئایاتەکانی لاپەڕی پێشوو باشترین بەڵگەن لەسەر تاک و تەنهایی ألله لەڕووی یاسادانان و داڕشتنی شەریعەت. مرۆڤیش لەو کارەدا هیچ ڕۆڵی نییە.

## بابەتی دووەم: پاڵنەرەکانی چەسپاندنی دیمۆکڕاسیەت لە خاکی موسڵمانان.

### پاڵنەری یەکەم: مەلایە دینفرۆشەکان (علماء السوء).

بێگومان کارێکی وا ئاسان نییە کەوا شەریعەتێکی وەکو دیمۆکڕاسیەت بچەسپێت لەناو قەومێک کە شانازیی بە دینەکەی ألله بکەن! بەڵام کۆمەڵێک پاڵنەر هەن ئەگەر لەناو هەر قەومێکدا هەبوون ئەوا بە ئاسانیی دیمۆکڕاسیخوازەکان ئەو قەومە دەخەنە ژێر کۆنترۆڵی شەریعەتە پیسەکەیان.

ئەی قەومەکەم، ئەی قەومی کورد، بەڕاستیی ئەم پاڵنەرانەی باسیان دەکەم وەکو دەرد و نەخۆشین، لەناو هەر قەومێکدا ئەم نەخۆشییانە بوونیان هەبێت ئەوا ئیللا دەکەونە بەر شاڵاوی دیمۆکڕاسیەت یاخود هەر شەریعەتێکی تری تاغوت. بێگومان ئەم نەخۆشییانە لەناو قەومی کورد هەبوون و ئێستاش ماون بۆیەش دیمۆکڕاسیەت بەسەرتان سەپێندراوە، با بزانین چین...

جا گرینگترین و یەکەمین پاڵنەر بۆ ئەوەی دیمۆکڕاسیەت –یاخود هەر شەریعەتێکی تاغوتی تر– لەناو خاکی موسڵمانان خۆی بسەپێنێت بریتییە لە بوونی مەلایە دینفرۆشەکان (علماء السوء).

**دەتوانین پێناسەیان بکەین بەوەی:** کەسانێکن کە ألله حیکمەت و زانستی شەرعیی بەشێوازێکی فراوان پێداون و دەتوانن بەتەواویی قەومەکەیان هۆشیار بکەنەوە و شارەزایان بکەن لە دینەکەی ألله، بەڵام لەبەر ئەوەی تەقوای ألله لەدڵیاندا نییە، بۆیەش دینەکە بۆ قەومەکەیان باس ناکەن و لێیانی دەشارنەوە، لە هەمان کاتیشدا قەومەکەیان گومڕا دەکەن، حەق دەکەن بە ناحەق، ناحەقیش دەکەن بە حەق. جا بەهۆی ترسەوە بێت، یاخود بەهۆی وەرگرتنی پارە بێت لە دەسەڵاتدارە ستەمکار و تاغوتەکانیان، یاخود هەر هۆکارێکی تر.

ألله –تبارك وتعالى– باسی زاناکانی جولەکە و گاورەکانمان بۆ دەکات؛ تاکو زاناکانی ئیسلام عیبرەتی لێ وەرگرن و خیانەت لە قەومەکانیان نەکەن و دینەکە وەکو خۆی بگەیەنن و نەیشارنەوە، هەروەک فەرموویەتی: {**وإذ أخذ الله ميثاق الذين أوتوا الكتاب لتبيننه للناس ولا تكتمونه فنبذوه وراء ظهورهم واشتروا به ثمنا قليلا فبئس ما يشترون**}(١) واتە: {جا ئەو کاتەی ألله پەیمانی لەو کەسانە وەگرت کە زانستی کتێبەکانیان هەبوو (واتە تەورات و ئینجیل) بەوەی کە –زانستەکەیان– بۆ خەڵک ڕوون بکەنەوە و نەیشارنەوە، کەچی خستیانە سەر پشتی خۆیان و فرۆشتیان بە نرخێکی کەم، ئای کە خراپ و بێسوودە ئەو شتەی کڕیویانە}.

هەروەها ألله فەرموویەتی: {**إن الذين يكتمون ما أنزل الله من الكتاب ويشترون به ثمنا قليلا أولئك ما يأكلون في بطونهم إلا النار ولا يكلمهم الله يوم القيامة ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم**}(٢) واتە: {بەڕاستیی ئەو کەسانەی کەوا ئەو زانستە دەشارنەوە کە ألله لەناو کتێبەکەی دایبەزاند (واتە تەورات)، هەروەها دەیفرۆشن بە نرخێکی کەم، ئەوا ئەو کەسانە هیچ ناخۆن لەناو سکیان جگە لە ئاگر، هەروەها ألله لە ڕۆژی هەڵسانەوە (القيامة) قسەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە –لە تاوانەکانیان– هەروەها سزای بەئێشیان بۆ هەیە}.

هەروەها ألله –عز وجل– دەفەرمووێ: {**الذين ءاتيناهم الكتاب يعرفونه كما يعرفون أبنآءهم وإن فريقا منهم ليكتمون الحق وهم يعلمون**}(٣). واتە: {ئەوانەی کە کتێبیان پێدابوون (واتە قەشە و حاخامەکان) چاک پێغەمبەر دەناسن هەروەک چۆن منداڵەکانیان دەناسن، بەڕاستیی کۆمەڵێکیان حەق دەشارنەوە لەکاتێکدا دەشزانن حەقە}.

---

(١) سورەتی آل عمران، ئایەی ١٨٧.

(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ١٧٤.

(٣) سورەتی البقرة، ئایەی ١٤٦.

ئەوەتا ئەی قەومەکەم، وەک بینیتان ألله چۆن باسی حاخام و قەشەکانمان بۆ دەکات، پێمان ڕادەگەیەنێت زانستێکی زۆریان هەبوو لەبارەی تەوڕات و ئینجیل، تەنانەت دەیانزانی پێغەمبەرمان –صلى الله عليه وسلم– لەسەر حەقە، بەڵام خیانەتیان لە ألله کرد و شاردیانەوە لەپێناوی بڕێکی کەم لە ماڵی دونیا. بێگومان ألله لە دوو ئایەتەکەدا وەسفی ماڵی دونیای بە "ثمنا قليلا" کردووە؛ ئەمەش چونکە حاخام و قەشەکان ئەگەر بەقەد ئەم زەویەش ماڵ و سامان بەدەست بهێنن بەهۆی شاردنەوەی دینەکەیان، ئەوا هێشتا نرخەکەی هیچ نییە بەبەراورد بەم کتێبانەی بۆیان دابەزیبوو، بۆیەش سەرئەنجام لە دونیا و دواڕۆژدا ڕیسوا دەبن.

جا ئەی قەومەکەم، توندترین هۆشداریتان پێدەدەم، بەڕاستی لەناو ئوممەتی محمد دا ئەم جۆرە مەلایانە زۆر زۆرن کە لەسەر ڕێچکە پیسەکەی گاور و جولەکەن، جا نەکەن سەرسام بن بە سیمای مەلاکان، نەکەن هەڵخەڵەتێن بن بە عەمامە و جبەکانیان، نەکەن سەرسام بن بە ڕیش و گوفتارە بریقەدارەکانیان، نەکەن سەرسام بن بە گریان و فرمێسکەکانیان، نەکەن سەرسام بن بە زۆریی ژمارەی کتێب و دەرسەکانیان. بەڵکو خۆیان و دەرس و کتێبەکانیان هەڵسەنگێنن و بەراوردیان بکەن بە قورئان و سوننە، بزانن ئایا بانگەوازی تەوحید دەکەن یان نا، بزانن خەڵک فێر دەکەن کەوا چۆن کوفر بە تاغوت بکەن یاخود نا. بزانن هەرگیز بەهۆی بانگەوازەوە تووشی ئازار و ناڕەحەتیی و ئەشکەنجە بوونەتەوە یان نا. ئەگەر هەرگیز باسی تەوحیدیان بۆ خەڵک نەکردبوو ئەوا لێیان بترسن و لێیان دوور بن؛ چونکە ئەمانە بازرگانیی بە شەریعەتەکەی ألله دەکەن هاوشێوەی حاخام و قەشەکان.

**لەوانەیە خوێنەر بپرسێ:** مەلایە دینفرۆشەکان چۆن ڕۆڵ دەبینن لە چەسپاندنی دیمۆکراسیەت؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: ئەو مەلایانە بە دوو شێواز دەبنە هۆکاری چەسپانی دیمۆکراسیەت، یەکەم: بە شێوازی ناڕاستەوخۆ. دووەم: بەشێوازی ڕاستەوخۆ.

**یەکەم: شێوازی ناڕاستەوخۆ:** لەم حاڵەتەدا مەلایە دینفرۆشەکە بەهۆی کۆمەڵێک کردەوەی خۆیەوە خەڵکەکە لە شەریعەتی أللە دوور دەخاتەوە بەرەو دێمۆکڕاسیەتی تاغوت. ئەمەش بەم ڕێگایانە:

١- مەلا دینفرۆشەکان یەکەم کاریان ئەوەیە کە تەوحید لە خەڵک دەشارنەوە. لەوانەیە بپرسن و بڵێن: تەوحید پەیوەندیی چی هەیە بە دێمۆکڕاسیەت؟! لە وەڵامدا دەڵێم: پەیوەندیی تەواوی پێی هەیە؛ چونکە هیچ کەسێک نابێتە موسڵمان بەبێ تەوحید، تەوحیدیش دروست نابێت تاکو کەسەکە کوفر بە تاغوت نەکات هەروەک أللە فەرموویەتی: {... **فمن یکفر بالطاغوت ویؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقی ...**}[1]. واتە: {... جا هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە أللە بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}. بێگومان جۆرێکی تاغوتیش بریتییە لە "تاغوتی شەریعەت"، ئەمەش بە پوختیی لە لاپەڕی ٧ باسکرا. جا دێمۆکڕاسیەتیش شەریعەتێکی تاغوتە هەروەک باسم کرد، کەواتە دەپرسم: چۆن بە کەسێک دەگووترێت موسڵمان و موەحید لەکاتێکدا ئەو کەسە کوفری بە دێمۆکڕاسیەت نەکردووە؟!

جا ئەم کردەوەیەی مەلایە دینفرۆشەکان زۆر ترسناکە و هاندەرێکی چاکە بۆ ئەوەی ئەم قەومە بە ئاسانیی تەسلیمی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت ببن؛ چونکە لەوەو پێش هیچ شتێکیان نەبیستووە و نازانن هەموو شەریعەتێک تاغوتە جگە لە شەریعەتی أللە. بەڵکو مەلایە فێڵبازەکە هەر ئاوای فێرکردوون کەوا بڵێن "لا إله إلا الله" ئەوا ئیماندارن و هەرگیز ئیمانیان هەڵناوەشێتەوە مەگەر بڵێن خوا بوونی نییە!!

٢- لەدوای ئەوەی ئەم مەلایە دینفرۆشانە تەوحیدیان لە خەڵک شاردەوە لەکاتێکدا ئەسڵ و بناغەی موسڵمانێتیە، ئیتر مەشغوڵیان دەکەن بە کۆمەڵێک بابەتی تر کەوا بچووکن لە ئاستی تەوحید، بەجۆرێک کە ئەگەر خەڵک ئەنجامیشیان بدات

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

ئەوا لێیان قەبوڵ ناکرێت؛ چونکە تەوحیدیان نییە. وەکو: نوێژ و ڕۆژوو و ئادابەکانی سەفەر و تەجوید و ڕیش و پانتۆڵی کورت و نیقاب و هتد...، ئەمانە کۆمەڵێک بابەتی شەرعین کە دەکەونە دوای زانینی تەوحید، خۆ ئەگەر کەسێک نەزانێت تەوحید چییە کەچی خۆی بە نوێژ و ڕۆژوو و تەجوید خەریک بکات ئەوا با چاک بزانێت هیچی لێ قەبوڵ ناکرێت؛ چونکە ألله فەرموویەتی **{فاعلم أنه لا إله إلا الله واستغفر لذنبك ...}**[1]. واتە: {- ئەی محمد- جارێ چاک بزانە کەوا هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە ألله و -ئینجا- داوای لێخۆشبوون بکە بۆ تاوانەکانت ...}.

ئەوەتا بە ئاشکرا ألله پێمان ڕادەگەیەنێت کەوا زانینی تەوحید و ئەسڵەکانی ئیمان دەکەوێتە پێش ئەنجامدانی عیبادەتەکان. ئەی قەومەکەم، مەلایە دینفرۆشەکان بەوە بناسنەوە کە بەپێچەوانەی ئەم ئایەتە دەجووڵێنەوە، واتە خەڵکیان مەشغوڵ کردووە بە کۆمەڵێک بابەت، کەچی تەوحید و بناغەکانی ئیمان لە خەڵک دەشارنەوە!

ئەم کارەی مەلایە دینفرۆشەکان کاریگەرییەکی تەواوی لەسەر خەڵک هەبووە، وەک بینیومانە کەسانێک موماڕەسەی دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت دەکەن، بۆ نموونە دەچن و پەنجەیان مۆر دەکەن و دەنگ دەدەن، کاتێکیش هۆشدارییان پێدەدەی و پێیان دەڵێیت ئێوە کافربوونە بەهۆی موماڕەسەکردنی شەریعەتێکی تاغوت، ئیتر پێت دەڵێن: کاکە ئەوەتا ڕیشدارین، کاکە ئەوەتا دەڵێین لا إله إلا الله، کاکە ئەوەتا نوێژکەرین. ئیتر بۆچی تەکفیرمان دەکەی؟!

ئەمەش بەرهەمی پەروەردەی ئەم جۆرە مەلایە دینفرۆشانەیە کە خەڵک فێردەکەن تا وابزانن ئیسلام واتە نوێژ و ڕۆژوو. کەچی بانگەوازی تێکڕای پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- بۆ تەوحید و کوفر بە تاغوت بووە، هەروەک ألله فەرموویەتی: **{ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ...}**[2]. واتە: {بەڕاستیی ئێمە

---

(١) سورەتی محمد، ئایەی ١٩.

(٢) سورەتی النحل، ئایەی ٣٦.

لەناو هەموو ئوممەتێک نێردراوێکمان ناردووە کە –پێیان دەڵێت–: ألله بپەرستن و دوورکەونەوە لە تاغوت ...}.

٣- کردەوەیەکی تری مەلایە دینفرۆشەکان ئەوەیە کە حیکمەت و زانستەکەیان بەکاردێنن بۆ ئەوەی پارەی خەڵک بەدەست بهێنن، دەبینین بە خەڵک دەڵێن: فڵانە کۆمەڵە بکوژن و کارەکەتان جیهادە و شەهیدن. کەچی خۆیان لەماڵەوە دانیشتوون و لە ژیانیاندا جیهادیان نەکردووە! یاخود پێشگری "شێخ" و "سەید" بەخۆیانەوە دەلکێنن و خەڵکە گومڕا و موشریکەکەش دێنە لایان و لێیان دەپاڕێنەوە و نوشتە و دوعایان لێ وەردەگرن! یاخود تیایاندایە کەوا زۆر زۆر دژی ئافرەتن! بەجۆرێک کە ئازاری ئافرەتیان داوە لەسەر چەند تاوانێکی بچووک کەوا ئەسڵەن لە ئیسلامدا ئافرەتەکە شایەنی سزا نەبووە! یاخود جیاوازییان دەکرد لەنێوان کوڕ و کچ لە بابەتەکانی وەکو خوێندن و گرینگی پێدان و هتد...، یاخود ئەم مەلایە فێڵبازانە خەڵک دەترسێنن و دەڵێن: خەڵکینە نەکەن خۆتان بە زانستە دونیاییەکان مەشغوڵ بکەن، ئەمانە عیلمی شەیتانن و حەڕامە و نابێ بخوێندرێ! یاخود دەڵێن تەلەفیزیۆن حەڕامە!

ئەم کارە سەیروسەمەرانە هیچیان لە ئیسلامدا بوونیان نییە، بەڵکو ئەو مەلایە دینفرۆشانە لەسەر خەڵکی دەیکەنە دین، بەمەش خەڵکێکی زۆر لەناو قەومەکە ڕقیان لە مەلاکان دەبێتەوە و ڕقیان لە دینیش دەبێتەوە. جا ئەم قەومە هێندە جاهیلیشن کە ناتوانن بچن و خۆیان قوڕئان بخوێننەوە تاکو ڕاستییەکانیان بۆ دەرکەوێت، هەر بۆیەش ڕوو لە شەریعەتێکی دەستکردی وەکو دێمۆکڕاسیەت دەکەن.

**دووەم: شێوازی ڕاستەوخۆ:** لەم حاڵەتەدا مەلایە دینفرۆشەکە هەر خۆی بە شانازییەوە باوەڕی بە دێمۆکڕاسیەت هەیە و خەڵکی بۆ هان دەدات! و پێیان دەڵێت: ئیسلام هیچ کێشەیەکی لەگەڵ دێمۆکڕاسیەت نییە!. ئیتر چەند ئایەت و فەرموودەیەک تەئویل دەکات و قەناعەت بەم قەومە دەهێنێت و ئیتر لەسەر بنەمای فەتوای ئەم

مەلایە دینفرۆشە خەڵک دەچنە سەر سندوقەکان و پەنجەیان مۆر دەکەن وادەزانن جیهادە!

**ئەم مەلایانەش دوو جۆریان هەیە:**

**جۆری یەکەم:** مەلاکە خۆی باوەڕی بە دێمۆکڕاسیەت هەیە و شانازیشی پێوە دەکات و بەناوی ئیسلامەوە فەتوا دەدات و دەڵێت دێمۆکڕاسیەت و ئیسلام هیچ جیاوازیان نییە. ئیخوانە تاغوتپەرستەکان باشترین نموونەن. لە کوردستانیشدا ئەم ئیخوانییانە بەسەر سێ حیزب دابەش بوونە: کۆمەڵ، یەکگرتوو، بزووتنەوە.

ئاگاداریان بن قەومەکەم، بەڕاستی ئەمانە زۆر ترسناکترن لە پارتی و یەکێتی تاغوتپەرست؛ چونکە دوو پێڵاوەکەی ئەمریکا (پارتی و یەکێتی) مومارەسەی دێمۆکڕاسیەت دەکەن و حیساب بۆ ئیسلام ناکەن، کەچی ئەم حیزبە ئیخوانییانە بەناوی ئیسلامەوە مومارەسەی دێمۆکڕاسیەت دەکەن و چەناد ئایات و فەرموودەیەک تەئویل دەکەن! هەمیشە گومان دەخەنە دڵی عەبدە جاهیلەکان؛ بۆ ئەوەی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت لەدڵی ئەم قەومە ساویلکەیە شیرین بکەن، لەم کتێبەدا بەشێکی تەواو تەرخان کراوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ئایەت و فەرموودانەی کەوا –بەحیسابی خۆیان– کردوویانەتە بەڵگە بۆ شەرعیەتدان بە دێمۆکڕاسیەت!

**جۆری دووەم:** مەلایە دینفرۆشەکە دەڵێت دێمۆکڕاسیەت کوفرە، بەڵام ئەوەی مومارەسەی دێمۆکڕاسیەت بکات ئەوا کافر نییە و موسڵمانە! سبحان الله! کەسێک مومارەسەی تاغوت بکات و موسڵمانیش بێت! ئەمەیان لە لاپەڕی ٧ بەپوختیی ڕوونکرایەوە کەوا ئەستەمە کەسێک هەبێت و باوەڕی بە جۆرێک لە جۆرەکانی تاغوت هەبێت کەچی موسڵمانیش بێت! کەچی ئەم کۆمەڵێک مەلای دینفرۆش هەن عەقیدەیان ئاوایە.

ئەی قەومەکەم، وریابن، باشترین نموونەی ئەم جۆرە مەلایە دینفرۆشانە بریتین لە بەناو سەلەفییەکان. لە بەشی وەڵامدانەوەی شوبهەکاندا بەئیزنی ألله وەڵامی بەڵگەکانیان دەدرێتەوە. لێرە هیچ ناڵێم تەنها بە کورتیی باسم کرد.

**بابەتی دووەم: پاڵنەرەکانی چەسپاندنی دیمۆکڕاسیەت لە خاکی موسڵمانان.**

**پاڵنەری دووەم: دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەر و ستەمکارەکان.**

لەدوای مەلایە دینفرۆش و خائینەکان، ئیتر دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەرە ستەمکارەکان بە پلەی دووەم ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لەوەی کە خەڵک بە ئاڕاستەی دیمۆکڕاسیەت بڕۆن.

ئەم دەسەڵاتدارانە کۆمەڵێک کەسن کە دیمۆکڕاسیخواز نین بەڵام حوکم بە شەریعەتی ألله ناکەن، واتە کەسانێکی خۆسەپێنەری تاغوتن وەکو فیرعەون، بە زەبری هێز و ئەمن و ئاسایش خۆیان سەپاندووە و قەومەکانیان دەچەوسێننەوە و ستەمیان لێدەکەن. کۆمەڵێک لە مەلایە دینفرۆشەکان پاڵپشتیان دەکەن و بوونەتە دارودەستەی ئەم دەسەڵاتدارە فیرعەون و تاغوتانە.

هەر کاتێکیش زانایەکی ئەهلی تەوحید بانگەوازی ئەو دەسەڵاتدارە تاغوتە بکات و بیترسێنێ و پێی بڵێ تەسلیمی ألله ببە، ئەوا بەپەلە ئەم دەسەڵاتدارە لەڕێگای دارودەستەکەیەوە خوێنی ئەم زانایە موەحیدە دەڕێژن یاخود دەیخەنە زیندان و ناهێڵن دەنگی بگاتە لای کەس؛ ئەمەش بۆ ئەوەی خەڵک بەهەموو شێوەیەک بێ ئاگا بن لە حەقیقەتی تەوحید و دینەکەیان.

**بەڵگەشمان زۆرە لە قورئاندا کەوا قەومە خۆسەپێنەرە تاغوتەکان چیان بەسەر پێغەمبەران هێناوە و چەندە هەڕەشەیان لێکردوون:** ئەوەتا خەریک بوو پێغەمبەر إبراهیم –صلی الله علیه وسلم– بەرد باران بکەن[1]، دواتر بردیانە ناو ئاگر و هەوڵیاندا بیسووتێنن بەڵام ألله –تبارك وتعالی– ڕزگاری کرد[2]، ئەوەتا خەریک بوو پێغەمبەر

---

(١) سورەتی مریم، ئایەی ٤٦.

(٢) سورەتی الأنبیاء، ئایەی ٦٨ و ٦٩.

شعیب –علیه الصلاة والسلام– بەرد باران بکەن[1]، ئەوەتا خەریک بوو سێ پێغەمبەرەکەی ناوچەی ئەنتاکیە بەرد باران بکرێن[2]، بەهەمان شێوە هەڕەشەی بەرد باران کردن لە پێغەمبەر نوح کرا[3]، ئەوەتا کاتێک فیرعەون هیچی بۆ نەمایەوە، هەڕەشەی بەند کردنی لە پێغەمبەر موسا کرد[4]، دواتر هەر بەمەش نەوەستا، کە بینی ژمارەی ئەهلی تەوحید و ئیمان زۆر بوونە، ئەوە بوو گووتی: دەست و قاچەکانتان دەبڕم، دواتریش لە خاچتان دەدەم[5]، ئەوەتا نەوەکانی ئیسرائیل دەستیان بە خوێنی پێغەمبەران سوور ببوو! [6]، ئەوەتا قەومەکانی پێشووش کاتێک پێغەمبەرەکانیان بانگەوازیان دەکردن ئەوانیش هەڕەشەی دەرکردنیان لێدەکردن[7]، بەتایبەت کە قەومی لوط بڕیاریاندا بە دەرکردنی لوط و ئیمانداران[8]، ئەوەتا بەسەرهاتی حەوت گەنجەکە (أصحاب الکهف) ئاشکرایە کە بەهۆی بانگەوازکردنەوە خەریک بوو قەومەکەیان بەرد بارانیان بکەن[9] بەڵام پێشوەختە ألله –عز وجل– وەحی بۆیان نارد و ڕایانکردە ئەشکەوت لەگەڵ سەگەکەیان[10]، ئەوەتا کەسانێک لە قەومەکانی پێشوو ئێسک و گۆشتیان لەیەکتر جیا دەکرایەوە و بە مشار و ئامێری تیژ دەیانکوشتن تەنها بەهۆی بانگەوازەکەیان[11]، ئەمە جگە لەوەی کەوا کافرانی مەککە پلانیان دانابوو تاکو پێغەمبەری خۆشەویستمان بەند بکەن، یان دەربەدەری بکەن، یاخود بیکوژن[12].

(1) سورەتی هود، ئایەی ٩١.
(2) سورەتی یس، ئایەی ١٨.
(3) سورەتی الشعراء، ئایەی ١١٦.
(4) سورەتی الشعراء، ئایەی ٢٩.
(5) سورەتی الأعراف، ئایەی ١٢٤.
(6) سورەتی آل عمران، ئایەی ١١٢.
(7) سورەتی إبراهیم، ئایەی ١٣.
(8) سورەتی النمل، ئایەی ٥٦.
(9) سورەتی الکهف، ئایەی ٢٠.
(10) سورەتی الکهف، ئایەی ١٦.
(11) کتێبی صحیح البخاري > کتاب المناقب > باب علامات النبوة في الإسلام > فەرموودەی ژمارە: ٣٦١٢.
(12) سورەتی الأنفال، ئایەی ٣٠.

ئەم هەموو پێغەمبەرە پایەدارە –صلی الله علیهم وسلم– لەلایەن قەومە تاغوت و خۆسەپێنەرەکانیان دەمکوت دەکران و لەناو دەبران؛ تەنها لەبەر ئەوەی بانگەوازی تەوحیدیان دەکرد و قەومەکانیان دەترساند.

جا کاتێک زانایە موەحید و حەقبێژەکان نەمان یاخود دەستبەسەر کران، ئەوا خەڵک بەتەواویی گومڕا دەبن و کەسیان نییە ڕێنموییان بکات بەرەو حەق، بۆیەش ئیتر ئەو خەڵکە بێکەس دەبن و شەیتانیش دەیانخاتە تەڵەی خۆی. هەروەک هاوەڵی خۆشەویست سەلمانی فارسی –رضي الله عنه– فەرموویەتی: «**لا يزال الناس بخير ما بقي الأول حتى يتعلم الآخر، فإذا هلك الأول قبل أن يتعلم الآخر، هلك الناس**»[(١)]. واتە: «**خەڵک لەسەر خێر و هیدایەت دەبن تا ئەو کاتەی خەڵکەکە خۆیان لە پێشینەکان فێربکەن، جا ئەگەر پێشینەکان لەناوچوون بەر لە فێربوونی خەڵکەکە، ئەوا خەڵکەکە لەناودەچن**». مەبەستی ئەم هاوەڵە ئەوەیە: خەڵک تا ئەو کاتە لەسەر هیدایەت دەبن کە زاناکان لەناویان بن و خۆیان لێوە فێربکەن، بەڵام ئەگەر زاناکان لەناویان نەمان و خەڵکەکەش هیچ شتێک فێر نەبوون، ئەوا ئەو خەڵکە بەتەواویی لەناو دەچن.

**کەواتە:** دەسەڵاتدارە تاغوتەکان ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لەوەی خەڵک ڕابکەن بەرەو دیمۆکراسیەت! لەلایەکەوە زاناکان و بانگخوازە ڕاستبێژەکان دەکوژن و لە لایەکی تریشەوە ستەم لە خەڵکەکە دەکەن، بەمەش قەومەکە هیچ ئاگاداری شەریعەتی ألله نابن و ئاواتەخوازن ژیانی دونیایان خۆشبێت و بیریان لای دواڕۆژ نییە، ئیتر بەوپەڕی کوێرایەتییەوە ڕادەکەن بەرەو شەریعەتێکی تاغوت، ئەویش دیمۆکراسیەتە.

(١) کتێبی سنن الدارمي > المقدمة > باب في ذهاب العلم > فەرموودەی ژمارە: ٢٥٥.

**بابەتی دووەم: پاڵنەرەکانی چەسپاندنی دیمۆکڕاسیەت لە خاکی موسڵمانان.**

**پاڵنەری سێیەم: هەوڵ نەدانی خەڵک بۆ بەدەستهێنانی زانستی شەرعیی.**

زانیمان کەوا مەلایە گومڕاکەرەکان و دەسەڵاتدارە خۆسەپێنەرەکان پێکەوە دەبنە هۆکارێکی بەهێز تاکو خەڵک شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت قەبوڵ بکات.

بەڵام ئەم دووانە بەتەنها هۆکار نین، بەڵکو کەمتەرخەمیی خودی قەومەکە هۆکارێکی زۆر بەهێزە بۆ چەسپانی دیمۆکڕاسیەت لە خاکەکەیان؛ چونکە ئەم خەڵکە بەتەواویی خۆیان دابڕاندووە لە دینەکەی ألله، ئەوەتا قورئان لەناو ماڵەکانیانە، کتێبەکانی فەرموودە هەموویان لەبەردەستن، هەر فەرموودەیەکیش ناڕوون بێت ئەوا زانایانی ئەهلی سوننە ڕوونیان کردووەتەوە و لە ئینتەرنێتەوە زانیاری تەواوت دەست دەکەوێت، کەچی هێشتا ئەم قەومە ئامادەی بەدەستهێنانی زانستی شەرعیی نەبوون.

هاوەڵی پایەدار عبدالله بن مسعود –رضي الله عنه– دەفەرمووێت: «**اغدوا عالما أو متعلما أو مستمعا، ولا تكن الرابع فتهلك**»[1]. واتە: «**ببە زانا، یاخود ببە فێرخواز، یاخود ببە گوێگر، بەڵام مەبە چوارەمیان؛ ئەگینا لەناودەچیت**».

لەوانەیە ئەم قەومە هەموویان نەتوانن ببن بە زانا، بەڵام خۆ زۆربەیان دەیانتوانی ببن بە قوتابی و فێرخواز (متعلم)، کەچی نەیانکرد. تەنانەت خۆ دەیانتوانی تەنها ببن بە گوێگر (مستمع)، واتە تەنها کتێبی زانایان بخوێننەوە و گوێ لە دەرس و وتارە تۆمارکراوەکانیان بگرن. کەچی ئەوەندەشیان نەکرد. هەر بۆیەش دەبینین ئەم قەومە بەتەواویی دابڕان لە دینەکەی ألله، بۆیەش گوفتارەکەی عبدالله بن مسعود لەسەریان جێبەجێ بوو، ئەوەتا بوونەتە قەومێکی زیادەڕۆ لە خۆشەویستیی دونیا و پارە، ئەگەر شەریعەتی پەروەردگاریان ببیستایە ئەوا لە دڵیان گران و ناخۆش بوو، بۆیەش شەیتان

(١) کتێبی سنن الدارمي > المقدمة > باب في ذهاب العلم > فەرموودەی ژمارە: ٢٥٤.

شەریعەتێکی بۆیان بەرجەستە کرد کەوا هاوشێوەی خوڕەوشتی خۆیانە، ئەویش شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتە.

هەر بۆیەش ألله پێمان ڕادەگەیەنێت کە ئەگەر هەر قەومێک دەیەوێت خۆشگوزەران بێت و دڵیان ئاسوودە بێت و ألله لێیان ڕازی بێت، ئەوا پێویستە لە خۆیانەوە دەست پێبکەن و تەسلیمی شەریعەتەکەی ألله ببن و وازبهێنن لە شەریعەتە تاغوتەکان، وەک فەرموویەتی: {**... إن الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم ...**}[1]. واتە: {... بەڕاستیی ألله بارودۆخی هیچ قەومێک ناگۆڕێت تاکو خۆیان بارودۆخی نەفسی خۆیان نەگۆڕن ...}.

ئەمە یاسای ألله یە، هەر کاتێک عەبدەکانی زیادەڕۆیی بکەن لە کار و پارە و خۆشەویستی دونیا، ئەوا ئیللا زەلیل و سەرشۆڕ دەبن و هەرگیز ئەم سەرشۆڕییەش یاخەیان بەرنادات تاکو حاڵ و بارودۆخیان نەگۆڕن و تەسلیمی ألله نەبنەوە. هەروەک نێردراوی ألله فەرموویەتی «**إذا تبايعتم بالعينة، وأخذتم أذناب البقر، ورضيتم بالزرع، وتركتم الجهاد، سلط الله عليكم ذلا لا ينزعه حتى تراجعوا إلى دينكم**»[2]. واتە: «**ئەگەر کڕین و فرۆشتنتان بەشێوازی "العينة"[3] کرد، هەروەها کەوتنە دوای کلکی چێڵەکان، هەروەها ڕازی بوون بە کشتوکاڵ، هەروەها دەستبەرداری جیهاد بوون، ئەوا ألله سەرشۆڕییەکتان بەسەردا دەسەپێنێ و لاینادات تاکو نەگەڕێنەوە بۆ دینەکەتان**».

بەڵێ ئەی قەومەکەم، بەڕاستیی ئێوەش زۆر بەتوندیی ئەم دونیایەتان گرتووە، و هەمیشە بیرتان لەلای ماڵ و پارە و کارکردنە، بەجۆرێک کە لەپێناوی دونیادا پشتتان هەڵکردووە لە ألله و نێردراوەکەی و کتێبەکەی و شەریعەتەکەی. ئەسڵەن ئاگاتان لە تەوحید نەماوە، چ جای ئەوەی باسی جیهادتان بۆ بکرێت، گەورەترین خەمتان بریتییە لە پارە و ژیانی دونیا، هەر بۆیەش بەداخەوە ئەمەیە حاڵتان بۆیەش ألله تووشی

---

(١) سورەتی الرعد، ئایەی ١١.

(٢) کتێبی سنن أبي داود > كتاب البيوع > باب النهي عن العينة > فەرموودەی ژمارە: ٣٤٦٢.

(٣) العينة: جۆرێکە لە کڕین و فرۆشتنی ڕیبا. لە کتێبە فیقهییەکان باسکراوە.

زەلیلی و سەرلێشێوانی کردوون! دەبینین دەوڵەتانی کوفری وەکو ئەمریکا و ڕووسیا و ئیسرائیل بە ئارەزووی خۆیان بەکارتان دەهێنن و بەکوشتنتان دەدەن و دواتریش خۆتان و خاکەکەشتان دەفرۆشن، کەچی ئێوە هەر پێیان سەرسامن و ڕقیشتان لە ئەهلی تەوحید دەبێتەوە کاتێک بانگەوازتان دەکەن.

ألله –تبارك وتعالى– لەبەر ئەم کردەوانەتان دڵەکانتان وەردەگێڕێتەوە و حەق و ناحەقتان لێ تێکەڵ دەکات، بەمەش هەر لەخۆتانەوە ڕقتان لە شەریعەتی ألله دەبێتەوە و ئارەزووی شەریعەتێکی تاغوتی وەکو دیمۆکڕاسیەت دەکەن! چاکیش بزانن ألله زوڵم لە عەبدەکانی ناکات، ئەوە عەبدەکانن دەستپێشخەرن و زوڵم لە نەفسی خۆیان دەکەن، هەروەک دەفەرمووێ: **{ذلك بما قدمت أيديكم وأن الله ليس بظلام للعبيد}**[1]. واتە: {ئەمەی کە بەسەرتان هات بەهۆی دەستپێشخەریی و کردەوەکانی خۆتانەوە بووە، بەڕاستی ألله ستەمکار نییە لە بەرامبەر عەبدەکانی}.

---

(١) سورەتی الأنفال، ئايەی ٥١.

## بابەتی دووەم: پاڵنەرەکانی چەسپاندنی دیمۆکڕاسیەت لە خاکی موسڵمانان.

### پاڵنەری چوارەم: دیمۆکڕاسیەت بە زەبری هێز سەپێندرا لەلایەن ئەمریکا و ڕۆژئاوا.

لەدوای کوشتار و کپ کردنی مامۆستایە ڕاستبێژەکان، هەروەها بەهێزبوونی کۆمەڵێک دەسەڵاتداری ستەمکاری فێرعەون، هەروەها دابڕانی خەڵکەکە لە دینی ألله، هەموو ئەمەش خەڵکەکەی هاندا بۆ ئەوەی بیر لە شەریعەتێک بکەنەوە کە ئازادییان پێبدات و بەتەواویی ببن بە قەومێکی دونیایی.

ڕۆژئاواش هەر ئەوەیان دەوێت، ئیتر خۆیان وەکو فریاڕەس و دڵسۆزی ئەم قەومی کوردە پیشاندا و گووتیان شەریعەتێکتان بۆ دەهێنین کە بەتەواویی ئازادتان بکات.

جا پێویستە ئەوە بزانین کە ئەمریکا و ڕۆژئاوا ڕاستەوخۆ بەزەبری هێز نایەنە هیچ خاکێک بۆ سەپاندنی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت، بەڵکو بە گشتیی کارەکەیان بە دوو هەنگاوە:

**هەنگاوی یەکەم:** لەم هەنگاوەدا ئەمریکا و ڕۆژئاوا هەر لە ناوخۆی خاکەکەدا کۆمەڵێک جاشی دیمۆکڕاسیخواز پەروەردە دەکەن؛ تاکو بانگەوازی خەڵکەکە بکەن بەرەو دیمۆکڕاسیەت، هەروەها بۆ ئەوەی دیمۆکڕاسیەت لەدڵی خەڵکەکە شیرین بکەن. لە هەموو چینێکی خەڵکەکە کۆمەڵێک کەسی زمان لووس و حەماسی دەهێنن، بۆ نموونە مەلایەکی دینفرۆش دەهێنن و لە ڕێگای کەناڵەکانیانەوە بەناوبانگی دەکەن و ئەویش وتار دەدات و هانی خەڵک دەدات و دەڵێت: ئیسلام و دیمۆکڕاسیەت هیچ کێشەیەکیان نییە خەڵکینە!! لە چینی ئافرەتانیش چەند ئافرەتێکی بەدڕەوشت پەیدا دەکەن تاکو سۆزی ئافرەتان بۆخۆیان ڕاکێشن، ئیتر دەڵێ: ئەی ئافرەتینە ئێمە دەزانین ئێوە ئازادیتان دەوێت، تەنها دیمۆکڕاسیەت مافی ئێوە دەدات!! لەلایەکی تریشەوە چەند فیلم و دیمەنێکی ژیانی ئەمریکیی و ڕۆژئاواییەکان بۆ ئەم قەومە لێدەدەن و

دەڵێن ئەها سەیرکەن ژیان چەندە خۆشە ئەگەر دیمۆکڕاسیەت حوکم بکات! ئەها سەیر بکەن کوڕ و کچ چەندە بە ئازادییەوە خەریکی پەیوەندی خۆشەویستین بەبێ ئەوەی هیچی یەکتریش بن! ئەها سەیر بکەن ئەم کوڕە یاخود ئەم کچە بەدڵی خۆی جلی پۆشیوە و کەسیش سەرزەنشتی ناکات! ئەها سەیرکەن چۆن دایک و باوک مافیان نییە تەداخولی منداڵەکانیان بکەن!. یاخود شانازیی بە داهێنانەکانیان دەکەن و گوایە پێشکەوتنەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ بوونی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت!!!

ئەم هەنگاوەش کاریگەرییەکی زۆر گەورەی هەیە، بەتایبەت ئەگەر قەومەکە دابڕاو بن لە مامۆستایە حەقبێژەکان و هیچ کەسێک نەبێت کە حەقیقەتی ئەم شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتە بۆیان ئاشکرا بکات، ئیتر خەڵکەکە گومڕا و بێکەس و دونیاپەرست بوونە و زۆر بە سەرسامییەوە ئاواتەخوازی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت دەبن، بەتایبەت کە دەبینن چەند پیاوێکی عەمامە بەسەریش پاڵپشتیان دەکەن و دەڵێن ئیسلام و دیمۆکڕاسیەت هیچ کێشەیان نییە! ئیتر ئەم قەومە بەتەواویی دەکەونە داوی شەیتان و بەتەواویی لەڕووی نەفسییەوە ئامادەن بۆ قەبوڵ کردنی دیمۆکڕاسیەت، ئەمریکا و ڕۆژئاواش لە هەنگاوی یەکەمدا هەر ئەوەیان دەوێت.

**هەنگاوی دووەم:** ئیتر وڵاتانی ڕۆژئاوا پلانێکی تۆکمە دادەڕێژن و بەیەکەوە هەڵمەتێک دەست پێدەکەن بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتە ستەمکارەکەی خاکەکە، ئیتر خەڵکەکەش لە ناوخۆی خاکەکەدا پێشوازیان لێدەکەن و بگرە ئەوانیش چەک هەڵدەگرن و کارئاسانییان بۆ دەکەن، بەمەش بەتەواویی ئەمریکا و ڕۆژئاوا لەماوەیەکی کەمدا دەست بەسەر خاکەکەدا دەگرن و شەریعەتە ژەهراوییە تاغوتەکەیان پێشکەش دەکەن.

خۆپیشاندانە فراوانەکانی خەڵکی ئیرانیش زۆرتر سەلماندی کە ئەمریکا لە ناوخۆی ئیراندا توانیویەتی دڵی زۆرینەی خەڵکەکە بۆخۆی کێش بکات و دیمۆکڕاسیەتیان لەلا شیرین بکات و ئاواتەخواز بوون ئەمریکا پاڵپشتیان بکات.

خۆ ئێمە گومانمان لە کافرێتی سەددام و حاکمە تاغوتەکانی ئیران نییە، بەڵکو تەنها ئامانجمان بریتییە لە ڕوونکردنەوەی سیاسەتی دێمۆکراسیخوازەکان بۆ سەپاندنی دێمۆکراسیەت لە ناوچە جیاجیاکانی جیهان.

**لەوانەیە خوێنەر بپرسێت:** بۆچی ئەمریکا و ڕۆژئاوا هێندە هەوڵی چەسپاندنی دێمۆکراسیەت دەدەن لە تێکڕای دەوڵەتان؟ چ قازانجێک لە دێمۆکراسیەت دەکەن؟

بێگومان هۆکارەکان زۆر زۆرن تاکو ئەمریکا و ڕۆژئاوا هەوڵی لەناوبردنی ڕژێمە تاغوتییەکان بدەن و خۆیان تاغوتی دێمۆکراسیەت بخەنە شوێنی. گرینگترین سوودەکانیش دەتوانین بڵێین ئەمانەن:

**سوودی یەکەم:** ئەمریکا دەیەوێت هێز و تواناکەی خۆی بگەیەنێتە سەرتاپای زەوی لەڕێگای دێمۆکراسیەت؛ ئەمەش چونکە لە جیهانی دێمۆکراسیەتدا ئەمریکا خودای تێکڕای دەوڵەتە دێمۆکراسیەکانە و هەموویان دەبێت ڕێزی ئەمریکا بگرن و لەکاتی کێشەکانیاندا هانا بۆ ئەمریکا بەرن.

**سوودی دووەم:** ئەمریکا دەیەوێت هاوڵاتییە ئەمریکییەکان پلەوپایەیان لە تێکڕای مرۆڤەکانی وڵاتانی تر گەورەتر بێت، بێگومان شەریعەتی دێمۆکراسیەت بگاتە هەر خاکێک ئەوا ئیللا لەو خاکەدا ئەمریکییەکان بە چاوێکی جیاواز و گەورە سەیر دەکرێن و ڕێزیان دەگیرێت و تەنانەت لە هاوڵاتیانی خاکەکە زیادتریش مافیان پێدەدرێت!

**سوودی سێیەم:** ئەمریکییەکان زۆرینەیان گاورن، بەڵام ئیتر دەرکەوت دینەکەیان چەندە شێواوە و چەندە زوڵمی تێدایە، بۆیەش ئیتر ناتوانن حوکم بە دینەکەیان بکەن، جا لە ڕێگای دێمۆکراسیەتەوە دەیانەوێت تێکڕای دینەکانی تریش وەکو دینی خۆیان کپ بکەن، وە نابێت هیچ دینێک لە جیهانی دێمۆکراسیەتدا عیزەتی هەبێت!

**سوودی چوارەم:** ئەمریکا لەڕێگای چەسپاندنی دێمۆکراسیەتەوە ئەوا لە هەر خاکێکدا بەپێی توانا هەوڵدەدات پارە و داهات و سامانی خاکەکە لەناوبەرێت و

بیبات، هەروەها جەنگێکی ئابووری گەورەی پێدەکات و یاری بە نرخی دراوەکانی خاکەکە دەکات و لە ئاستی دۆلار سووکیان دەکات.

سوودی تریش زۆرن کەوا ئەمریکا لەڕێگای دێمۆکڕاسیەتەوە چنگی کەوتووە.

**بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دیمۆکراسیەت.**

**بنچینەی یەکەم: گەل سەرچاوەی یاسادانان و هەموو شتێکە.**

ئەی قەومەکەم، هەروەک چۆن شەریعەتی ئیسلام لە کۆمەڵێک بنچینە و ڕوکن پێکهاتووە، ئاواش شەریعەتی تاغوتی دیمۆکراسیەتیش لە کۆمەڵێک بنچینە و ڕوکن پێکهاتووە کە بە ١٨٠ پلە پێچەوانەن لەگەڵ دینەکەی ألله.

لە شەریعەتی دیمۆکراسیەتدا **مرۆڤ** خۆی یاسا دادەڕێژێت لەسەر خواستی **گەل**.

ئەی قەومەکەم، سەیری هەردوو دەستەواژەکە بکەن (مرۆڤ و گەل)، ئایا هیچ ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ألله؟! کوانێ ڕۆڵی ألله؟! لەڕاستیدا لە شەریعەتی دیمۆکراسیەت ألله بوونی نییە و یاساکانیش بەپێی کتێبەکەی ألله داناڕێژرێن، بەڵکو مرۆڤ خۆی ڕۆڵی یاسادانەر (واتە المشرع) دەبینێ، هەروەها مرۆڤ ڕۆڵی ئەو کەسەش دەبینێت کە پێویستە گوێڕایەڵیی یاساکانی بکرێت (واتە المطاع)، هەروەها لەم پێناوەشدا ئەو مرۆڤانە سزای هەر کەسێک دەدەن کە یاسا دەستکردەکانیان پێشێل بکەن!

**ئەوەتا هەروەک لەماددەی پێنجەمی دەستووری بۆگەن و جاهیلیەتی عیراقیی هاتووە:** سەروەریی بۆ یاسایە، گەلیش سەرچاوەی دەسەڵات و شەرعیبوونیەتی، کە بەهۆی دەنگدانی ڕاستەوخۆ و نهێنییەوە لەڕێی دامودەزگا دەستوورییەکانەوە ئەنجامی دەدات!

تەنانەت لە یاسای تێکڕای وەزارەتەکانی حوکومەتە تاغوتپەرستەکەی کوردستاندا بەناوی گەلەوە دەستپێدەکات! واتە نووسراوە "**بەناوی گەل**"! إنا لله وإنا إليه راجعون.

کەواتە بەتەواویی تایبەتمەندییەکانی ألله پەکخران، ئیتر مرۆڤەکان بوونەتە (پەرستراو - المألوه) و (گوێڕایەڵی کراو - المطاع) و (یاسادانەر - المشرع)، ئەمەش

بەتەواویی یەكلای دەكاتەوە كەوا مەبدەئی شەریعەتی دیمۆكراسیەت بریتییە لەوەی ألله پەک بخرێت و مرۆڤەكان خۆیان لەڕێگای دەنگدانەوە كۆمەڵێک مرۆڤی دیاریكراو هەڵدەبژێرن كە پێیان دەگووترێ "پەڕلەمانتار"، ئەو مرۆڤانە لە شوێنێک كۆدەبنەوە بەناوی "پەڕلەمان"، لەو شوێنەدا پێكەوە دەستوورێكی دەستكردی فراوان دروست دەكەن كە پێكهاتووە لە ژمارەیەكی زۆر زۆر لە یاسا و حەلال و حەڕامەكان، هەموو ئەم یاسا و حەلال و حەڕامانەش لەسەر بنەمای "دەنگدانی پەڕلەمانتارەكان" دانراون نەک لەسەر بنەمای كتێبەكەی ألله!، واتە: ئەگەر زۆرینەی پەڕلەمانتارەكان دەنگ بدەن لەسەر پڕۆژە یاسایەک كەوا پێچەوانەی حوكم و ئایاتەكانی كتێبەكەی ألله بێت ئەوا دەبێتە یاسای فەرمیی و لە خاكەكەدا كاری پێدەكرێ! گرینگ ئەوەیە زۆرینەیان ڕازین لەسەری! پەنا بە ألله.

ئەم پەڕلەمانتارانەش چۆن دروست بوون؟! بێگومان بە دەنگدان و هەڵبژاردنیان لەلایەن گەل! كەواتە ئەم پەڕلەمانتارە تاغوتانە دروست نابن گەر خەڵكەكە خۆیان نەچن و پەنجەی شایەتومانیان مۆر نەكەن و دەنگ نەدەن، بەڵام ئەگەر وایانكرد ئەوا بێگومان ئیتر بەدەستەكانی خۆیان كۆمەڵێک مرۆڤ دەكەن بە خودای خۆیان!

**لەوانەیە خوێنەر بڵێت:** خۆ ئێمە پەڕلەمانتارەكان ناپەرستین ئیتر چۆن دەبنە خودای ئێمە!

لەڕاستیدا ڕێک دەبنە خودا، هەروەک چۆن كاتێک نێردراوی ألله –علیه السلام– ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {**إتخذوا أحبارهم ورهبانهم أربابا من دون الله والمسيح ابن مريم ومآ أمروا إلا ليعبدوا إلاها واحدا لا إله إلا هو سبحانه عما يشركون**}[1]. واتە: {–گاورەكان– ئەحبار و ڕەهبانەكانیان كردبووە پەروەردگار لەبری ألله، هەروەها بەهەمان شێوە مەسیحی كوڕی مەریەم (واتە عیسا)، بەڵام فەرمانیان پێنەكراوە تەنها بەوە نەبێت كە یەک پەرستراو بپەرستن، هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە ئەو، پاک و دوورە لەو

(١) سورەتی التوبة، ئایەی ٣١.

شتانەی دەیکەنە هاوبەش}. ئیتر ئەوەبوو گاورێک بەناوی "عدي" بە پێغەمبەری فەرموو: بەڵام خۆ ئێمە نایانپەرستین. پێغەمبەریش –صلى الله عليه وسلم– وەڵامی دایەوە: «**بلى، إنهم حرموا عليهم الحلال، وأحلوا لهم الحرام، فاتبعوهم، فذلك عبادتهم إياهم**»[1]. واتە: «**بەڵێ، ئەوان حەلالەکانیان لەسەر حەڕام دەکردن، حەڕامەکانیشیان لێ حەلال دەکردن، خەڵکەکەش شوێنیان دەکەوتن، جا ئەمە عیبادەتی خەڵکەکە بوو بۆ ئەوان**».

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەگەر موسڵمان گوێڕایەڵی بەشێکی شەریعەتە تاغوتەکان بێت ئەوا پێی مورتەد دەبێت و ئیمانی هەڵدەوەشێتەوە، هەروەک ألله دەفەرموێت: {**إن الذين ارتدوا على أدبارهم من بعد ما تبين لهم الهدى الشيطان سول لهم وأملى لهم * ذلك بأنهم قالوا للذين كرهوا ما نزل الله سنطيعكم في بعض الأمر والله يعلم إسرارهم**}[2]. واتە: {ئەوانەی کە هەڵگەڕانەوە بەرەو دواوە لەدوای ئەوەی حەقیان بۆ ڕوون بووەوە ئەوا –ئەو کەسانە– شەیتان بۆیانی ڕازاندبووەوە و هیوای پێیان دابوو * ئەمەش چونکە ئەوان بەو کافرانەی گووت کەوا ڕقیان لەوە دەبووەوە کە ألله دایبەزاندبوو (واتە قورئان): ئێمە لە هەندێک بابەت و فەرماندا گوێڕایەڵیتان دەکەین، هەروەها ألله بە نهێنییەکانیان دەزانێت}.

کەواتە ألله حوکمی مورتەدی بەسەر ئەو کەسانە سەپاند کە تەنها لە هەندێک بابەتدا گوێڕایەڵی تاغوتپەرستەکان بوون و پێیان گووتبوون کە لە بەشێکی بابەتەکاندا پابەندی شەریعەتەکەی ئێوە دەبین. بەمەش کافر بوون.

کەواتە ئەی قەومەکەم، هۆشداریتان پێ دەدەم، شیرک هەر ئەوە نییە کە سوجدە و دوعا و نوێژ بکەن بۆ غەیری ألله، بەڵکو ئەوەتا وەک لە فەرموودەکەوە دەرکەوت کە هۆکارێکی موشریک بوونی گاورەکان ئەوەبوو کە قەشە و پاپاکانیان بەدڵی خۆیان

---

(١) تەفسیری إبن کثیر –رحمه الله– بۆ سورەتی التوبة، ئایەی ٣١.

(٢) سورەتی محمد، ئایەی ٢٥ و ٢٦.

حەلال و حەڕامیان دادەنا و شەریعەتیان دادەڕشت، خەڵکەکەش شوێنیان دەکەوتن و خۆشیاندەویستن و گوێڕایەڵیان دەبوون. لەکاتێکدا یاسادانان کارێکی أللە یە و کەس بۆی نییە لێی بسەنێتەوە و بیداتە دەستی دروستکراوێک! هەروەک فەرموویەتی: {**إن الحکم إلا لله ...**}[1] واتە: {بەڕاستیی حوکمدان تەنها بۆ أللە یە ...}. هەروەها فەرموویەتی: {**... ولا یشرك في حکمه أحدا**}[2] واتە: {... هیچ کەسێک بەشدار نییە لە حوکمەکانی ئەو –واتە أللە}.

لە شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتدا هەمان حاڵەت بەردەوامە، تەنها ئەوە نەبێت کە خودایە دەستکردەکە ناوی گۆڕاوە لە "پاپا" بۆ "پەڕلەمانتار"، بەڵام ئەرکەکانیان وەکو خۆی ماوەتەوە و حەڕام و حەلال بەدڵی خۆیان دادەڕێژن و دەیسەپێنن لەسەر دەنگدەرەکانیان، بەبێ گەڕانەوە بۆ شەریعەتی أللە.

لە شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوتدا هیچ شتێک هێڵی سوور نییە، بەڵکو ئەو یاسایانە دەبنە هێڵی سوور کە پەڕلەمانتارە تاغوتەکان دایدەڕێژن. ئەگەر بە زۆرینەی دەنگ ڕێکبکەون لەسەر حەلال کردنی حەڕامێک یان حەڕام کردنی حەلالێک، ئەوا ئیتر دەبێتە یاسا و دەیسەپێنن. کەواتە کێ بەرپرسە لەم کوفرەی پەڕلەمانتارەکان؟ بێگومان دەنگدەرەکان.

ئەوەتا أللە لە شەریعەتی ئیسلامدا چەندین شتی حەڕام کردووە، وەکو ڕیبا و زینا و ماددە هۆشبەرەکان و دزیکردن و شتانی تریش... هەروەها بۆ هەر یەکێکیشیان سزای تایبەتی داناوە. کەچی لەو خاکانەی کەوا بە شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت بەڕێوەدەچن، دەبینین کەوا پڕیەتی لە جۆرەها شێوازی ڕیبا، هەروەها زیناکردنیش ئەگەر بە ڕەزامەندیی هەردوولا بێت ئەوا ئاساییە، لەگەڵ ئەوەشدا دزیکردن و ماددەی هۆشبەر قەدەغەکراوە، بەڵام ئایا لەسەر بنەمای شەریعەتی أللە قەدەغەیان کردووە؟!

---

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٤٠.

(٢) سورەتی الکهف، ئایەی ٢٦.

نەخێر بەڵکو لەسەر بنەمای ئەو یاسایانەی کە پەڕلەمانتارە تاغوتەکان دایانڕشتووە. لە یاساکانیاندا سزای تایبەتیشیان بۆ دزی داناوە کە ئەویش بەند کردنە!، کەچی لە شەریعەتی ألله دزیکردن حوکمەکەی دەستبڕینە -ئەگەر مەرجەکانی تێدا هاتەجێ-، بەڵام دێمۆکڕاسیخوازەکان ئەسڵەن باوەڕیان بەم حوکمە نییە.

هەر بۆیەش ألله دەفەرمووێت: {**أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون**}(١). واتە: {ئایا ئەوانە حوکمی جاهلیەتیان دەوێت؟ و ئایا حوکمی کێ باشترە لە حوکمی ألله بۆ قەومێک کە بڕوای تەواویان هەیە؟}.

**کەسانێکی گومڕا دەبینین دەڵێن:** کاکە ئێمە گوێڕایەڵی ئەم حوکومەتە ناکەین لە کارە هەڵەکانیان!

دەڵێم: کەوایە مادام گوێڕایەڵیی ناکەی ئەوا بۆچی پەنجەی شایەتومانت مۆر کرد و بەشدار بوویت لە هەڵبژاردنی پەڕلەمانتارە تاغوتەکان؟ مەگەر نازانیت بەمکارەت مومارەسەی دێمۆکڕاسیەتی تاغوتت کرد؟ مەگەر نازانیت کەوا تەنها مۆر کردنی پەنجەت بەسە کەوا دەیسەلمێنێ تۆ کوفرت بە تاغوتی شەریعەت نەکردووە؟! لەڕاستیدا هەر خراپەکاریی و یاسایەکی کوفر لە پەڕلەمان دەرچێ ئەوا دڵنیابە تۆ هاوبەشیانیت؛ چونکە تۆ بە پەنجەت دروستت کردن و بەردەوامیت پێیاندا و ژمارەی دەنگدەرانت زیاد کرد(٢).

لە شەریعەتی ئیسلامدا پێویستە دەسەڵاتدار و هاونیشتیمانیان پێکەوە پابەندی شەریعەتی ألله بن، هەم دەسەڵاتدارەکە پێویستە حوکمڕانیی خەڵک و خاکەکە بکات بە شەریعەتە پیرۆزەکەی ألله. هەمیش لەسەر خەڵکەکە واجبە کەوا کێشە و ناکۆکییەکانیان بە شەریعەتی ألله چارەسەر بکەن. بەبێ ئەوەی هیچ لایەکیان

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٥٠.

(٢) لە لاپەڕی ٢٠٢ بەدواوە لەم پەرتووکە وەڵامی چەند گومان و پرسیارێک دراوەتەوە لەبارەی مومارەسەکردنی دێمۆکڕاسیەت، بەتایبەتی ئەو قسە پووچەڵەی کە دەڵێن: ئێمە دەنگ دەدەین بۆ هێنانەوەی شەریعەتی ألله!

بگەڕێنەوە بۆ شەریعەتە دەستکردە تاغوتییەکان. هەروەک ألله بە پێغەمبەری فەرموو: **{وأنزلنا إليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه من الكتاب ومهيمنا عليه فاحكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع أهوآءهم عما جاءك من الحق ...}**[١]. واتە: {-ئەی محمد- ئێمە کیتابمان بۆت دابەزاند بەحەق، -ئەم کتێبە- بەڕاست دانەری کتێبەکانی پێشی خۆیەتی و شاهێدە لەسەریان، بۆیەش حوکم لەنێوانیان بدە بەوەی کە ألله دایبەزاندووە و شوێنی هەوا و ئارەزووەکانیان مەکەوە لەو حەقەی کە بۆت نێردراوە ...}.

**لەکۆتاییدا تێبینییەکی پێویست:** کە باسی حوکم کردن بە ئیسلام دەکرێت، کەسانێکی بیر تەسک دەڵێن: قوڕئان چارەسەری تێکڕای بابەتە دونیاییەکانی تێدا نییە. لە وەڵامدا دەڵێین: ئیسلام شەریعەتێکی کاملە و بۆ حوکمڕانیی و سیاسەتیش هاتووە، بۆ چارەسەری کێشەکانی خەڵک هاتووە. جا ئەگەر پێشهات و بابەتێک دروست بوو کەوا لەڕووی شەرعەوە قسەی لەسەر نەکرابوو، ئەوا زۆر ئاساییە و بگرە پێویستیشە کەوا وەلی ئەمرەکانی موسڵمانان (واتە دەسەڵاتداران) کۆببنەوە و ڕاوێژ بکەن لەگەڵ "أهل الحل والعقد"، ئینجا یاسا و حوکمی تایبەت بۆ بابەتەکە دابڕێژن، بەو مەرجەی کە یاساکانیان هیچ بەرهەڵستییەکی لەگەڵ ئیسلام تێدا نەبێت. کەواتە ئەسڵەن ئەمە هەر کێشە نییە.

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٨.

## بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دیمۆکڕاسیەت.

### بنچینەی دووەم: ئازادیی بیروباوەڕ.

له شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتدا ئازادییەکی تەواو دراوەتە مرۆڤ لەڕووی بیروباوەڕ، گۆڕینی دینیش هیچ گرفتێکی تێدا نییە جا ئەگەر موسڵمانێک هەڵگەڕێتەوە و ببێتە گاور و دواتریش ببێتە مولحید، هیچی کێشه نین.

له وەڵامدا دەڵێم: ئەگەر ئەم ژیانه بۆ گاڵته دروست بکرایه و مرۆڤیش به سودفه دروست ببووایه، یاخود ألله –عز وجل– خۆی ڕاگەیاندبووایه کەوا ئێوه ئازادن له بیروباوەڕ، ئەوا بێگومان ئێمەی عەبدەکانی ألله هیچ کێشەمان نەدەبوو له ئازادیی بیروباوەڕ، هەرگیزیش قسەمان لەسەری نەدەکرد. بەڵام ئەوەتا ألله خۆی پێمان ڕادەگەیەنێت که ئێمەی مرۆڤ دروست نەکراوین بۆ هیچ شتێک جگه له پەرستنی ئەو نەبێت، وەک دەفەرمووێت: {**وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون**}(١). واتە: {جنۆکه و ئینسانم دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستن نەبێت}.

ئەی قەومەکەم، چاک بزانن پەرستراوی ئێوه ألله یە، ئەو ئێوەی بۆ پەرستنی خۆی دروست کردووە، بەڵام پەرستنێکی هەڕەمەکیی ناوێت، بەڵکو خۆی شەریعەتێکی گونجاوی بۆتان دروست کردووە بەناوی "ئیسلام"، ئیتر لەسەر ئێمەی عەبدەکانی ألله واجبە کەوا خۆمان توند بگرین بەو شەریعەتەی دروستکارەکەمان، هەروەک فەرموویەتی: {**إن الدين عند الله الإسلام ...**}(٢). واتە: {بەڕاستیی دینی قەبوڵکراو لەلای ألله ئیسلامە ...}.

---

(١) سورەتی الذاريات، ئایەی ٥٦.

(٢) سورەتی آل عمران، ئایەی ١٩.

هەروەها حوکم و حاڵی ئەو کەسانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پەیڕەوی بیروباوەڕێکی تر دەکەن لە غەیری ئیسلام، هەروەک –تبارك وتعالى– فەرموویەتی: **{ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرين}**[1]. واتە: {جا هەر کەسێک شوێنکەوتەی دینێکی غەیری ئیسلام بێت ئەوا لێی قەبوڵ ناکرێت و لە ڕۆژی دواییدا لەڕیزی دۆڕاوەکانە}.

تەنانەت دینیشی بۆمان تەواو و کامل کردووە و کەموکوڕیی تێدا نەهێشتووەتەوە، هەروەک فەرموویەتی: **{... اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا ...}**[2]. واتە: {... ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆتان کامل کرد و نیعمەتەکانم لەسەرتان تەواو کرد و ڕازی بووم بەوەی ئیسلام دینتان بێت ...}.

هەروەها پێمان ڕادەگەیەنێ کە ئەم شەریعەتە کاملە تەنها بۆ قەومێک و گەلێک نییە، بەڵکو بۆ تێکڕای مرۆڤایەتییە، هەروەک فەرموویەتی: **{تبارك الذي نزل الفرقان على عبده ليكون للعالمين نذيرا}**[3]. واتە: {پاک و بێگەردە ئەو زاتەی کە فورقانی دابەزاند لەسەر عەبدەکەی؛ تاوەکو ببێتە مایەی هۆشداریی بۆ هەموو جیهانیان}.

کەواتە: ألله شەریعەتی بۆمان داناوە و شەریعەتەکەی کامل کردووە و پێمان ڕادەگەیەنێ کەوا ئەم شەریعەتە بۆ تێکڕای جیهانە، هەروەها ئەوەی پەیڕەوی نەکات ئەوا لە قیامەتدا لە ڕیزی دۆڕاوەکانە. ئیتر پێمان ناڵێن چ مانایەک مایەوە بۆ "ئازادیی بیروباوەڕ"؟! ئایا بۆتان دەرکەوت کە ئەم ئازادییە بەرەو دۆزەخ ڕاپێچتان دەکات؟ ئایا بۆتان دەرکەوت ئەم شەریعەتی دیمۆکراسیەتە هۆکارێکی چەندە بەهێزە بۆ هاندانی خەڵک تاکو گۆڕینی دینەکانیان بەلاوە ئاسایی بێت؟ بۆتان دەرکەوت؟

---

**(١)** سورەتی آل عمران، ئایەی ٨٥.

**(٢)** سورەتی المائدة، ئایەی ٣.

**(٣)** سورەتی الفرقان، ئایەی ١. ناوی "الفرقان" یەکێکە لە ناوەکانی قورئان کە بە مانای "جیاکەرەوە" دێت؛ چونکە قورئان جیاکەرەوەی حەق و ناحەقە، جیاکەرەوەی تەوحید و شیرکە، جیاکەرەوەی دادپەروەرییە لە زوڵم.

ئەی قەومەکەم، بزانن کەوا ئیسلام زۆر پێچەوانەی دیمۆکڕاسیەتە لەم باسە، بەتایبەت کەوا الحمدلله ئیسلام دینە حەقەکەیە و ڕێگایە ڕزگارکەرەکەیە، بۆیەش هەر کەسێک داخلی ببێت بە تەوحیدەوە ئەوا موسڵمانە، ئەگەریش دواتر لەم ئیسلامە هەڵگەڕایەوە ئەوا پێی دەگووترێ "مرتد"، واتە هەڵگەڕاوە. حوکمی شەڕعیی مورتەد ئەوەیە کە دەبێ داوای تەوبەی لێبکرێت، ئەگەر سوور بوو لەسەر هەڵگەڕانەوەکەی ئەوا دەبێت بکوژرێت، هەروەک نێردراوی ألله –صلی الله علیه وسلم– فەرموویەتی «**من بدل دینه فاقتلوه**»(١). واتە: «**هەر کەسێک دینی خۆی گۆڕی ئەوا بیکوژن**».

ئەمەش بەهیچ جۆرێک زوڵم نییە –هەروەک کۆمەڵێک مرۆڤی گومڕای نەزان وای لێ تێگەیشتوون– بەڵکو ئەوەی کە دیمۆکڕاسیخواز و تاغوتپەرستەکان بانگەشەی بۆ دەکەن گەورەترین زوڵمە؛ چونکە ئەوان دەڵێن با مرۆڤ خۆی دینی خۆی هەڵبژێرێ! بەمەش ئیتر ڕێگا خۆشدەکات بۆ مونافیقەکان کەوا فێڵ لە موسڵمانان بکەن و بڵێن ئێمە هەڵدەگەڕێینەوە، بەمەش ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانە دڵ نەخۆشەکان هەڵدەگەڕێنەوە و مورتەد دەبنەوە لەگەڵیان. بەمەش خۆیان حەلالی دۆزەخ دەکەن. بەڵام ئەگەر حوکمی مورتەد جێبەجێ بکرێت ئەوا مونافیقەکان هیچیان پێناکرێ و موسڵمانە دڵ نەخۆشەکانیش ئیتر هەوڵی بەدەستهێنانی زانستی شەڕعیی دەدەن؛ بۆ ئەوەی دڵیان بەهێز بکەن و بگەنە وەڵامی پرسیارەکانیان. بەمەش دەرباز دەبن لە دووڕوویی (نفاق) و مورتەد بوون، هەروەها دەرباز دەبن لە جەهل و نەزانین.

بەڵێ ئەی قەومەکەم، ئەوە ئێمەی ئەهلی تەوحیدین کەوا نەفسی مرۆڤمان بەلاوە پایەدارە و نامانەوێت حەلالی ئاگر بێت، بەپێچەوانەی دیمۆکڕاسیخوازە شەیتانییەکان کەوا هەمیشە بە گوفتاری بریقەداری وەکو "ئازادیی بیروباوەڕ" خەڵک هان دەدەن بۆ ئەوەی ئیلحاد و گۆڕینی دینی بەلاوە ئاسایی بێت. بەمەش حەلالی دۆزەخ دەبن و لە قیامەتدا ناتوانن پەنجەی تۆمەت بۆ ئەم تاغوتپەرستانە درێژ بکەن؛ چونکە خۆتان گوێڕایەڵیان بوون بە ویستی خۆتان. یا لیت قومي یعلمون، یا لیت قومي یعلمون.

---

(١) کتێبی صحیح البخاري > کتاب إستتابة المرتدین والمعاندین وقتالهم > فەرموودەی ژمارە: ٦٩٢٢.

له هەمان کاتیشدا ئەم دیمۆکڕاسیخوازە فێڵبازانە تەنانەت لەگەڵ بنچینەی "ئازادیی بیروباوەڕ" ڕاستگۆ نین! ئەگەر کەسانێک بیروباوەڕیان بگۆڕن و ئیتر پشت هەڵبکەن لە دیمۆکڕاسیەت و بە تاغوتی بزانن، ئەوا یەکسەر دیمۆکڕاسیخوازەکان بە زەبری چەک و هەڕەشەکردن ڕووبەڕووی ئەو کەسانە دەوەستنەوە و کوشتاریان دەکەن و بەندیان دەکەن! ئەی کوانێ ئازادی بیروباوەڕ؟!

**دڵنیام ئێستا کەسانێک دەڵێن:** وانییە و لە ئیسلامدا مرۆڤ ئازادە کەوا پەیڕەوی هەر بیروباوەڕێک بکات، هەروەک چۆن ألله فەرموویەتی **{لا إكراه في الدين ...}**[1]. یاخود دەڵێن: ألله فەرموویەتی **{لكم دينكم ولي دين}**[2]. یاخود دەڵێن: ألله فەرموویەتی: **{... فمن شاء فليؤمن ومن شاء فاليكفر ...}**[3].

**لە وەڵامدا دەڵێم:** ئەم سێ ئایەتە قسە لەسەر کەسێک دەکەن کە هێشتا نەهاتووەتە ناو ئیسلام، بۆیەش ئەم جۆرە کەسانە بەهیچ جۆرێک نابێ ناچار بکرێن یاخود بترسێنرێن بۆ ئەوەی ببن بە موسڵمان، بەڵکو یەکێک لەو سێ چارەسەرەیان لەپێشە:

چارەی یەکەم: ئەوەیە کە بانگەواز بکرێن بەرەو ئیسلام و ئیتر قەبوڵی بکەن.

چارەی دووەم: ئەوەیە کە ئیسلام قەبوڵ نەکەن بەلام لە خاکی دارولئیسلامدا بمێننەوە بەو مەرجەی ساڵانە جزیە (واتە سەرانە) بدەن. ئیتر مامەڵەی کافرێکی سەلامەتیان لەگەڵ دەکرێت و خۆیان و کەسوکار وماڵیان پارێزراو دەبن.

چارەی سێیەم: ئەگەر ڕازی نەبن بەم دووانەی تر و ئەوا پێویستە لە دارولئیسلام بڕۆنە دەرەوە، خۆ ئەگەر ئیسلامیان نەوێت و سەرانە نەدەن و لە خاکی موسڵمانانیش نەڕۆنە دەرەوە ئەوا کافری شەڕخوازن (واتە محارب)، ئیتر لەژێر سەرپەرشتی وەلی

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

(٢) سورەتی الكافرون، ئایەی ٦.

(٣) سورەتی الكهف، ئایەی ٢٩.

ئەمری موسڵمانان پێویستە کوشتاریان بکرێت تاوەکو دەمرن یاخود دارولئیسلام جێدەهێڵن.

کەواتە: ئەم سێ ئایەتە بەو مانایە نایەن کە مرۆڤ ئازاد بێت لەوەی کەوا لەپاش موسڵمانێتیی و تەوحیدەکەیەوە هەڵگەڕێتەوە! بەڵکو ئەوەی وابکات ئەوا مورتەدە و دەبێ بکوژرێت، پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– فەرمانی پێکردووە و هاوەڵانیش جێبەجێیان کردووە و بەڵگەی زۆریش لەبەردەستن؛ هەموو ئەمەش لەبەر ئەوەیە کەوا ئیسلام تاکە ڕێگای ڕاست و دروستە، بۆیەش أللە –سبحانه وتعالى– دەیەوێت عەبدەکانی بترسێنێ تاکو نەوێرن لەم ڕێگا ڕاستە لابدەن، لەبری ئەوە هانیان دەدات بەرەو عیلمی شەرعیی و ئاشنا بوون بە کتێبەکەی خۆی.

**ئەگەر کەسێک بپرسێت:** ئایا لە خاکی کوردستاندا ئازادیی بیروباوەڕ هەیە؟

وەڵام: بێگومان بەڵێ ئازادیی بیروباوەڕ بوونی هەیە، ئەگەر ئەمڕۆ هەر موسڵمانێکی ئەهلی تەوحید لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە ئەوا هیچ کێشەیەکی بۆ دروست ناکرێت. ئەوەتا لەم خاکەدا زیادتر لە ٩ دین و بیروباوەڕی جیاواز تۆمارکراون لە خاکی باشووری کوردستان(١).

ئەوەتا چەندین ڕێبازی شیرک لەم خاکەدا هەیە، وەکو: گۆڕپەرستیی، شیعە، ئێزدیی، زەردەشتیی، نەسڕانیی، یەهودیی، دیمۆکڕاسیخواز (گەل پەرستیی)، کاکەیی، بێ دین و فاڵچی و ساحیر و هی تریش... هەر هەموویان بە بەڵگەی ئایەت موشریکن و کافرن، کەچی لەسەر ئەم خاکەدا زۆر بە ئازادیی دەژین و مەزارگە و شوێنیان بۆ نوێ دەکرێتەوە.

بەڵام لە شەریعەتە پاک و بێگەردەکەی پەروەردگارماندا لە خاکی ئیسلامدا نابێ هەموو دین و بیروباوەڕێک بوونی هەبێت، تەنها گاور و جولەکە و مەجوس بۆیان

(١) نوێنەری جولەکەکان لە وەزارەتی ئەوقافی حوکمەتە تاغوتپەرستەکەی کوردستان ئەم قسەیەی گووت.

هەیە بمێننەوە لەسەر بیروباوەڕە کوفرینەکەیان بەو مەرجەی دەوڵەمەندەکانیان جزیە (واتە سەرانە) بدەن بە دەسەڵاتدارانی موسڵمانان.

بەڵگە لەسەر مانەوەی گاور و جولەکەکان و وەرگرتنی سەرانە لێیان، بریتییە لە فەرمایشتی ألله –تبارك وتعالى– هەروەک فەرموویەتی: **{قاتلوا الذين لا يؤمنون بالله واليوم الآخر ولا يحرمون ما حرم الله ورسوله ولا يدينون دين الحق من الذين أوتوا الكتاب حتى يعطوا الجزية عن يد وهم صاغرون}**[1]. واتە: {بیانکوژن ئەوانەی کە باوەڕ ناهێنن بە ألله و دواڕۆژ، هەروەها ئەوە حەڕام ناکەن کە ألله و نێردراوەکەی حەڕامیان کردووە، هەروەها دینداریی ناکەن لەسەر دینی حەق (واتە ئیسلام) لەوانەی کە کتێبیان بۆ نێردرابوو (واتە گاور و جولەکە) تاکو سەرانە دەدەن بە دەستەکانیان و بە لاوازیی و بێهێزیی و بچووکیی}.

سەبارەت بە مەجوس[2]، ئیمامی بوخاری –رحمه الله– لە سەحیحەکەیدا بۆمان باس دەکات کەوا خەلیفەی باوەڕداران ئیمامی عمر بن خطاب –رضي الله عنه–

(١) سورەتی التوبة، ئایەی ٢٩.

(٢) مەجوس: بریتییە لە دینێکی هەڵبەستراو و پووچەڵی قەومەکانی ڕابردوو. بیروباوەڕیان وایە کە ئەم گەردوونە لەلایەن دوو خوا بەڕێوە دەچێ، یەکێکیان خوای چاکە و ڕووناکییە بەناوی "یەزدان"، ئەوەی تریش خوای خراپە و تاریکییە بەناوی "ئەهریمەن". تاکو ئێستاش بوونیان ماوە و بەردەوامن لەسەر دینە پوچەڵەکەیان، پێیان دەگووترێ "زەردەشتییەکان"، کە دەگەڕێنەوە بۆ پیاوێک بەناوی زەردەشت کەوا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووە و کتێبێکیشی لەلا بووە بەناوی "ئاوێستا"، هەروەها بانگەوازی ئەوەی کردووە گوایە ألله ئەم کتێبەی بۆ دابەزاندووە. ئەم دینە یەکێکە لە دینە پایەدار و ڕێزلێگیراوەکان لەلایەن حوکومەتە تاغوتپەرستەکەی کوردستان، وای پیشان دەدەن گوایە ئەمە دینی ڕەسەنی کوردییە، جا دەبینین هاندەری ئەم قەومەن تاکو بگەڕێنەوە سەر ئەم دینە شیرکیی و پووچەڵەی قەومەکانی پێشوو، تەنانەت ئێستا لە شاری سولەیمانی بنکەیان بۆ کراوەتەوە بەناوی "ناوەندی زەردەشتیانی کوردستان"؛ تاکو لەم ڕێگایەوە خەڵک بۆ ئەم دینە کێش بکەن. سەردەمانێکیش خەڵکیان هاندەدا تاکو لەبری وشەی "ألله" بڵێن "یەزدان"، بەڵام الحمدلله هەر زوو ڕوونکرایەوە کە ئەم وشەیە شیرکە و دینی زەردەشتییە موشریکەکانە.
تەنانەت ئەگەر لە سەرەتادا ئەم دینە ڕاستیش بووبێت و زەردەشتیش نێردراوێکی ألله بووبێ، ئەوا گرینگ ئەوەیە لەدوای کامل بوونی شەریعەتەکەی ألله ئیتر مرۆڤ هیچ دینێکی لێ قەبوڵ ناکرێت جگە لە ئیسلام.

سەرانەی لە مەجوسەکان وەرنەدەگرت تاکو ئەو کاتەی هاوەڵی خۆشەویستمان عبدالرحمن بن عوف –رضي الله عنه– شاهێدی ئەوەی داوە کەوا پێشووتر پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– سەرانەی وەرگرتووە لە مەجوسییەکانی ناوچەی هەجەر[1]، بۆیەش ئیتر ئیمام عمر بڕیاریدا سەرانەیان لێ وەرگرێت[2].

جا ئەی قەومەکەم، چاک بزانن کەوا دینەکانی تر پووچەڵ و خوڕافین، بۆیەش مەلا و ڕەهبانەکانیان چاک دەزانن دینەکەیان بەکەڵکی حوکمڕانیی نایەت و ئەگەر حوکمی پێ بکرێت ئەوا ئابڕوویان دەچێت وەکو قەشەکانی فەڕەنسا، ئەسڵەن هەر نایانەوێت خەڵک شارەزای عەقیدەیان بێت؛ چونکە عەقیدەیان ئابڕووبەر و خورافیە، ئەوەتا زەردەشتییەکان باوەڕیان بە هاوسەرگیریی خوشک و برا هەیە! بۆیەش خۆیان حەشار داوە لەژێر سێبەری دێمۆکڕاسیەت. بەڵام ئێمەی ئەهلی ئیسلام و تەوحید الحمدلله لەسەر شەریعەتێکی حەقین، لەسەر شەریعەتێکی دادپەروەرانەین کەوا ڕزگارکەرە لە دونیا و دواڕۆژ. لەسەر شەریعەتێکین کەوا حوکمڕانی تاکەکان و کۆمەڵگە و دەوڵەتێکی تەواوی پێدەکرێ، هەر لە بچووکترین باسەوە تاکو گەورەترین باسی تێدا شیکراوەتەوە، بۆیەش لەم مەیدانە شیرکییەی کەوا دێمۆکڕاسیخوازەکان دروستیان کردووە تەنها ئێمەی ئەهلی تەوحیدین کەوا دەڵێین: إن الحكم إلا لله.

**لەوانەیە بپرسن:** ئایا کێشە چییە ئەگەر ئازادیی بیروباوەڕ هەبێت لە ئیسلام؟

**وەڵام:** ئەمە بەتەواویی لە بەرژەوەندیی شەیتانە و دژی بەرژەوەندیی مرۆڤەکانە؛ چونکە:

١- ئەم ژیانە لەپێناوی پەرستنی ألله دروستکراوە، بۆیەش دەبێ خەڵک هان بدرێن بەرەو پەرستنی ألله بەتاک و تەنهایی و لە هەموو ڕوویێکەوە. کەچی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت دەڵێت: نەخێر مرۆڤ ئازادە و ناچار نییە لەسەر هیچ

---

(١) هەجەر: ناوچەیەکی بچووکە، لە شاری مەدینە نزیکە.

(٢) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الجزية > باب الجزية والموادعة مع أهل الحرب > فەرموودەی ژمارە: ٣٥١٧.

بیروباوەڕێکی دیاریکراو بێت لە ژیانیدا. درۆش دەکەن بێگومان؛ چونکە مرۆڤ ناچارە لەپێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ألله ئیتر بیپەرستێت.

٢- تاکە دینێک کەوا قەبوڵ بکرێت لەلایەن ألله بریتییە لە ئیسلام. کەچی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت دەڵێت: هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان دینەکان، مرۆڤیش ئازادە کەوا لەسەر هەر کامێکیان بێت یاخود دینەکەی بگۆڕێت، هیچ جیاوازییەکیش لەنێوان پەیڕەوکارانی دینەکان نییە. دیسان درۆ دەکەن؛ چونکە ألله فەرموویەتی ئیسلام تاکە دینی قەبوڵکراوە لەلام، هەروەها پێمان ڕادەگەیێنت کەوا هەرگیز موسڵمان و ناموسڵمان هاوتا نین لەلای ألله، بەڵکو پاداشت و ڕەحمەت بۆ موسڵمانانە هەروەها سزاش بۆ ناموسڵمانانە (ئەگەر ئیسلامیان پێبگات و نەیانەوێت).

٣- ئازادیی بیروباوەڕ مرۆڤ هاندەدات تاکو گۆڕینی دینەکەی بەلاوە شتێکی ئاسایی بێ، بەتایبەت کە دەبینێ ئیسلام ناشرین دەکرێ لەلایەن دێمۆکڕاسیخوازەکان، هەروەها بوهتان بۆ نێردراوی ألله و خەلیفەکان هەڵدەبەسترێت، لە لایەکی تریشەوە ئەم دێمۆکڕاسیخوازە تاغوتپەرستانە دینەکانی تر دەڕازێننەوە و بەجوانیی پیشانیان دەدەن، بەمەش وادەکەن مرۆڤ بە چاوی ڕق بڕوانێتە ئیسلام. کاتێکیش دەبینێت کەوا سەدان مرۆڤی فێڵباز و دووڕوو خۆیان وا پیشان دەدەن گوایە لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە، بەمەش ئیتر ئەم مرۆڤە بە ئاڕاستەی شیرک دەچێت و دادەبڕێت لە ئیسلام و تەوحید. والله ئەمجارەش درۆ دەکەن؛ چونکە دێمۆکڕاسیخوازەکان مێژوویان دیارە لە خوێن ڕشتن و زوڵم کردن لە هەر کەسێک کەوا تەسلیمیان نەبێت، مێژوویان دیارە کەوا خوێنی ملیۆنان کەسیان لە یابان و ڤێتنام و کوبا و ئەفریقیا و عیڕاق و ئەفغانستان ڕشتووە، کوشتارەکەشیان لەپێناوی هیچ شتێک نەبوو جگە لە سەپاندنی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت نەبێت. بەڵام ئەهلی تەوحید هەمیشە دژی کوشتنی بە ناحەقن، هەروەک نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– فەرمووی «**إذا أمن الرجل**

**الرجل على نفسه، ثم قتله، فأنا بريء من القاتل وإن كان المقتول كافرا»**[1]. واته: «**ئەگەر پیاوێک خۆی بە پارێزراو بزانێ لەلای پیاوێک، دواتریش پیاوەکە بیکوژێت، ئەوا من بەریئم لە بکوژەکە ئەگەرچی کوژراوەکە کافریش بووبێ**». هەر بۆیەش پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– هەمیشە بە فەرماندەکانی جیهادی ڕادەگەیاند ئەگەر ڕووبەڕووی قەومێکی موشریک وەستانەوە ئەوا پێشنیاری ئیسلامیان بۆ بکەن، ئەگەر ڕازی بوون ئەوا دەستبەرداریان بن، ئەگەریش ڕازی نەبوون ئەوا پێشنیاری سەرانەیان بۆ بکەن، ئەگەر ڕازی بوون ئەوا دەستبەرداریان بن... تاکو کۆتایی فەرموودەکە[2].

٤- ئازادیی بیروباوەڕ بەتەواوەتی دروشمی "بانگەوازی تەوحید" پەک دەخات؛ چونکە لە شەریعەتی دیمۆکراسیەتی تاغوتدا مرۆڤ ئازادە لەسەر بیروباوەڕی خۆی، کەوابێ ئەو کەسەی کە بانگەوازی خەڵک دەکات و کافران و موشریکانیان تەکفیر دەکات و دەیانترسێنێت بە دۆزەخەکەی ألله ئەگەر نەبنە موسڵمان، ئەوا ئەو کەسە بەلای تاغوتپەرستەکانەوە ستەمکار و تیرۆریستە و خەڵک دەترسێنێ و دەیەوێ بیروباوەڕیان بگۆڕێت بە زەبری ترساندن!

---

**(١)** کتێبی مسند أبي داود الطيالسي > ڕیوایەتەکانی عمرو بن الحمق –رضي الله عنه– > فەرموودەی ژمارە: ١٣٨١.

**(٢)** کتێبی صحيح مسلم > كتاب الجهاد والسير > باب تأمير الإمام الأمراء على البعوث، ووصيته إياهم بآداب الغزو وغيرها > فەرموودەی ژمارە: ١٧٣١.

## بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دیمۆکراسیەت.

## بنچینەی سێیەم: ئازادیی ڕادەربڕین.

دانەیەکی تر لە بنچینەکانی شەریعەتی دیمۆکراسیەتی تاغوت ئەوەیە کە مرۆڤ ئازادییەکی بێ سنووری هەبێت بۆ دەربڕینی ڕا و بۆچوونەکانی، تەنانەت ئەگەر ڕادەربڕینەکەی پێچەوانەی هەموو شتێک بێت! هەر ئازادە و مافی خۆیەتی و نابێ ڕێگریی لێ بکرێت. تەنانەت ئەگەر بۆچوون و ڕایەکەی دژی أللە و دینەکەی و پێغەمبەرەکانی بێت! هەر کێشە نییە و مافی خۆیەتی!

بەڵێ ئەی قەومەکەم؛ ئەمەش چونکە لە شەریعەتی دیمۆکراسیەتدا ئازادیی ڕادەربڕین لە هەموو شتێک پیرۆزترە، لە أللە و نێردراوەکانی و دینەکەی و کتێبەکەیشی پیرۆزترە. بۆیەش هیچ شتێک هێڵی سوور نییە لەم شەریعەتە تاغوتەدا، بەڵکو ڕێگرتن لە ئازادیی ڕادەربڕین هێڵی سوورە و کەس بۆی نییە بە دژایەتی کەسێک بکات لەسەر ئەوەی دەمدرێژیی بەرامبەر قورئان کردووە؛ چونکە ئازادییە و مافی خۆیەتی ڕای خۆی دەربڕێ!

ئەوەتا وەک بینیمان جەماعەتی گۆڤارە کاریکاتێرییەکەی ئەوڕوپا کاتێک سووکایەتییان بە پێغەمبەر دەکرد –صلى الله عليه وسلم– هیچ بەربەستێکیان لەسەر نەبوو و بە ئازادانە ڕای خۆیان بڵاو دەکردەوە، کەچی ئەو کۆمەڵە برایە موجاهیدەی هەڵسان بە تۆڵە سەندنەوە و کوشتنی ئەم کافرانە پیسانە، ئیتر بە "تێرۆریست" و "توندڕەو" ناسێندران و ڕەخنەیان لێگیرا!

ئەی قەومەکەم، وەنەبێ لە خاکی باشووری کوردستاندا شتی وا ڕووی نەدابێ! بەڵکو لێرەش بەهەمان شێوەیە؛ چونکە ئەم خاکەش بە شەریعەتی دیمۆکراسیەت بەڕێوەدەچێ و هەمان بنچینەکانی تێدایە. ئەوەتا مەلا بەختیار –أللە سەرشۆڕی بکات– بەوپەڕی ئازادییەوە وەکو سەگ دەحەپێت بە أللە، بەوپەڕی ئازادییەوە

کۆنفرانس دەبەستێ، بەوپەڕی ئازادییەوە دروشمێکی پیسی بەرزکردووەتەوە: ئاین بۆ تاک و دیمۆکراسی بۆ هەمووان[١].

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەوەتا لەم خاکەدا کۆمەڵێک مولحیدی فێڵبازی درۆزن دەهێنرێنە سەر شاشە و خۆیان وەکو موسڵمان پیشان دەدەن، کەچی دەڵێن: باوەڕمان بە هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر نییە بەڵکو قوڕئانمان بەسە! ناویان لەخۆیان ناوە "قوڕئانییەکان"! پاڵپشتیی ماددی و مەعنەویی دەکرێن و دەپارێزرێن لەلایەن حوکومەتە تاغوتپەرستەکەی کوردستان. ئەوەتا یەکێک لە سەرانیان بە ئاشکرا لە کەناڵێکی یەکێتی تاغوتپەرست پێغەمبەرمان تۆمەتبار دەکات و دەڵێت ئافرەتی خەڵکی دزیوە! بە ئاشکرا کوفر بە ألله دەکات و پێی دەڵێت "هیتلەر". ئەوەتا یەکێکی تر لە سەرانیان هەر بە ئاشکرا جەژنی قوربان ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت حۆری درۆیە و هتد... هەموو حەفتەیەکیش بەرنامەی تایبەتی هەیە لە یەکێک لە کەناڵەکانی پارتی تاغوتپەرست.

ئەوەتا یەکێک لە مولحیدە پیسەکان سوپاسی جەلال و مەسعود و نێچیر و مەلا بەختیار دەکات و دەڵێت هەمیشە ئەمانە هاوکار و پارێزەرم بوونە لە دەربڕینی قسە و کتێبەکانم.

ئەمە جگە لەوەی دەیان ئافرەتی بەدڕەوشت دەهێننە سەر کەناڵەکان و ڕەخنە لە ألله دەگرن و دژایەتی ئەحکامەکانی ئافرەتان دەکەن لە شەریعەتی ئیسلام.

تەنانەت کۆمەڵە و فیرقە تاغوتپەرستەکانیش کە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام، وەکو بەناو سەلەفییەکان و ئیخوانییەکان و سۆفیە گۆڕپەرستەکان و غەیری ئەوانیش... هەر یەکێک لەمانە کەناڵی تایبەتی خۆیان هەیە و بەوپەڕی ئازادییەوە بیروڕایە ژەهراویی و پووچەڵەکانیان بڵاو دەکەنەوە و پارێزگاریشیان لێدەکرێت! خۆ ئەگەر ئەهلی حەق بوونایە ئەوا حاڵیان وەکو مامۆستا کامەران کەریم چاوشین دەبوو –رحمه الله–،

(١) لە بنچینەی پێنجەم قسە لەسەر ئەم خاڵە کراوە.

هەروەک چۆن بەهۆی بانگەوازی تەوحیدەکەیەوە مینبەر و دەرس گووتنەوەی لێ قەدەغە کرا و ڕاپێچی زیندان کرا و ئەشکەنجەیەکی زۆریاندا تاوەکو بەم حاڵەیەوە گەڕایەوە لای ألله. –ألله به شەهید قەبوڵی بکات.

ئەی قەومەکەم، ئەمەیە ئازادیی ڕادەربڕین لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت، واتە ئازادیت لەوەی هەر چ بیروڕایەکت هەبێ، ئازادیت لەوەی کتێب لەدژی شەریعەتەکەی ألله بنووسی، ئازادی لەوەی پۆست بکەیت و دژایەتی ألله بکەیت و دژایەتی دروشمەکانی ئیسلام بکەیت وەکو نوێژ و سەلام و ڕیش و فرەژنیی و نیقاب و تەقوا و هتد... بەڵام هەر کاتێک بیروڕایەکەت دژی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت بوو، ئەوا ئیتر نەرمونیانییەکەیان نامێنێ و هەڵدەستن بە تێرۆر کردنی ئەو کەسەی ڕەخنەی لە شەریعەتەکەیان گرتووە. لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێ ئەمانە فێڵبازن، ئەمانە درۆزنن و هیچ مەبەستێکیان نییە جگە سەپاندنی شەریعەتە وەحشییەکەیان بەسەر ئەم قەومە.

**سەبارەت بە شەریعەتی ئیسلام:** لە دینەکەی ألله دا ئازادیی ڕادەربڕین بوونی هەیە بەڵام سنووری بۆ دانراوە، سنوورەکەش تایبەتە بە بابەتە شەرعییەکان. واتە لە شەریعەتی ألله هیچ کەسێک بۆی نییە بەناوی ئازادییەوە ڕەخنە لە ألله بگرێت، یاخود ڕەخنە لە هەواڵێک یاخود حوکمێکی ناو قورئان بگرێت، یاخود ڕەخنە لە فەرموودەیەک یاخود سوننەتێکی پێغەمبەر بکرێت –عليه الصلاة والسلام–، یاخود ڕەخنە لە هاوسەران و هاوەڵانی پێغەمبەر بگرێت –رضي الله عنهم وعنهن–. لە شەریعەتی ئیسلامدا هەر کەسێک بەناوی ڕادەربڕینەوە ڕەخنە لە یەکێک لەم باسانە بگرێت ئەوا یەکسەر کافر بووە. جا ئەگەر ڕەخنەکەی بە جددیی بووبێ یاخود بە گاڵتە، جیاوازیی نییە و بێژەرەکە پێی کافر بووە.

بەڵام ئەگەر لە بارەی هەر باسێکی ترەوە ڕای خۆی دەربڕێت و ڕەخنە بگرێت و قسە بکات ئەوا زۆر ئاساییە و هیچ بەربەستێکی لەپێش نییە.

ئەوەتا ألله بە ئاشکرا تەکفیری کەسانێکی کرد کەوا بە گاڵتەوە باسی ألله و نێردراوەکەیان دەکرد، هەروەک دەفەرموویێت {... **قل أبالله وءاياته ورسوله كنتم تستهزءون * لا تعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم ...**}[1]. واتە: {... –ئەی محمد– بڵێ: ئەوە ئێوە گاڵتە بە ألله و ئایاتەکانی و نێردراوەکەی دەکەن؟ * بیانوو مەهێننەوە، بەڕاستیی کافر بوون لەپاش باوەڕ هێنانەکەتان ...}.

دیقەت بدەن ئەی قەومەکەم، ئەگەر ألله کەسێک تەکفیر بکات کە بە گاڵتە قسەی لەسەر دین کردبێ، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە زۆر بە جددیی ڕەخنە لە ألله و نێردراوەکەی و شەریعەتەکەی دەگرێت بەناوی ئازادییەوە؟! بێگومان ئەویان زۆر زۆر کافرترە و دەبێ مامەڵەی کافری شەڕخوازی لەگەڵ بکرێت، حوکمەکەشی کوشتنە. ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کەوا باوەڕی بە "ئازادیی ڕادەربڕین" هەیە و بەلایەوە ئاساییە هەرچۆنێک قسە لەسەر ألله و شەریعەت و نێردراوەکانی بکرێت؟! ئەمیشیان هەر لەدووانەکەی تر کافرترە و حوکمەکەیشی توندترە.

ئەوەتا پیاوێک لە مەجلیسی ئیمامی خۆشەویست علي بن أبي طالب –رضي الله عنه– ڕەخنەی گرت لە کوشتنی کەعب کوڕی ئەشرەف، گوتی بە زوڵم کوژرا. ئەوەبوو ئیمام علي فەرمانیکرد بە کوشتنی ئەم پیاوە[2]. ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک:

١- کعب بن الأشرف پیاوێکی جولەکەی دەم شڕ بوو، هەمیشە بە شیعرەکانی ئازاری دڵی پێغەمبەری دەدا، گاڵتە و دەمدرێژیی و بوهتانی بە دایکانی موسڵمانان دەکرد –رضي الله عنهن–. بە جۆرێک کە نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– لە وەسفیدا فەرمووی: «**من لي بكعب بن الأشرف؟ فإنه قد آذى الله ورسوله ...**»[3]. واتە:

---

(١) سورەتی التوبة، ئایەی ٦٥ و ٦٦.

(٢) کتێبی صحيح مسلم بشرح النووي > كتاب الجهاد والسير > باب قتل كعب بن الأشرف طاغوت اليهود.

(٣) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الجهاد والسير > باب قتل كعب بن الأشرف طاغوت اليهود > فەرموودەی ژمارە: ١٨٠١.

«**کێ دەتوانێ بەرەنگاری کەعبی کوڕی ئەشرەف ببێتەوە بۆم؟ بەڕاستی ئازاری ألله و نێردراوەکەی داوە ...**».

٢- پاڵپشتی کردن و خەمبار بوون بۆ کوژرانی کەعبی کوڕی ئەشرەف بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو شەخسە پاڵپشتی ئەهلی کوفر دەکات و خۆشیدەوێن و دەیەوێت زاڵیان بکات بەسەر ئەهلی تەوحید، بەمەش ئیمان و موسڵمانێتی شەخسەکە هەڵدەوەشێتەوە و هەمان حوکمی کافرەکەی هەیە؛ چونکە ألله لەبارەی پاڵپشتی کافرانەوە دەفەرمووێ: {**... ومن يتولهم منكم فإنه منهم ...**}[1]. واتە: {... هەر کەسێک لە ئێوە پاڵپشتیی ئەوان بکات ئەوا لەوانە ...}. واتە هەمان حوکمی ئەوانی هەیە و کافر بووە.

کەواتە لە ئیسلامدا مرۆڤ هەرگیز بۆی نییە ڕەخنە و گاڵتە دەربڕێت بەرامبەر هەر ڕووداوێک یاخود سوننەتێک یاخود ئایەتێک و هتد...

جا ئەی قەومەکەم، وریای زمانتان بن، وریابن لە گاڵتە و ڕەخنەگرتن لە ألله و نێردراوەکەی، لە شەریعەتی ئیسلامدا مرۆڤ ئازاد نییە لە گوفتارەکانی، بەڵکو گشت پیت و وشەیەکی دەمی تۆمار دەکرێت لەلایەن فریشتە ڕاسپێردراوەکان، لە ڕۆژی زیندووبوونەوەشدا هەمووی پیشان دەدرێتەوە و لێپرسینەوەی توندی لەگەڵ دەکرێت، بۆیەش وازبێنن لە دێمۆکراسیەتی تاغوت، مرۆڤ ئازاد نییە و بۆی نییە هەموو شتێک بڵێت، ألله دەفەرمووێت: {**ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد**}[2]. واتە: {هیچ گوفتارێک ناگوترێت و ئیللا چاودێرێکی ئامادەکراوی بۆ دانراوە}. ئەوەتا نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– دەفەرمووێ «**... هل يكب الناس على وجوههم في النار إلا حصائد ألسنتهم؟**»[3]. واتە: «**... جا ئایا خەڵک لەسەر ڕووخساریان دەخشێنرێن لە ئاگردا جگە لە پارێزەرانی زمانیان؟**».

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٥١.

(٢) سورەتی ق، ئایەی ١٨.

(٣) کتێبی سنن إبن ماجة > كتاب الفتن > باب كف اللسان في الفتنة > فەرموودەی ژمارە: ٣٩٧٣.

هەروەها فەرموویەتی «**إن العبد ليتكلم بالكلمة ما يتبين ما فيها، يهوي بها في النار أبعد ما بين المشرق والمغرب**»[١]. واتە: «**بەڕاستیی عەبد وشەیەک دەڵێت بەبێ ئەوەی لە ناوەڕۆکی قسەکە وردبێتەوە، بەمەش دەخرێتە ناو ئاگرەوە بە ماوەیەکی دوورتر لە ماوەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا**».

دەی ئەگەر مرۆڤێک لەسەر گووتنی قسەیەک سزا بدرێت لەکاتێکدا نەیشیزانیوە قسەکەی کوفرە، ئەی چی بۆ حاڵی ئەو کەسەی بە ئارەزووی دڵی خۆی کوفر دەکات؟ ئەی چی بە حاڵی ئەو دەسەڵاتدارە یاخود ئەو کەسەی کە باوەڕی بە دیموکراسیەت و ئازادیی ڕادەربڕین و کوفرکردن هەیە؟! پەنا بە ألله لەم کافربوونە.

ئەی قەومەکەم، وەرنەوە هۆشی خۆتان، هەموو شتێکی شەریعەتی دیموکراسیەت پێچەوانەی دەستوورەکەی ألله یە، دیموکراسیخوازەکان هانی مرۆڤ دەدەن تاکو گوێ بە قسەکانی نەدات و بەلایەوە شتێکی ئاسایی بێت کە هەر قسەیەک بڵێت، بەڵام شەریعەتەکەی ألله –تبارك وتعالى– تەنانەت زمانی مرۆڤیش ڕێکدەخات و پێی دەڵێت ئاگاداری وشەکانت ببە کاتێک دەریان دەبڕیت؛ چونکە تۆ ئازاد نیت و لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت.

چۆن ئێوە خۆتان بە موسڵمان دەزانن لەکاتێکدا باوەڕتان بە دیموکراسیەتی تاغوت هەیە؟ چۆن جورئەت دەکەن دژی ألله بووەستن و دیموکراسیخوازەکانتان خۆشبووێ؟ لە ألله بترسن، پشت لە شەریعەتی دیموکراسیەت بکەن، پشت لەم شەریعەتە بکەن کە لە فەرهەنگەکەیدا "کوفر" بریتییە لە "ئازادیی". هەر کەسێک تەکفیر بکەن کە باوەڕی بەم تاغوتە هەیە یاخود مومارەسەی دەکات. ڕقتان لێیان بێت؛ چونکە ئەوان شەڕیان لەدژی شەریعەتی ألله ڕاگەیاندووە، جا ئاگاداری خۆیان بووبن یاخود نا.

---

(١) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الزهد والرقائق > باب التكلم بالكلمة يهوي بها في النار (ياخود: باب حفظ اللسان) > فەرموودەی ژمارە: ٢٩٨٨.

**بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دیمۆکڕاسیەت.**

**بنچینەی چوارەم: ئازادیی تاکەکەسیی.**

یەکێکی تر لە بنچینەکانی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت ئەوەیە کە مرۆڤەکان ئازادن لە کردەوەکانیان، هەر کارێک کە ئارەزووی بکەن ئەوا با بیکەن بەو مەرجەی پێچەوانەی یاسا و دەستوورە دەستکردەکەی وڵاتەکە نەبێت. کەسیش نابێت لێپرسینەوە بکات لەگەڵ کەسێکی تر لەبارەی کردەوەکان.

بەتایبەت ئێمەی موسڵمان لەم بابەتەدا کێشەمان لەگەڵ حەڕامکراوەکانە، لە ئیسلامدا زۆر بە ڕوونی کۆمەڵێک شت حەڕام کراون، وەکو جلی نیمچەڕووتی ئافرەتان و پیاوان، هەروەها گۆشتی بەراز و گۆرانی و داوێنپیسی، هەروەها ئەنجامدانی عیبادەتەکان لەسەر بیدعە نەک لەسەر سوننەت.

ئەمانە و زۆر شتی تریش بە ئاشکرا لە قورئان و سوننەدا حەڕام کراون، بەڵام لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا ئەمانە کۆمەڵێک بابەتی تاکەکەسین، واتە مرۆڤ ئازادە ئەگەر ئەنجامیان بدات!، کەسیش بۆی نییە لەسەر ئەم کارانە لێپرسینەوە لەگەڵ کەسێکی تر بکات یاخود ئامۆژگاریی بکات!، خۆ ئەگەر –بۆ نموونە– کەسێک لێپرسینەوە لەگەڵ گەنجێک بکات لەبارەی یەکێک لەم کردەوانەی لە سەرەوە باسکران، ئەوا لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا گەنجەکە مافی خۆیەتی ئەگەر بیەوێت ئەوا داوای یاسایی تۆمار بکات و بڵێت فڵانە کەس ئازادییەکانم دەبەزێنێ! بەمەش حوکومەت ڕووبەڕووی ئەو کەسە دەوەستنەوە و پێی دەڵێن نابێ حەقت بەسەر ئەم گەنجە هەبێت! ئەوەتا حوکومەتە تاغوتپەرستەکەی کوردستان ژمارە تەلەفۆنێکی داناوە بۆ ئەو منداڵانەی کە گلەییان لە دایک و باوکیان هەبێ! ئەگەر بیانەوێ ئەوا دەتوانن پەیوەندیی بە ژمارەکەوە بکەن و حوکومەت لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات!

شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت ئەگەرچی لە مێژوودا نوێیە، بەڵام بەرهەمی عەقڵێکی جاهیلانەی پێش ئیسلامە کەوا باوەڕیان بە لێپرسینەوە نییە، تەنانەت ئەگەر باوەڕیان بە ألله ش هەبێت ئەوا باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەی دوای مردن نییە. بۆیەش مرۆڤەکانیان ئازاد کردووە و دەڵێن هەرچییەک دەکەن بیکەن و کەسیش مافی ئەوەی نییە لێپرسینەوەی کەسی تر بکات.

ئەمەش بیروباوەڕی مەلاکانی قەومی هود بوو –علیه الصلاة والسلام–، ئەوان باوەڕیان بە ألله هەبوو، بەڵام دەیانگووت زیندوو نابینەوە! هەروەک ئەم مەلایانە خەڵکیان لە پێغەمبەر هود هەڵدەگەڕاندەوە و دەیانگووت: {**إن هي إلا حياتنا الدنيا نموت ونحيا وما نحن بمبعوثين * إن هو إلا رجل افترى على الله كذبا وما نحن له بمؤمنين**}[1]. واتە: {لەڕاستیدا هیچ شتێک بوونی نییە تەنها ئەم ژیانە نەبێت، دەمرین و دەژین، بەڵام دەرناهێنرێین * ئەم پیاوە (واتە هود) هیچ نییە جگە لەوەی پیاوێکە و درۆی بۆ ألله هەڵبەستووە و ئێمە باوەڕی پێ ناهێنین}.

کەواتە ئەی قەومەکەم، هەر کەسێکتان بینی کەوا باوەڕی بە بنچینەکانی دێمۆکڕاسیەت هەبوو ئەوا چاک بزانن کافرە ئەگەرچی بڵێت باوەڕم بە ألله هەیە؛ چونکە شەیتانیش باوەڕی بە ألله هەیە بەڵام تەسلیمی نەبوو، بەهەمان شێوەش ئەوەتا قەومی هود باوەڕیان بە ألله هەبوو بەڵام شەریعەت و پێغەمبەرەکەیان ڕەت کردەوە، بەمەش کافر بوون. بۆیەش هەڵمەخەڵەتێن بەو دێمۆکڕاسیخوازانەی نوێژ دەکەن و دەڵێن باوەڕمان بە ألله هەیە، ئەمە تەنها بۆ هەڵخەڵەتاندنی ساویلکەکانە.

لە شەریعەتی ألله دا ئەم بنچینەیەش ڕەتکراوەتەوە (واتە ئازادی تاکەکەسی)؛ چونکە لە ئیسلامدا تاکەکان ئازاد نەکراون، بەڵکو مرۆڤەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت.

---

(١) سورەتی المؤمنون، ئایەی ٣٧ و ٣٨.

**لێرەدا کەسانێکی ساویلکە و نەزان سەرهەڵدەدەن و دەڵێن:** ئێوە حەقتان بەسەر خەڵکەوە نەبێت و دینداریی خۆتان بکەن و لێپرسینەوە لەگەڵ کەس مەکەن، تەنها خودای گەورە بۆی هەیە لێپرسینەوەمان بکات، ئێوە بۆتان نییە!

لە وەڵامدا دەڵێم: هەر کەسێک تۆزێک کتێبەکەی ألله ی خوێندبێتەوە ئەوا ئەم گوفتارە پووچەڵە ناڵێت؛ چونکە زۆر زۆرن ئەو ئایاتانەی موسڵمانان هان دەدەن بەرەو بانگەواز و لێپرسینەوە کردن لەگەڵ کافران و موسڵمانانی سەرپێچیکار. مەرجیش نییە تەنها لێپرسینەوە لەسەر "تاوان" بکرێت، بەڵکو دەبێ لێپرسینەوە و هۆشداریی بەو کەسانەش بدرێت کە بەناوی دینەوە خیانەت لە ألله دەکەن و بیدعە و شیرکیان لە خەڵک کردووەتە دین.

هەر کەسێکیش باوەڕی بە ئەرکی "فەرمان بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە" نەبێت ئەوا با چاک بزانێت کە لەعنەتی لێکراوە هەروەک چۆن پێغەمبەر داوود و عیسا –علیهما الصلاة والسلام– لەعنەتیان لە نەوەکانی ئیسرائیل (بني إسرائيل) کرد لەبەر ئەوەی ڕێگریان لە خراپەکاریی نەدەکرد، هەروەک ألله فەرموویەتی: **{لعن الذين كفروا من بني إسرائيل على لسان داود وعيسى ابن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون * كانوا لا يتناهون عن منكر فعلوه لبئس ما كانوا يفعلون}**[1]. واتە: {لەعنەت لە کافرەکانی ناو نەوەکانی ئیسرائیل کرا لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم؛ ئەمەش بەهۆی ئەوەی سەرپێچیان کرد و دەستدرێژیان دەکرد * ئەوان ڕێگریان لە خراپەکاریی و تاوان نەدەکرد کە دەکران، ئای لەو کارەی کە دەیانکرد}.

ئەی قەومەکەم خۆ دەبینن ألله –سبحانه وتعالى– چۆن ئەو کەسانەی تەکفیر کرد لەناو نەوەکانی ئیسرائیل، هەروەها لەسەر زمانی دوو پێغەمبەری پایەدارەوە لەعنەتیان لێکرا؛ تەنها چونکە دەستدرێژکار بوون و قەدەغەی ئەو خراپەکارییانەیان نەدەکرد کە لەناویان ئەنجامدەدرا. ئیتر دەبێ حاڵی ئێوە چۆن بێت کە دەچن و

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٧٨ و ٧٩.

پەنجەی شایەتومانتان لە شەریعەتێکی تاغوتی وەکو دیمۆکراسیەت مۆر دەکەن کە ئەسڵەن باوەڕی بە قەدەغەکردنی تاوان و خراپەکاریی نییە؟! لە ألله بترسن.

بەگشتی لە کتێبەکەی ألله دا بۆمان دەردەکەوێت لێپرسینەوەکان بەسەر دوو جۆر دابەش بوونە:

**جۆری یەکەم: لێپرسینەوەی دونیایی:** ئەم جۆرە لێپرسینەوەیە هەر لەم دونیایە ئەنجام دەدرێت کە پێغەمبەران –علیهم السلام– و عەبدە باوەڕدارەکان پێی هەڵدەستن و تێیدا ئەرکیان ئەوەیە هۆشداریی بدەن بە ئەهلی کوفر و سەرپێچیکاران و دووڕووەکان، هەروەها بیانترسێنن و هەڵە و گومڕاییەکەیان بۆ ڕوون بکەنەوە.

ئەمەش بەپوختیی لەلایەن نێردراوی ألله –علیه الصلاة والسلام– باسکراوە و فەرمانی پێکراوە، هەروەک فەرمووی: «**من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان**»[١]. واتە: «**هەر کەسێک لەناو ئێوەدا شتێکی حەڕامکراو و نەشیاوی بینی ئەوا با بەدەستەکانی بیگۆڕێت، ئەگەریش نەیتوانی ئەوا بە زمانی، ئەگەریش نەیتوانی ئەوا بە دڵی، ئەمەش لاوازترینی ئیمانە**».

بێگومان کاری "بانگەواز" و "الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر[٢]" تەنها ئەرکی پێغەمبەران نییە –علیهم الصلاة والسلام–، بەڵکو ئەرکی تێکڕای ئەو موسڵمانانەیە کە زانستیان هەیە، جا ئەگەر تەنها یەک ئایەتیش بزانن ئەوا پێویستە بیگەیەنن.

ألله فەرموویەتی: {**والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله أولئك سيرحمهم الله إن الله عزيز حكيم**}[٣]. واتە: {پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار بەشێکیان

---

(١) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الإيمان > باب بيان كون النهي عن المنكر من الإيمان وأن الإيمان يزيد وينقص وأن الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر واجبان > فەرموودەی ژمارە: ٧٨.

(٢) الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر، واتە: فەرمانکردن بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە.

(٣) سورەتی التوبة، ئایەی ٧١.

پاڵپشتی بەشێکیانن، فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن، هەروەها نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن، هەروەها گوێڕایەڵی أللە و نێردراوەکەی دەکەن، ئەوانە لەلایەن أللە ڕەحمیان پێدەکرێت، بەڕاستیی أللە خاوەن دەسەڵاتە و دانایە}.

کەواتە گرینگترین کاری موسڵمان لەپاش خۆشارەزا کردن لە تەوحید، بریتییە لە بانگەواز و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگریی کردن لە خراپە. هەر بۆیەش لقمان –علیە السلام– ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات و پێی دەفەرمووێ: **{یا بني أقم الصلاة وأمر بالمعروف وانه عن المنكر واصبر على ما أصابك إن ذلك من عزم الأمور}**[١]. واتە: { ئەی کوڕەکەم، نوێژ بکە و فەرمان بە چاکە بکە و قەدەغەی خراپە بکە، هەروەها ئارام بگرە لەسەر ئەو ناڕەحەتییەی تووشت دەبێت، بەڕاستیی ئەمەی باسمکرد گرینگترینی فەرمانەکانە}.

هەروەها أللە –عز وجل– ستایشی ئوممەتی محمد دەکات لەبەر یەک هۆکاری زۆر گرینگ، ئەویش ئەوەیە کە لەپاش باوەڕهێنانەکەیان، ئیتر فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن، هەروەک فەرموویەتی: **{كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله ...}**[٢]. واتە: {ئێوە باشترین ئوممەت بوون کە بۆ ئەم خەڵکە هاتن، بەوەی کە فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن، هەروەها باوەڕتان بە أللە هەیە ...}.

ئەی قەومەکەم، خۆ بینیتان، بانگەواز کردنی خەڵک و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە یەکێکە لە ئەرکە هەرە گرینگەکانی شەریعەتی أللە، کەچی شەریعەتی تاغوتی دیمۆکراسیەت بەناوی "ئازادی تاکەکەسی" ئەم ئەرکە پیرۆزە پەکدەخات. ئیتر مرۆڤەکان ئازاد کراون لە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەک، کەسیش بۆی نییە سنووری کەسی تر ببەزێنێ و پێی بڵێت وامەکە و سەرپێچی أللە مەکە و تۆ

(١) سورەتی لقمان، ئایەی ١٧.
(٢) سورەتی آل عمران، ئایەی ١١٠.

هەڵەیت و هتد...، ئەگینا کەسەکە ئەتوانێ داوای یاسایی تۆمار بکات و بڵێت فلانە کەس ئازادیم پێشێل دەکات! جا ئەی قەومەکەم، چۆن مومارِسەی شەریعەتە دەکەن؟

ئیتر ئەوەتا بۆتان دەرکەوت ئەم چەواشەکارییەی دیمۆکڕاسیخوازەکان ڕاست نییە کە دەڵێن: نابێ هیچ کەسێک تەداخولی کەسێکی تر بکات و ئازادییەکەی پێشێل بکات!. لەڕاستیدا ئەمە تەنها لە بەرژەوەندیی شەیتانە تاکو مرۆڤە گومڕاکان لەسەر گومڕایی خۆیان بمێننەوە تاکو مردن.

**جۆری دووەم: لێپرسینەوەی دواڕۆژ:** ئەمەشیان لەدوای مردنی مرۆڤەکەوە دەست پێدەکات و ئیتر لەناو گۆڕەکەی و هەروەها دواتریش کە زیندووکرایەوە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت سەبارەت بە کردەوەکانی دونیای، هەروەها لەو ڕۆژەدا کەس ناتوانێ ئینکاری بکات؛ چونکە ألله کتێبی کردەوەکان دەداتە دەست مرۆڤەکان، ئیتر مرۆڤەکە دەبینێت هەنگاو بە هەنگاوی تەمەنی تۆمار کراوە، گوفتارەکانی تۆمار کراون. ئیتر ئەگەر مرۆڤەکە باوەڕدار و موەحید بووبێ ئەوا بەوپەڕی دڵخۆشییەوە کتێبەکەی وەردەگرێ، بەڵام دووڕوو و کافران و موشریکەکان بەوپەڕی لەرزین و شۆکەوە کتێبەکەیان وەردەگرن و دەزانن ئیتر بەسەریان تێنەپەڕیوە.

بەڵگەکانیش زۆرن لەسەر لێپرسینەوەی دواڕۆژ، لێپرسینەوەکە لەسەر بنەمای کردەوە و گوفتار و بیروباوەڕی مرۆڤەکانە، هەموو مرۆڤایەتی ئەگرێتەوە[(١)]، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**فوربك لنسئلنهم أجمعين * عما كانوا يعملون**}[(٢)]. واتە: {–ئەی

(١) تەنها کەمینەیەکی موسڵمانان نەبێ لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکرێ لە قیامەت، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەچنە بەهەشت، ئەمەش بە فەرموودەی صحیح یەکلاکراوەتەوە بۆمان لە پێغەمبەرەوە –صلى الله عليه وسلم– هەروەک فەرمووی: "يدخل الجنة من أمتي سبعون ألفا بغير حساب ..."، واتە: "حەفتا هەزار کەس لەنێو ئوممەتەکەم دەچنە ناو بەهەشت بەبێ لێپرسینەوە ..." [کتێبی صحيح البخاري > كتاب الرقاق > باب ومن يتوكل على الله فهو حسبه > فەرموودەی ژمارە: ٦٤٧٢].

(٢) سوڕەتی الحجر، ئایەی ٩٢ و ٩٣.

محمد– سوێند بە پەروەردگارت لێپرسینەوە لەگەڵ هەموویان دەکەین * لەبارەی کردەوەکانیان کە دەیانکرد}.

خۆ ئەگەر مرۆڤەکان ئینکاریی لە گوفتارێک یان کردارێکی خۆیان بکەن، ئەوا ألله فەرمان بە زمان و دەست و قاچیان دەکات و ئیتر لێیان دێنە دەنگ و بەدرۆیان دەخەنەوە، هەروەک فەرموویەتی: **{يوم تشهد عليهم ألسنتهم وأيديهم وأرجلهم بما كانوا يعملون}**[1]. واتە: {ڕۆژێک دێت کەوا زمانەکانیان و دەستەکانیان و قاچەکانیان شاهێدیان لەسەر دەدەن لەبارەی ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد}.

لەدوای ئەوەی بەبەڵگەوە زانیمان لە شەریعەتی ألله دا لێپرسینەوەی دونیایی و دواڕۆژیش هەیە، **ئێستا پرسیارێکی تر دێتە کایەوە: ئایا سوودی بانگەواز و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە چییە؟**

لە وەڵامدا دەڵێم: بێگومان ئەم ئەرکە پیرۆزە سوودێکی زۆر زۆری هەیە بۆ مرۆڤایەتیی؛ چونکە ئێمە وەکو دێمۆکڕاسیخوازەکان ناڵێین ئەم دونیایە سودفەیە، بەڵکو ئەم دونیایە لەپێناوی ئامانجی پەرستنی ألله دروست کراوە نەک بۆ گاڵتە. بۆیەش پێویستە عەبدەکانی ألله ئاگادار بکرێنەوە لەم حەقیقەتە، ئەمەش چەند سوودێکی هەیە:

**یەکەم:** ئەو کەسەی بانگەواز دەکات و خەڵک ئاگادار دەکاتەوە لە حەق و ناحەق، یەکەمین سوودی ئەوەیە کە دینی ألله دەگەیەنێتە بەر گوێی خەڵکەکە، ئیتر ئەمەش دەبێتە هۆکارێک بۆ ئەوەی بەشێکیان لەلایەن ألله هیدایەت بدرێن بەرەو تەسلیم بوونی ألله، هەروەک ألله فەرموویەتی: **{وإذ قالت أمة منهم لم تعظون قوما الله مهلكهم أو معذبهم عذابا شديدا قالوا معذرة من ربكم ولعلهم يتقون}**[2]. واتە: {ئەو کاتەی بەشێکی قەومەکە گوتیان: ئێوە بۆچی هۆشداریی دەدەنە قەومێک کە

---

(١) سوڕەتی النور، ئایەی ٢٤.

(٢) سوڕەتی الأعراف، ئایەی ١٦٤.

أللە لەناویان دەبات یاخود بە سزایەکی بەئێش سزایان دەدات؟ گووتیان: بۆ ئەوەی بیانوومان هەبێ لای پەروەردگارتان، هەروەها بەشکو لە أللە بترسن}.

لەم ئایەتەوە ئامانجەکانی بانگەوازمان بۆ دەردەکەوێت، یەکەم ئامانج ئەوەیە کە موسڵمانەکە خەڵک هۆشیار دەکاتەوە تاکو لەلای أللە سەرشۆڕ نەبێت و بتوانێت بڵێت خودایە ئەوەتا بانگەوازی خەڵکەکەم کرد و ئەرکی خۆمم جێبەجێ کرد. ئامانجی دووەمیش ئەوەیە کە بەشکو خەڵکەکە تەوبە بکەن و لە أللە بترسن و کوفر بە تاغوت بکەن.

**دووەم:** سوودێکی تری ئاگادارکردنەوەی خەڵکەکان ئەوەیە کە بەم هۆیەوە ئیتر خەڵک پارێزراو دەبن لە تاوان، پارێزراو دەبن لەو عیبادەتە چەوتانەی کەوا لە قورئان و سوننەدا باس نەکراون (واتە بدعة)، هەروەها پارێزراو دەبن لە شیرکی گەورە و بچووک. ئیتر خەڵک خۆیان لەو سەرچاوانەش دەپارێزن کە هاندەری خەڵکن بەرەو تاوان و کوفر و شیرک.

**سێیەم:** ئاگادارکردنەوەی خەڵک (بەتایبەتیش موسڵمانەکانیان) دەچێتە ژێر مانای "التعاون على البر والتقوى"، بەڵام خۆ بێدەنگ کردن و بانگەواز نەکردن دەچێتە ژێر مانای "التعاون على الإثم والعدوان"[١]، هەروەک فەرموویەتی: {**... وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان ...**}[٢]. واتە: {... هەروەها هاریکاری یەکتر بکەن لەسەر کاری چاکە و پارێزکاریی (واتە تەقوا)، هاریکاری یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و سنوور بەزاندن ...}.

---

(١) مەبەست لەو حاڵەتەیە کە خۆ بێدەنگ کردنەکە بەجۆرێکی موتڵەق بێت، واتە کەسەکە لای هیچ کەسێک بانگەواز نەکات. بەڵام ئەگەر بەهۆی ترسەوە لەلای هەموو خەڵک بانگەواز نەکات و تەنها لای کەسانێکی متمانە پێکراو بانگەواز بکات ئەوا ئەم حوکمە نایگرێتەوە.

(٢) سورەتی المائدة، ئایەی ٢.

**چوارەم:** بانگەواز و ترساندنی خەڵک لەکاتی تاوان و کوفر و سەرپێچییەکانیان هۆکارێکە بۆ ئەوەی قەومەکە پارێزراو بن لە بەڵا و موسیبەت و سزای ألله، هەروەک نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– فەرموویەتی: «**والذي نفسي بيده لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر أو ليوشكن الله أن يبعث عليكم عقابا منه ثم تدعونه فلا يستجاب لكم**»[١]. واتە: «**سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە (واتە ألله)، ئێوە یان ئەوەیە فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپەکاریی دەکەن، یانیش نزیکە کەوا ألله سزایەک بنێرێ بۆتان لەلایەن خۆیەوە، ئینجا ئێوەش داوای لێدەکەن و وەڵامتان ناداتەوە**».

هەروەها فەرموویەتی: «**ما من قوم يعمل فيهم بالمعاصي، ثم يقدرون على أن يغيروا، ثم لا يغيروا إلا يوشك أن يعمهم الله منه بعقاب**»[٢]. واتە: «**هەر قەومێک تاوان لەنێویاندا بەربڵاو بێت، خۆیشیان توانای گۆڕانکارییان هەبێت بۆ ڕێگریکردن کەچی هەر گۆڕانکاریی نەکەن، ئەوا ئیللا نزیکە کەوا ألله سزای هەموویان بدات بە گشتیی**».

پەنا بە ألله لەم هەڕەشە توندە، هەر بۆیەش لەوەتەی ئوممەتی ئیسلام پشتیان لە شەریعەتی ألله هەڵکردووە بەرەو شەریعەتە تاغوتەکان، لەوکاتەوە دەبینین ئەم قەومانە خێر و خۆشیی لەخۆیانەوە نابینن و ساڵانە تووشی کۆمەڵێک فیتنەی ناوخۆیی و دەرەکی دەبنەوە، سەیرەکە لەوەیە کە هێندە بێ ئاگان لە دینەکەی ألله بۆیەش نازانن هۆکاری کێشەکانیان ئەوەیە پشتیان لە شەریعەتی ألله کردووە و خۆیان لە خراپەکاریی بێدەنگ کردووە. بۆیەش ڕۆژ لە ڕۆژ حاڵیان خراپتر دەبێت، کەچی هێشتاش گوێ ناگرن لە ئەهلی حەق.

**پێنجەم:** بانگەوازکردن و ترساندنی خەڵک لەم دونیایەدا هۆکارێکە بۆ ئەوەی هیدایەت وەرگرن، بەمەش پارێزراو دەبن لە دیمەنە سامناکەکانی قیامەت؛ چونکە لە قیامەتدا ئەو دۆستانەی کە لەسەر بنەمای دونیاپەرستی هاوڕێ بوون ئەوا دژایەتی

---

(١) کتێبی سنن الترمذي > أبواب الفتن > باب ما جاء في الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر > فەرموودەی ژمارە: ٢١٦٩.

(٢) کتێبی سنن أبي داود > كتاب الملاحم > باب في الأمر والنهي > فەرموودەی ژمارە: ٤٣٣٨.

یەکتر دەکەن و خۆزگە دەخوازن بەوەی کە یەکتریان نەناسیایە، هەموویان یەکتر تۆمەتبار دەکەن و هەر یەکێکیان بەوەی تر دەڵێت: تۆ بووی سەرت لەمن دەشێواند و نەتدەهێشت حەق قەبوڵ بکەم. ئەوەی تریش دەڵێت: خۆ ناچارم نەکردبووی، خۆت هاوڕێیەتی منت دەکرد، تۆش منت بەم دونیایە مەشغوڵ کردبوو و پشتت لە ألله کردبوو. هەروەک لە کتێبەکەی ألله هاتووە: {**ويوم يعض الظالم على يديه ياليتني اتخذت مع الرسول سبيلا * ياويلتى ليتني لم أتخذ فلانا خليلا * لقد أضلني عن الذكر بعد إذ جآءني وكان الشيطان للإنسان خذولا**}[1]. واتە: {هەروەها ڕۆژێک دێت کە ستەمکار قەپ لە دەستی خۆی دەگرێت –و دەڵێت:– خۆزگە ڕێگام بگرتایە بەر لەگەڵ نێردراو (واتە پێغەمبەر) * لەناوچوون بۆ من، خۆزگە فڵان کەسم نەکردایەتە خۆشەویست و دۆستم * بەڕاستیی منی گومڕاکرد لە زیکر (واتە ئیسلام) لەدوای ئەوەی پێم گەیشتبوو، هەروەها شەیتان هەمیشە پشت هەڵکەرە لە مرۆڤ}.

هەر هەموویان پشت لە یەکتر دەکەن و دەمەتەقەیانە، تەنها ئەو دۆستانە نەبێت کە لەپێناوی ألله دۆستایەتی یەکتریان دەکرد و ئیمان و تەقوای یەکتریان بەرزتر دەکردەوە، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**الإخلآء يومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقين**}[2]. واتە: {لەو ڕۆژەدا دۆستە خۆشەویستەکان دوژمنی یەکترن، تەنها پارێزگار و تەقواداران نەبێ}.

ئەمە جگە لەوەی لە کۆتاییدا مرۆڤە کافر و دووڕووەکان هەموویان ڕوویان لە ئیبلیس دەکەن و دەڵێن ئێمە گوێڕایەڵی تۆ بووین و هاوکاریمان بکە. لە وەڵامدا ئیبلیس بێ هیوایان دەکات، هەروەک ألله پێمان دەڵێت: {**وقال الشيطان لما قضى الأمر إن الله وعدكم وعد الحق ووعدتكم فأخلفتكم وما كان لي عليكم من سلطان إلا أن دعوتكم فاستجبتم لي فلا تلوموني ولوموا أنفسكم مآ أنا بمصرخكم ومآ أنتم بمصرخي إني**

---

(١) سورەتی الفرقان، ئایەی ٢٧ تا ٢٩.

(٢) سورەتی الزخرف، ئایەی ٦٧.

**كفرت بمآ أشركتمون من قبل إن الظالمين لهم عذاب أليم}**[1]. واتە: {شەیتانیش لەدوای ئەوەی کارەکە کۆتایی پێهات (واتە لەدوای لێپرسینەوەی قیامەت) گووتی: بەڕاستیی ألله بەڵێنێکی حەقی بەئێوە دا، منیش بەڵێنم بەئێوە دا، ئیتر من بەڵێنی خۆم نەبردە سەر و ئێوەم هەڵخەڵەتاند، هەروەها ئەوکاتیش کە بانگەوازم دەکردن خۆ هیچ هێز و توانایەکم نەبوو تاکو ناچارتان بکەم، بەڵکو ئێوە خۆتان وەڵامتان دامەوە بۆیەش سەرزەنشتی من مەکەن بەڵکو سەرزەنشتی خۆتان بکەن، من ناتوانم فریاڕەسی[2] ئێوە بم، ئێوەش ناتوانن فریاڕەسی من بن، هەروەها بەدڵنیاییەوە من باوەڕم بەوە نەبوو کە ئێوە لەمەوپێش (واتە لە ژیانی دونیا) منتان کردبووە شەریکی ألله. بەڕاستی ستەمکاران سزای بەئێشیان بۆ هەیە}.

کەواتە ئەی قەومەکەم، خۆ بینیتان بانگەواز کردن چەند بەسوودە لە دونیا و دواڕۆژ، کەچی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتدا مرۆڤ دەبێ ئازاد بێ و کەسیش بۆی نییە لێپرسینەوە لەگەڵ کەسانی تر بکات. پەنا بە ألله لەم شەریعەتە تاغوتە، هاوار بۆ حاڵی ئەوەی مومارەسەی دروشمەکانی بکات، بەتایبەت دروشمی دەنگدان.

---

(١) سورەتی إبراهیم، ئایەی ٢٢.

(٢) فریاڕەس: ئەو کەسەی کە بە هانای کەسانێکی ترەوە بچێت و دەربازیان بکات.

**بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دیمۆکڕاسیەت.**

**بنچینەی پێنجەم: جیاکردنەوەی دین لە حوکمڕانیی (العلمانية).**

ئەمەش بنچینەیەکی تری دیمۆکڕاسیەتی تاغوتە، پێی دەگووترێ "عەلمانیەت"، یاخود سێکیولاریسم (Secularism)، بەمانای "دونیایی" دێت، بەپێچەوانەی "دینی" دێت. **پێناسەیشی کراوە بەوەی:** بریتییە لە دابڕاندنی دین لە حوکمڕانیی و سیاسەت. دەتوانین بڵێین لەمەش زۆرتر سنووری مرۆڤەکان دەبەزێنێ؛ چونکە ناهێڵێت موسڵمانان (هەروەها دینەکانی تریش) پەیڕەوی دینی خۆیان بکەن لە هەموو ڕوویێک، بەڵکو ناچاریان دەکات کە دینەکەیان بچووک بکەنەوە و تەنها لە عەقڵی خۆیاندا بیهێڵنەوە! دینێکی وەکو ئیسلام –بۆ نموونە– نابێت لە مزگەوت زیادتر سنووریان ببەزێنێ! تەنانەت بەمەش ناوەستن! بەڵکو بە جۆرەها ڕێگا سووکایەتیی بە دروشمە ئیسلامییەکانیش دەکەن؛ بۆ ئەوەی موسڵمان بەتەواویی دینەکەی لەبەرچاو ناشرین بێت و هێواش هێواش بە ئاڕاستەی بێ دینیی و دونیاپەرستیی بچێت.

کەواتە لە عەلمانیەتدا تەنها عیبادەت و دروشمە شەخسییەکان قەبوڵ دەکرێت، بەڵام ئەو عیبادەت و دروشمە گشتییانە قەبوڵ ناکرێن کە سنووری تاکە مرۆڤەکە دەبەزێنن. جا ئەی قەومەکەم، چاک بزانن هەر کەسێک بەشێکی ئیسلام و قورئان وەرگرێت کەوا باس لە عیبادەتە شەخسییەکان دەکات وەکو نوێژ و ڕۆژوو و حەج، کەچی بەشێکی تری وەرنەگرێت کە باسی حوکمڕانیی و دەستوور و تەشریع و جیهاد و پەیمانبەستن و سەرانە (واتە جزية) دەکات، ئەوا بێگومان ئەو کەسە کافرە؛ چونکە باوەڕی بە بەشێکی کتێبەکەی ألله هەیە و باوەڕی بە بەشێکی تری نییە!

هەروەک ألله هەمان ڕەخنە لە جولەکەکان دەگرێت، کاتێک دەفەرمووێت: {... **أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض فما جزاء من يفعل ذلك منكم إلا خزي في**

**الحياة الدنيا ويوم القيامة يردون إلى أشد العذاب ...}**[1]. واته: {... ئايا ئێوه باوەڕ دەهێنن بە بەشێکی کتاب و باوەڕناهێنن بە بەشێکی؟! جا ئایا پاداشتی ئەو کەسە چییە کەوا ئەم کارە بکات جگە لە سەرشۆڕیی لەدونیا، هەروەها لە ڕۆژی هەڵسانەوەش (واته القيامة) دەگەڕێندرێنەوە بۆ توندترین سزادان ...}.

ئەها قەومەکەم، ئایا ئەم عەلمانیی و دیمۆکراسیانەش هەر ئاوا نین؟ بێگومان بەڵێ، ئەوانیش بە خەڵک دەڵێن: کێشە نییە دینداریيەکی شەخسیی بکەن بەڵام نابێ دینداریيەکەتان سنووری شەخس و مزگەوت ببەزێنێ! نابێ زەکات و سیاسەت و جیهاد و هتد... بکەن! کەواتە هەمان ئایەتی پەروەردگاریان لەسەر جێبەجێ نابێت؟ لە ألله بترسن ئەی قەومەکەم.

ئیسلام ئاینێکی بچووک نییە کە تەنها لە نوێژ و حەج پێکهاتبێت، ئەمە بانگەشەی کەسانێکی درۆزن و تاغوتپەرستە کە هەڵگری دروشمی عەلمانیەتی تاغوتن. هەروەک مەسعود بارزانیی -ألله لە هەردوو دونیادا ڕیسوای بکات- دەڵێت: دین ڕێگەیەکە لەنێوان خۆت و خوای خۆت!

بێگومان قسەکەی مەسعودیش هی خۆی نییە، بەڵکو لە سەلەفە فاسیدەکانی خۆیەوە بۆی ماوەتەوە، ئەمەش کاتێک کە پاشا لویسی نۆیەم کە پاشایەکی گاوری فەڕەنسیی بوو، زیادتر لە ٩٠٠ ساڵ پێشی ئێستا هێرشی کردە سەر خاکی موسڵمانان و لەشکرەکەی تێکشکا لە میسڕ، ئەوەبوو گووتی: لا بد من التفريق بين العقيدة والشريعة. واته: پێویستە جیاوازیی بخەینە نێوان عەقیدە و شەریعەتی موسڵمانان.

ئەم پاشایە گاورە موشریکە بیری کردووەتەوە و زانیویەتی کەوا تاکە ڕێگا بۆ زاڵبوون بەسەر موسڵمانان ئەوەیە کە دینەکەیان تەنها لە عەقڵیاندا بمێنێتەوە، بەڵام نەهێڵین ئەم دینە بکەنە شەریعەتێک بۆ سیاسەت کردن و بەڕێوەبردنی دەوڵەت!

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٨٥.

هەر بۆیەش دەبینین مەسعود و هاوبیرەکانی –ألله بەیەکەوە لەناویان بەرێت– لەسەر هەمان ڕێگای ئەو موشریکە پیسانەن و باوەڕیان بە بەشێکی شەریعەتەکەی ألله هەیە کەوا شەخسین، بۆ نموونە نوێژ و ڕۆژوو و حەج، بەڵام بەشێکی تری ڕەتدەکەنەوە کەوا حوکمڕانی و گشتین، وەکو جیهاد و زەکات و سیاسەت و تەشریع و سزایە شەڕعییەکان! منیش دەپرسم: ئایا ئایەتەکەی سەرەوە لەسەریان جێبەجێ بوو یان نا؟! بێگومان بەڵێ؛ چونکە کافرن بە بەشێکی قوڕئان، لە هەمان کاتیشدا خۆیان وا پیشان دەدەن کە باوەڕیان بە بەشێکی قوڕئان هەیە! درۆش دەکەن و ئەسڵەن باوەڕیان بە یەک ئایەتی ألله نییە.

جا کوفرەکەیان هەر بەوە ناوەستێت کە شەریعەتی ألله ڕەت بکەنەوە، بەڵکو دواتریش شەریعەتێکی تاغوت دەهێننە شوێنی و دەیکەنە دەستوور و شەریعەتی خەڵک، بەمەش ئەم ئایەتەیشیان لەسەر جێبەجێ دەبێت کە ألله فەرموویەتی: {**... يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ...**}[(١)]. واتە: {... ئەوانە دەیانەوێت دادگەرێتیی بگەڕێننەوە بۆ تاغوت لەکاتێکدا فەرمانیان پێکراوە کەوا کوفری پێ بکەن ...}.

کەواتە باوەڕیان بە شەریعەتە تاغوتییەکانیش هەیە، بەمەش دەردەکەوێت ئەمانە موسڵمان نین؛ چونکە مرۆڤ ئەگەر بیەوێت ببێتە موسڵمان ئەوا دەبێ سەرەتا کوفر بە تاغوتەکان بکات. ئەگینا هەرگیز نابێتە موسڵمان، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**... فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ...**}[(٢)]. واتە: {... جا هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە ألله بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}.

---

(١) سوڕەتی النساء، ئایەی ٦٠.

(٢) سوڕەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

ئەی قەومەکەم، سەیری ئەم دوو ئایەتە بکەن، هەردووکیان لەناو قورئانن، موسڵمان دەبێ باوەڕی بە هەردووکیان هەبێت و جێبەجێیان بکات، یەکێکیان ئەوەیە کە ألله فەرموویەتی: {... **کتب علیکم الصیام ...**}[1]. واتە: {... ڕۆژووگرتن لەسەرتان واجب کراوە ...}. لە هەمان کاتیشدا ألله فەرموویەتی {**کتب علیکم القتال ...**}[2]. واتە: {کوشتاری کافران لەسەرتان واجب کراوە ...}.

جا دێمۆکڕاسیخوازە تاغوتپەرستەکان کێشەیان لەگەڵ ئەوەی یەکەم نییە، کەچی ئەوەی دووەم ڕەت دەکەنەوە! نموونەی تری لەمجۆرەمان زۆر زۆرە، دەیان ئایەت لەم قورئانە هەن کەوا تاغوتپەرستەکان ڕەتی دەکەنەوە، لە خاکی کوردستانیش تێکڕای ئەو ئایەتانە ڕەتکراونەتەوە؛ چونکە ئەم خاکە بە شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت بەڕێوەدەچێت و هەموو بنچینەکانی دێمۆکڕاسیەتی تێدایە بەتایبەتیش عەلمانیەت.

بەلای دێمۆکڕاسیخوازەکانەوە قورئان نابێ لە مزگەوت زیادتر حوکم بکات، قورئان تەنها بۆ خوێندنەوە و تەجوید و قیرائاتە بەتەنها، بەڵام نابێ بکرێتە شەریعەت و دەستوور بۆ سیاسەتێکی شەرعیی. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ألله فەرمان بە پێغەمبەر دەکات و پێمان ڕادەگەیەنێت قورئان بۆ سیاسەت و حوکمڕانی و دادگەرێتیش هاتووە، هەروەک دەفەرمووێت: {**إنا أنزلنا إليك الكتاب بالحق لتحكم بين الناس بما أراك الله ...**}[3]. واتە: {-ئەی محمد- ئێمە ئەم نووسراوەمان بۆت دابەزاندووە بە حەق بۆ ئەوەی حوکمڕانی پێ بکەیت لەنێوان خەڵک بەوجۆرەی کە ألله پیشانتی داوە ...}.

ئەی قەومەکەم، خۆ دەبینن، ألله لەڕێگای نێردراوەکەی ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەم قورئانە بریتییە لە شەریعەتێک بۆ حوکمڕانی تاک و کۆمەڵگا و خاک، ئیتر تاکو کەی بەردەوام دەبن لە مومارەسە کردنی شەریعەتێکی تاغوتی وەکو دێمۆکڕاسیەت کە یەکێک لە دروشمەکانی بریتییە لە دابڕاندنی دین لە حوکمڕانی؟! گومان لەوە نییە

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ١٨٣.

(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ٢١٦.

(٣) سورەتی النساء، ئایەی ١٠٥.

هەر کەسێک مومارەسەی هەر دروشمێکی ئەم شەریعەتە بکات (بۆ نموونە دەنگدان) ئەوا پێی کافر بووە چونکە بنچینەکانی دێمۆکڕاسیەت بەهۆی دەنگدان پتەو دەبن.

**بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دێمۆکڕاسیەت.**

**بنچینەی شەشەم: بیروڕای زۆرینە گرینگترین شتە.**

یەکێکی تر لە بنچینەکانی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت، بریتییە لە بە پیرۆز ڕاگرتنی بیروڕا و خواستی زۆرینەی خەڵکەکە. ئەگەر زۆرینەی خەڵکەکە ویستی هەر شتێکیان هەبێت ئەوا حوکومەتە تاغوتپەرستەکە پێویستە خواستەکەیان بەدی بهێنێت.

لەڕاستیدا دێمۆکڕاسیخوازەکان لەگەڵ ئەم بنچینەیەی خۆیشیان ڕازی نین، ئەوەتا زۆرینەی ئەم قەومە موشریکەی کورد دەنگیاندا و داوایان کرد دەوڵەتێکی کوردیی دروست بکرێت و بە دێمۆکڕاسیەتی تاغوت حوکمڕانی تێدا بکرێت، کەچی ئەمریکا و ئەوڕوپا پشتیان لە کورد کرد و حیسابیان بۆ خواستەکەیان نەکرد. تەنانەت هەمان داواکاری خەڵکی کەتەلۆنیایان ڕەتکردەوە و کوشتاریان کردن و دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کەتەلۆنیا دەستگیر کران و هەندێکیشیان ڕایانکرد! ئەمەش گوایە ئەوێ ناو جەرگەی دێمۆکڕاسیەتیشە!

تەنانەت ئەگەر هەموو قەومی کورد بگەڕێنەوە بۆ سەر شەریعەتەکەی ألله و بیانەوێت حوکمی پێبکەن ئەوا دێمۆکڕاسیخوازە دووڕووەکان بەمە ڕازی نابن و بە ناوی تیرۆرەوە دێن و کوشتاری تێکڕای قەومی کورد دەکەن! ئەمەیە ڕووی ڕاستەقینەیان ئەی قەومەکەم. دێمۆکڕاسیەت لای ئەوان واتە بەرژەوەندیی، جا ئەگەر بەرژەوەندییەکانیان بە دێمۆکڕاسیەت هاتە دی ئەوا ڕوو و زمانیان خۆش دەکەن، ئەگەریش بەرژەوەندییەکانیان بە دێمۆکڕاسیەت نەهاتە دی ئەوا وەکو وەحش مامەڵە دەکەن، هەموومان کاوڵکارییەکەی هیرۆشیما و ناکازاکیمان بیستووە، هەموومان جەنگە جیهانییەکانی یەکەم و دووەممان بیستووە، جەنگی "سارد" مان بیستووە.

بەهەرحاڵ، لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتدا ئەگەر داواکاریی زۆرینەی خەڵکەکە پێچەوانەی شەریعەتی ألله بوو، ئەوا بێگومان قسەی خەڵکەکە دەچەسپێت؛ چونکە لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا بیروڕای زۆرینە بریتییە لە حەق، ئەگەرچی ناحەقیش بێت لە شەریعەتی ألله.

با بزانین لە شەریعەتی پەروەردگارمان –سبحانه وتعالى– چۆن باسی زۆرینە کراوە، ئەی قەومەکەم، کاتێک سەیری قورئان دەکەین، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە زۆرینەی مرۆڤەکان لەسەر کوفر و شیرکن، زۆرینەی مرۆڤەکان سەرپێچیکاری پەروەردگارن، زۆرینەی مرۆڤەکان بێ ئاگان لە حەقیقەتی ئەم ژیانە. هەروەک فەرموویەتی:

١- زۆرینەی خەڵک ئامادە نین باوەڕ بهێنن بە ألله: {**... إنه الحق من ربك ولكن أكثر الناس لا يؤمنون**}[1]. واتە: {... بەڕاستیی –ئەم قورئانە– حەقێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە، بەڵام زۆرینەی خەڵک باوەڕ ناهێنن}.

٢- زۆرینەی خەڵک نەزان و بێ ئاگان: {**... إن الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكن أكثر الناس لا يعلمون**}[2]. واتە: {... بەڕاستی حوکم تەنها مافی ألله یە، فەرمانی کردووە پەرستن مەکەن تەنها بۆ ئەو نەبێ، ئەمەیە دینی دامەزراو بەڵام زۆرینەی خەڵک نازانن}.

٣- زۆرینەی خەڵک موشریکن: {**وما يؤمن أكثرهم بالله إلا وهم مشركون**}[3]. واتە: {زۆرینەیان باوەڕ بە ألله ناهێنن و ئیللا لەگەڵ باوەڕهێنانەکەیان شیرکی بۆ دادەنێن}.

---

(١) سورەتی هود، ئایەی ١٧.

(٢) سورەتی یوسف، ئایەی ٤٠.

(٣) سورەتی یوسف، ئایەی ١٠٦.

٤- زۆرینەی خەڵک سەرپێچیکارن بەرامبەر ألله: **{... وإن كثيرا من الناس لفاسقون}**[١]. واتە: {بەڕاستیی زۆرینەی خەڵک فاسقن[٢]}.

٥- زۆرینەی خەڵک پشت لە حەق هەڵدەکەن: **{وكأيِّن من ءاية في السماوات والأرض يمرون عليها وهم عنها معرضون}**[٣]. واتە: {چەندە زۆرن ئەو بەڵگانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان و ئەم خەڵکەش بەسەریدا تێدەپەڕن و پشتیانی لێ هەڵدەکەن}.

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو ألله هەر بە ئاشکرا پێمان ڕادەگەیەنێت ئەگەر شوێنی زۆرینەی خەڵک بکەوین ئەوا چارەنووسمان چی دەبێ، هەروەک پێمان دەفەرمووێ: **{وإن تطع أكثر من في الأرض يضلوك عن سبيل الله إن يتبعون إلا الظن وإن هم إلا يخرصون}**[٤]. واتە: {–ئەی محمد– ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆرینەی ئەوانە بکەیت کە لەسەر زەوین (واتە خەڵک) ئەوا گومڕا و لاڕێت دەکەن لە ڕێگاکەی ألله، ئەوان شوێن هیچ ناکەون جگە لە گومان، ئەوان خەریکی هیچ نین جگە لە درۆکردن}.

کەچی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتدا خواستی زۆرینەی قەومەکە لە هەموو شتێک گرینگترە، هەر بۆیەش دەبینین لەو خاکانەی کە بەم شەریعەتە تاغوتە بەڕێوەدەچن پڕن لە دیاردە شیرکییەکان؛ ئەمەش چونکە زۆرینەی خەڵک موشریکن. هەروەها زۆرینەی خەڵک لەو خاکانە بێ ئاگان لە دینەکەی ألله؛ چونکە زۆرینەی خەڵک نەزانن. هەروەها لەو خاکانەدا جۆرەها تاوان و کردەوەی قێزەون دەبینرێن؛ چونکە زۆرینەی خەڵک فاسق و سەرپێچیکارن. هەروەها لەو خاکانەدا زۆر دژایەتی و گاڵتە بە ئەهلی تەوحید دەکرێت؛ چونکە زۆرینەی خەڵک پشتیان کردووەتە حەق.

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٩.

(٢) فاسق: ئەو موسڵمانەیە کەوا سەرپێچی ألله دەکات و سنووری دەبەزێنێ و گوێڕایەڵی ناکات، ئەم حوکمەش جیاوازە لە "کافر"؛ چونکە فاسق هێشتا موسڵمانە، بەڵام ئەگەر تاوانەکەی فیسقی گەورە بوو (وەکو شیرک و کوفر) ئەوا پێی لە دین دەچێتە دەرەوە.

(٣) سورەتی یوسف، ئایەی ١٠٥.

(٤) سورەتی الأنعام، ئایەی ١١٦.

له شەریعەتی پەروەردگارماندا حوکمەکانی ألله جێگیر دەکرێن ئەگەرچی پێچەوانەی ویست و خواستی دڵی زۆرینەی خەڵکەکەش بێت؛ چونکە هەرگیز زۆرینە لەسەر حەق نین، تەنانەت ئەگەر هەموو ئەهلی زەویش بن. هەروەک ألله فەرموویەتی: {**وأن احكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع أهواءهم واحذرهم أن يفتنوك عن بعض ما أنزل الله إليك ...**}[1]. واتە: {–ئەی محمد– دادگەرێتیی لەنێوانیان بکە بەوەی ألله دایبەزاندووە، نەکەی شوێنی ئارەزوو و خواستەکانیان بکەویت، ئاگادارییانبە نەوەک تووشی فیتنەت بکەن سەبارەت بە بەشێک لەوەی کە ألله دایبەزاندووە بۆت ...}.

**لەم ئایەتە پیرۆزەدا چەند تێبینییەک دەردەکەون:**

١- قورئان و سوننەتی پێغەمبەر بریتین لە تاکە شەریعەت و دەستوورێک بۆ حوکمڕانی تاک و کۆمەڵگە.

٢- واجبە ئەهلی تەوحید حوکمی ألله بچەسپێنن لەسەر خاکی ألله ئەگەرچی زۆرینەی خەڵکەکە بەدڵیان نەبێت.

٣- پێویستە ئەهلی تەوحید سەرتاپای شەریعەتی ألله جێبەجێ بکەن بەهەموو توانایان، نابێ لەبەر خاتری خواستی خەڵکەکە تەنازول لە جێبەجێ کردنی شەریعەتی ألله بکرێت. هەروەک ئەو کاتەی خەڵکانێک داوایان لە نێردراوی ألله کرد تاکو دەستی ئافرەتێکی دز نەبڕدرێتەوە چونکە بنەماڵەیەکی ناودار بوون، بەڵام نێردراوی ألله –علیه الصلاة والسلام– فەرمووی «... **فإنما أهلك الناس قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد، والذي نفس محمد بيده، لو أن فاطمة بن محمد سرقت لقطعت يدها ...**»[2]. واتە: «... **بەڕاستی خەڵکی پێش ئێوە لەناوچوون بەوەی کە ئەگەر کەسێکی ناودار لەناویان دزی بکردایە**

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٩.

(٢) کتێبی صحيح البخاري > كتاب المغازي > فەرموودەی ژمارە: ٤٣٠٤.

**ئەوا هیچیان لێی نەدەکرد، ئەگەریش کەسێکی لاواز و بێ توانا لەناویان دزی بکردایە ئەوا سزایان دەدا، جا سوێند بەوەی کە نەفسی محمد ی بەدەستەوەیە، ئەگەر فاطمة ی کچی محمد دزی بکات ئەوا دەستی دەبڕم ...»**.

خۆ ئەگەر بەپێی شەریعەتە تاغوتەکەی دیمۆکڕاسیەت بێت ئەوا دەبێ باوەڕ بەو ئایاتانەی پەروەردگارمان نەکەین کە فەرمان بە بڕینی دەستی دز دەکەن؛ چونکە زۆرینەی قەومەکە بەدڵیان نییە!

لە شەریعەتی پەروەردگاری حەوت ئاسمان و زەویەکەدا مرۆڤەکان تەنها ئەرکیان ئەوەیە کە تەسلیمی پەروەردگاریان بن، کاتێک هەواڵێکیان لە قوڕئان و سوننە پێگەیشت ئەوا بڵێن: ءامنا (واتە باوەڕمان هێنا). کاتێکیش حوکمێکی شەڕعیان پێگەیشت ئەوا بڵێن: سمعنا وأطعنا (واتە بیستمان و گوێڕایەڵین). جا ئەگەر ڕەتی بکەنەوە ئەوا پێی کافر دەبن و لە دین دەچنە دەرەوە، هەروەک پەروەردگار فەرموویەتی: {**وما كان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله ورسوله أمرا أن يكون لهم الخيرة من أمرهم ومن يعص الله ورسوله فقد ضل ضلالا مبينا**}[1]. واتە: {بۆ هیچ کەسێک پیاو و ئافرەتێکی باوەڕدار نییە کە ئەگەر ألله و نێردراوەکەی فەرمانێک دەربکەن ئەوا خۆیان لە کارەکەدا سەرپشک و ئازاد بکەن، هەر کەسێکیش سەرپێچیی ألله و نێردراوەکەی بکات ئەوا بەڕاستیی گومڕا بووە بە گومڕاییەکی ڕۆشن}.

هەروەها پەروەردگارمان دەفەرمووێ: {**... فليحذر الذين يخالفون عن أمره أن تصيبهم فتنة أو تصيبهم عذاب أليم**}[2]. واتە: {... جا با ئاگادار بن و بترسن ئەو کەسانەی کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن (واتە پێغەمبەر) کە تووشی فیتنە و بەڵایەک ببن یاخود تووشی سزایەکی بەئێش ببن}.

---

(١) سورەتی الأحزاب، ئایەی ٣٦.

(٢) سورەتی النور، ئایەی ٦٣.

یاخود فەرموویەتی : {... **والله یحکم لا معقب لحکمه** ...}[1]. واتە: {... ألله حوکم دەردەکات و هیچ کەسێکیش ناتوانێت حوکمەکانی پەک بخات یاخود بیگۆڕێ ...}.

ئەی قەومەکەم، لەم ئایاتانە تێدەگەن؟ پەروەردگارمان ئیمانی ئەو کەسانەمان بۆ بەدرۆ دەخاتەوە کە شەریعەتی ألله ڕەت دەکەنەوە و موناقەشە لەسەر حەڕام و حەلالەکان دەکەن، هۆشداریمان پێدەدات کە نەکەین بەرەوڕووی حوکمە شەڕعییەکان بووەستینەوە، ئەگینا سزایەکی ئابڕووبەر لە هەردوو دونیا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. جا ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە باوەڕی بە "بیروڕای زۆرینە" هەیە و پێی وایە ئەگەر زۆرینەی خەڵک لەسەر شتێک ڕێکبکەون ئەوا نابێ قسەیان ڕەت بکرێتەوە؟!

(١) سورەتی الرعد، ئایەی ٤١.

**بابەتی سێیەم: بنچینەکانی دیمۆکڕاسیەت.**

**بنچینەی حەوتەم: مرۆڤەکان یەکسانن.**

بنچینەیەکی تری ئەم شەریعەتە تاغوتە بریتییە لەوەی کە دەڵێن: مرۆڤەکان یەکسانن و هیچ جیاوازییەک لەنێوانیان نییە ئەگەرچی بیروباوەڕ و دینیان جیاواز بێ، هەروەها هەموو ئاین و کتێبە ئاسمانییەکان هاوتای یەکترن و هیچیان لە هیچیان ڕێزدارتر نین، دەبێ هەموویان بە یەک چاو سەیر بکرێن.

**هەروەک لە دەستووری بۆگەنی عیڕاقیی لە ماددەی ١٤ نووسراوە:** عیڕاقییەکان یەکسانن لە بەردەم یاسادا بەبێ جیاوازیی ڕەگەز یان نەژاد یان نەتەوە یان بنەچە یان ڕەنگ یان ئاین یان مەزهەب یان بیروباوەڕ یان بۆچوون یان بارودۆخی ئابووری یان کۆمەڵایەتیی.

کەواتە لەم دەستوورە جاهیلیەتەدا جیاوازیی لەنێوان دوو مرۆڤ نییە ئەگەرچی دوو مرۆڤەکە لەم خاڵانەی خوارەوە جیاواز بن:

ئـ: بەبێ جیاوازیی ڕەگەز.

ب: بەبێ جیاوازیی نەتەوە.

پ: بەبێ جیاوازیی ڕەنگ.

ت: بەبێ جیاوازیی دین.

ج: بەبێ جیاوازیی مەزهەب.

چ: بەبێ جیاوازیی بیروباوەڕ.

ح: بەبێ جیاوازیی بۆچوون (بیروڕا).

ئێستاش بە پێویستی دەزانم هەڵوەستەیەک لەسەر بەشێکی ئەم خاڵانە بکەم و لەسەر بنەمای شەریعەتە قەبوڵکراوەکەی ألله (واتە ئیسلام)، تاکو بزانین ئاخۆ بەڕاستیی مرۆڤەکان لەم خاڵانەی سەرەوەدا یەکسانن یاخود نا!

**ئـ: حوکمی بە یەکسان دانانی مرۆڤەکان لە ڕووی ڕەگەز:**

زۆرجار بیستوومانە دیمۆکڕاسیخوازە تاغوتپەرستەکان چەواشەکاریی دەکەن و دەڵێن ئیسلام جیاوازیی لەنێوان پیاو و ئافرەت دەکات. بەلای ئەم دیمۆکڕاسیخوازانە ئافرەت پیاوە و پیاویش ئافرەتە. واتە هیچ جیاوازییەک لەنێوانیاندا نییە.

بەڵام کاتێک دێین و سەیری واقیع دەکەین لە ڕووی شەرعیی و هەروەها لە ڕووی مێژوویی، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بەدرێژایی هەموو سەردەمەکان پیاو و ئافرەت جیاواز بوونە لە یەکتر، جیاوازییەکەش بە دوو شێوازە:

**شێوازی یەکەم: بناغە و بونیادی پیاو و ئافرەت لە یەکتر جیاوازن:** سەرەتا پێویستە ئەوە وازح بێت کە ئێمەی ئەهلی تەوحید کێشەمان لەوە نییە کە ئافرەت و پیاو دوو بوونەوەری دروستکراوی ألله ن، هەردوو لایەن فەرمانیان پێکراوە ألله بەتەنها بپەرستن، هەردوو لایەن ڕێزیان لێگیراوە، هەردوو لایەن پاداشت و سزایان بۆ دانراوە. ئەمەش لە کتێبەکەی ألله بە ڕوونیی باس کراوە و ئێمەش ئیمانمان بەم ڕاستییە هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا لە نێو کتێبەکەی ألله ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا پیاو و ئافرەت لەڕووی بناغەی دروستبوونیان (بُنية) لە یەکتر جیاوازن، واتە: کۆمەڵێک تایبەتمەندیی لە پیاودا هەیە و لە ئافرەتدا نییە یاخود کەمە، بەپێچەوانەوەش کۆمەڵێک تایبەتمەندیی لە ئافرەتدا هەیە و لە پیاودا نییە یاخود کەمە. لە نموونەی ئەو تایبەتمەندییانەی پیاوان و ئافرەتان لێی جیاوازن:

**لە ڕووی هێزەوە:** کاتێک سەیری قورئانی پیرۆز دەکەین، هەروەها کاتێک سەیری کتێبە مێژووییەکان دەکەین، بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کەوا پیاو و ئافرەت لە ڕووی هێزەوە بناغەیان جیاوازە، هەر بۆیەش لەو کارانەی کە هێز و ماندووبوونێکی زۆری پێویستە هەمیشە پیاوان تێیدا ناسراون و ئەنجامی دەدەن لە سەرانسەری جیهان، وەکو جەنگ کردن و ئەنجامدانی پیشە و کارە قورسەکان لەپێناوی پەیداکردنی بژێوی ژیان، هەروەها بەڕێوەبردنی ئەرکە هەستیارەکانی دەوڵەت و سیاسەت کردن.

هەر بۆیەش ألله –تبارك وتعالى– باسی حاڵی جولەکەکانمان بۆ دەکات و دەڵێت: {... **بعثنا عليكم عبادا لنآ أولي بأس شديد** ...}[1]. واتە: {... عەبدەکانمان ناردە سەرتان کەوا زۆر تۆڵەسێن و توند و تۆکمە بوون ...}. جا بێگومان ئەو عەبدانەی ألله کەوا باسکراون پیاون؛ چونکە جیهاد کردن ئەرکی پیاوانی موسڵمانە. کەواتە ألله سیفەتی "هێز" و "توندیی" دایە پاڵ ڕەگەزی نێر.

سەبارەت بە ڕەگەزی مێ، بێگومان ألله –تبارك وتعالى– پێمان دەفەرموویێت کەوا ئەم ڕەگەزەی بە لاوازتر دروست کردووە، هەروەک دەفەرموێت: {**ووصينا الإنسان بوالديه حملته أمه وهنا على وهن** ...}[2]. واتە: {وەسیەت و فەرمانمان بە مرۆڤ کردووە کەوا ڕێزی دایک و باوکی بگرێت، –هەروەک چۆن– دایکەکە مرۆڤەکەی هەڵگرتووە لە سکیدا بە لاوازیی و لەسەر لاوازیی ...}.

هەروەک ئیمام طبري –رحمه الله– لە تەفسیری بڕگەی "وهنا على وهن" لە ئایەتەکەدا دەفەرموێت واتە: ضعفا على ضعف[3]. کەواتە ئافرەت لە بنەڕەت و بناغە لاوازە، ئینجا بەهۆی هەڵگرتنی مناڵەکەی لە سکیدا لاوازتر دەبێت.

---

(١) سورەتی الإسراء، ئایەی ٥.

(٢) سورەتی لقمان، ئایەی ١٤.

(٣) تەفسیری طبري –رحمه الله– بۆ سورەتی لقمان، ئایەی ١٤.

**لە ڕووی سکپڕیی و منداڵ بوون (حَمل):** یەکێکی تر لەو تایبەتمەندییانەی کە ئافرەت لە پیاو جیا دەکاتەوە بریتییە لە سکپڕیی و منداڵ بوون، ألله ئەمەی کردووەتە تایبەتمەندیی ئافرەت، هەروەک فەرمووی: {**ووصينا الإنسان بوالديه حملته أمه ...**}[1]. واتە: {وەسیەت و فەرمانمان بە مرۆڤ کردووە کەوا ڕێزی دایک و باوکی بگرێت، –هەروەک چۆن– دایکەکە مرۆڤەکەی هەڵگرتووە لە سکیدا ...}.

کەواتە ئەم تایبەتمەندییەش یەکێکە لە جیاوازییەکانی پیاو و ئافرەت کە دەیسەلمێنێ پیاو و ئافرەت لە ڕووی بناغە و بونیادی دروست بوونیان جیاوازیان هەیە و یەکسان نین.

**لە ڕووی بەڕێوەبردنی ماڵ و پەروەردە کردنی منداڵ:** ئەمەش جیاکەرەوەیەکی ترە لەنێوان ڕەگەزی پیاو و ئافرەت، کە بریتییە لە بەڕێوەبردنی ماڵ و منداڵ، ئەمەش ئەرکێکە کە بۆ ئافرەت زۆر ئاسانترە بەڵام بۆ پیاو زۆر قورسترە، بەپێچەوانەی سیاسەت و کاری قورس و جەنگ و هتد.. کە پیاو تێیاندا بەهێزە و ئافرەتیش لاوازە، لەم ئەرکەدا ئافرەت بەهێزە و پیاو لاوازترە.

هەر بۆیەش ألله –عز وجل– ئەرکی پەروەردە کردنی منداڵی خستووەتە سەر شانی ئافرەت، وەک فەرموویەتی: {**والوالدات يرضعن أولادهن حولين كاملين ...**}[2]. واتە: {دایکان پێویستە شیر بدەنە منداڵەکانیان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو ...}.

هەروەک بینیمان، ألله ئەرکی بەخێرکردن و "رضاعة" ی بۆ ئافرەت تەرخان کرد؛ چونکە ألله خۆی دروستکاری پیاو و ئافرەتە و دەزانێت ئەرکی بەخێو کردنی منداڵ بۆ ئافرەت ئاسانترە و بۆ پیاویش قورسترە. بەڵام بێگومان ألله –سبحانه وتعالى– لە بابەتی بەخێوکردنی منداڵیش ئەرکی پیاوی دیاریکردووە کە بریتییە لە دەستەبەر کردنی پێداویستییەکانی بەخێوکردن بۆ ئافرەتەکەی، هەروەها دەبێ لەلای ئافرەتە بێت

(١) سورەتی لقمان، ئایەی ١٤.
(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٣٣.

و ئەرکی بۆ ئاسان بکات، وەک لە هەمان ئایەت ألله فەرمووی: {**... وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف ...**}[1]. واتە: {... وە لەسەر خاوەنی منداڵەکەیە (واتە باوکەکە) کەوا ڕزق و کاڵای ئافرەتەکان بە شێوازێکی باش دەستەبەر بکات ...}.

**لە ڕووی سووڕە جەستەییەکان:** ئەویش بریتییە لەو بارودۆخە تایبەتانەی کە تووشی ڕەگەزی مێ دەبن لەدوای باڵغ بوونەوە و لە پیاواندا نین، وەکو سووڕی مانگانە. ئەمەش جیاوازییەکی تری نێوان پیاو و ئافرەتە لە ڕووی بناغەی دروست بوونیان.

**لە ڕووی جوانیی و خۆڕازاندنەوە:** ئەمەش جیاوازییەکی تری بنچینەییە لەنێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ. ئەگەرچی ألله هەموو دروستکراوەکانی بە ڕێکیی دروست کردووە، بەڵام تایبەتمەندییەکی زۆرتری داوەتە ئافرەت ئەویش "جوانی" یە. ئەم تایبەتمەندییە لە قورئاندا ئاماژەی پێکراوە وەکو سیفەتێکی ئافرەت بەڵام بۆ پیاوان هیچ قسەی لەسەر نەکراوە بۆیەش دەیسەلمێنێ لە ڕووی جوانییەوە ئافرەت جوانییەکەی زیادترە.

هەروەک ألله –سبحانه وتعالى– لەم دوو ئایەتەدا دەفەرموێت: {**قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون * قل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن ولا يبدين زينتهن إلا ما ظهر منها ...**}[2]. واتە: {–ئەی محمد– بە پیاوانی باوەڕدار بڵێ چاویان بپارێزن (لە سەیرکردنی حەڕام و نامەحڕەم) و داوێنیان بپارێزن، ئەمە باشترە بۆیان، بەڕاستیی ألله ئاگادارە بەوەی کە ئەوان دەیکەن * –ئەی محمد– بە ئافرەتانی باوەڕدار بڵێ چاویان بپارێزن (لە سەیرکردنی حەڕام و نامەحڕەم) و داوێنیان بپارێزن و هەروەها جوانییەکەیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دەرکەوتووە ...}.

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٣٣.

(٢) سورەتی النور، ئایەی ٣٠ و ٣١.

لە ئایەتی یەکەمدا دەرکەوت پیاو پێویستە دوو شتی خۆی بپارێزێت: (چاوەکان) و (داوێن) ی. بەڵام لە ئایەتی دووەمدا دەرکەوت ئافرەت پێویستە سێ شتی خۆی بپارێزێت: (چاوەکان) و (داوێن) و (جوانییەکەی). ئەمەش دەیسەلمێنێ ئەم تایبەتمەندییە لە ئافرەتدا زاڵترە و دەبێ زۆرتر هەوڵی داپۆشینی بدات.

هەروەها ئافرەت هەر بە سروشتی خۆی زۆرتر بایەخ بە جوانییەکەی دەدات و خەریکی ڕازاندنەوەی ڕووخسار و جەستە و سیمایەتی، ئەم تایبەتمەندییەش جیای دەکاتەوە لە ڕەگەزی نێر؛ چونکە ڕەگەزی نێر بەم ئاستەی ئافرەتان خەریکی خۆڕازاندنەوە نین.

**شێوازی دووەم: پیاو و ئافرەت لە ئەحکامەکانی شەریعەتی ألله دا لەیەکتر جیاوازن:**
لە شێوازی یەکەمدا ئەوەمان ڕوون کردەوە کە هەر خودی ڕەگەزی نێر و مێ جیاوازن لە ڕووی بناغەی دروست بوونیان و تایبەتمەندییەکانیان. لەم شێوازەشدا ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە چۆن ألله –سبحانە وتعالی– لە دینە قەبوڵکراوەکەی خۆیدا (واتە ئیسلام) ئەم دوو ڕەگەزەی لە یەکتر جیاکردووەتەوە لە هەندێک ئەحکامی شەرعیی. ئەمەش لە چەند ڕووێکەوە:

**لە ڕووی کارکردن و پەیداکردنی بژێوی ژیان:** لە شەریعەتی ئیسلامدا ألله فەرمانی کردووە بەوەی ڕەگەزی نێر ئەرکی بەخێوکردن و پەیداکردنی بژێوی ژیان بگرێتە ئەستۆ، ئافرەتیش ئەرکی بەڕێوەبەردنی ماڵ و منداڵەکانی لەسەر شانە. هەروەک ألله فەرموویەتی: {**الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض وبما أنفقوا من أموالهم ...**}[1]. واتە: {پیاوان سەرکردە و بەهێز و بەڕێوەبەرن بەسەر ئافرەتان بەوەی کە ألله فەزڵ و پلەوپایەی هەندێکیانی داوەتە سەر هەندێکیان، هەروەها بەوەی کە پیاوان ئەرک و نەفەقەیان دەکێشن بە پارەکانیان ...}.

---

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٣٤.

ئەمەش ئەوپەڕی دادوەریی و بەزەیی و حیکمەتی لێوە بەدی دەکرێت؛ چونکە گومان لەوە نییە ڕەگەزی نێر هێز و توانای ئەنجامدانی ئەرکە قورسەکانی پێدراوە و دەتوانێت ئەنجامیان بدات بەڵام ڕەگەزی مێ ناتوانێت هەمان ئەم ئەرکە قورس و سەختانە بکات. بەڵکو ألله ئاسانکاریی بۆ ڕەگەزی مێ کردووە و ئەرکێکی ئاسانی پێی بەخشیوە ئەویش بریتییە لە بەڕێوەبردنی ماڵ و منداڵەکان. ئەمەش ئەرکێکە کە لەگەڵ هێز و توانا و بونیادی جەستەی ئافرەت گونجاوە. خۆ ئەگەر ئەرکی کارکردن و بژێوی ژیان بە ئافرەت ڕاسپاردرابووایە سەرەڕای لاوازییە سروشتییەکەی، هەروەها ئەرکی بەخێوکردنی ماڵ و منداڵیش بە پیاو ڕاسپاردرابووایە سەرەڕای بەهێزییە سروشتییەکەی، ئەوا کێشە و ئاڵۆزییەکی گەورە پەیدا دەبوو.

جا دێمۆکڕاسیخوازە بەدڕەوشتەکان زۆرجار دەڵێن ئەمە زوڵمە و پێویستە ئافرەتیش کار بکات! جا ئێمە لە وەڵامدا دەڵێین: خۆ ئەگەر لە شەریعەتی ئیسلامدا ألله بیگوتایە با پیاوان ئیسراحەت بکەن و لە ماڵەوە بمێننەوە و ئافرەتانیش بڕۆنە دەرەوە و کار بکەن. ئەوا بێگومان ئەوکاتیش دووبارە دەمدرێژییان دەکرد و دەیانگووت ئەمە زوڵمە و چۆن دەبێت ئافرەت کاری دەرەوە بکات و ئافرەت لاوازە و نابێ لە دەرەوە کار بکات!

دەبینن ئەی قەومەکەم؟ دێمۆکڕاسیخوازەکان تەنها چەواشەکارن، ئەسڵەن باوەڕیان بەر گوفتار و ڕەخنەکانی خۆیشیان نییە، کەس پێیان هەڵناخەڵەتێ جگە لە خەڵەفاوێکی بەستەزمانی دوور لە دین.

**دەی ئەگەر ڕاست دەکەن دێمۆکڕاسیخوازەکان فەرموون ئافرەتەکانی خۆتان بنێرن بۆ کرێکاریی و هەڵگرتنی بلۆک و پاڵدانی عەرەبانە و فیتەریی! فەرموون ئافرەتەکانتان بنێرن تاکو لە دەرەوە کاری ئاسنگەریی و دارتاشیی بکەن یاخود غاز بفرۆشن!**

ئەی قەومەکەم، دەزانن دێمۆکڕاسیخوازەکان حەز دەکەن ئافرەت چ کارێک بکات؟! حەز دەکەن ببێتە "سکرتێر" لای پیاوێکی خاوەن کۆمپانیا! یاخود جلێکی

نیمچە ڕووت بپۆشێت و بیهێننە سەر کاناڵێک و ببێتە "پێشکەشکاری بەرنامە" و قسەی زل بکات و سەرنجی گەنجان بۆخۆی ڕاکێشێ و نەزەری بکەن! یاخود دەمدرێژیی بەرامبەر ألله و نێردراوەکەی و شەریعەتەکەی بکات. یاخود دەیانەوێت ئافرەتان بنێرنە هۆڵەکانی لەشجوانیی و مەلەوانگەکان!

ئەی قەومی من، ئایا کەسێک لە دیمۆکڕاسیخوازەکانتان بینیوە کەوا دایکی یاخود ژنەکەی یاخود کچەکەی یاخود خوشکەکەی یەکێک لەم کارانەی سەرەوە بکات؟! نەخێر، بەڵکو ئەم دیمۆکڕاسیخوازانە تەنانەت لەگەڵ بانگەوازە بریقەدارەکەی خۆیشیان ڕاستگۆ نین، تەنها دەیانەوێت ئافرەتان لە ماڵەکانیان بهێننە دەرەوە و دایانبڕێنن لە خزمەتکردنی منداڵەکانیان، تەنها بۆ ئەوەی جوانییەکانیان ببینن و شەهوەتی دڵە ڕەشەکانیان دامرکێننەوە، ئێمەی ئەهلی تەوحید چاک دەیانناسین.

**لە ڕووی میرات (میراث):** ئەم خاڵەش لەلایەن دیمۆکڕاسیخوازە تاغوتپەرستەکان زۆرجار دەورووژێندرێت بۆ ئەوەی دڵی ئافرەتان بۆخۆیان کێش بکەن. بیستوومانە کە دەڵێن: چۆن دەبێت لە میراتگریدا پیاو دوو هێندەی ئافرەت وەرگرێ!

با بزانین حەقیقەتی بابەتی میرات چییە لە شەریعەتی ألله.

بێگومان دیمۆکڕاسیخوازەکان زۆر درۆزن و فێڵبازن، لەم خاڵەشدا ڕاست ناکەن؛ چونکە ألله –تبارك وتعالى–ئەحکامی میراتی جۆراوجۆر کردووە بەپێی حاڵەتەکان، با بزانین چۆن:

حاڵەتی یەکەم: لەم حاڵەتەدا پیاو دوو هێندەی ئافرەتەکە وەردەگرێت، هەروەک فەرمووی: **{يوصيكم الله في أولادكم للذكر مثل حظ الأنثيين ...}**[(١)]. واتە: {ألله وەسیەتتان بۆ دەکات سەبارەت بە منداڵەکانتان (لەکاتی میرات) بەوەی کە بۆ ڕەگەزی نێر بەقەد دوو ڕەگەزی مێ بێت ...}.

(١) سورەتی النساء، ئایەی ١١.

حاڵەتی دووەم: لە حاڵەتێکی تر ألله پێمان ڕادەگەیەنێت کە ئەگەر پیاو یاخود ئافرەتە مردووەکە دایک و باوکی نەبوو و تەنها خوشک و برای هەبوو، ئەوا لەم حاڵەتەدا خوشک و براکە بەیەکسانیی میراتیان بەردەکەوێت! هەروەک فەرموویەتی: **{... وإن كان رجلٌ يورث كَلالةً أو امرأة وَلَهُ أخ وأخت فلكل واحد منهما السدس فإن كانوا أكثر من ذلك فَهُم شركاء في الثلث ...}**[1]. واتە: {... ئەگەریش میراتگرەکانی مردووەکە (جا پیاو بووبێ یان ئافرەت) کەسانێکی تر بوون جگە لە دایک و باوک و منداڵ، لە هەمان کاتیشدا مردووەکە برایەک و خوشکێکی هەبووبێ ئەوا بۆ هەر یەکێک لە برا و خوشکەکە ڕێژەی یەک لەسەر شەشیان بەردەکەوێ، ئەگەریش زیادتر بوون لە برا و خوشکێک ئەوا هاوبەشن لە وەرگرتنی یەک لەسەر سێ ...}. کەواتە لەم حاڵەتەدا پیاو و ئافرەت یەکسان بوون لە میرات! ئەی بۆچی دێمۆکڕاسیخوازە فێڵبازەکان قسەیەک لەسەر ئەم خاڵە ناکەن؟!

حاڵەتی سێیەم: لە حاڵەتێکی تردا ئافرەت لە پیاو زۆرتری بەردەکەوێت! بەتایبەت ئەگەر مردووەکە هیچ منداڵی نەبوو و تەنها دایک و باوکی مابوون، ئەوا سێ بەشی میراتەکە بۆ دایکەکەیە. هەروەک ألله فەرموویەتی: {... **فإن لم يكن له ولد وَوَرِثَهُ أبواهُ فلأمه الثلث ...}**[2]. واتە: {... ئەگەریش مردووەکە هیچ منداڵی نەبوو و دایک و باوکی میراتگر بوون، ئەوا یەک لەسەر سێی بۆ ئافرەتەکەیە ...}. ئەی قەومەکەم تۆ بڵێی بۆچی دێمۆکڕاسیخوازەکان قسە لەسەر ئەم ئایاتانە نەکەن؟!

بێگومان جیاوازیی تریش زۆرن لەنێوان ئێمە و دێمۆکڕاسیخوازەکان لە ڕووی بابەتی ڕەگەز، بانگەشەکانی ئەوان تەنها قسەی بریقەدارە و زیانی بۆ تاک و خێزان و کۆمەڵگە هەیە، بەڵام یاساکانی ألله پڕیەتی لە بەرژەوەندیی بۆ هەردوو ڕەگەزەکە، بەداخەوە لەم کتێبەدا ناتوانم وەڵامی تێکڕای چەواشەکارییەکانیان بنووسم؛ چونکە بابەتەکەمان لەسەر شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوتە.

---

(١) سوڕەتی النساء، ئایەی ١٢.

(٢) سوڕەتی النساء، ئایەی ١١.

**ب: حوكمی بە یەكسان دانانی مرۆڤەكان لە ڕووی بیروباوەڕ:**

ئەگەرچی بە درێژیی وەڵامی ئەم چەواشەكارییەمان دایەوە لە لاپەڕی ٣٩ تا ٤٧، بەڵام لێرەش تۆزێكی تر قسەی لەسەر دەكەین، با بزانین ئایا مرۆڤێک كە پەروەدگاری گەردوون دەناسێت و بە تاک و تەنهایی ألله دەپەرستێت هاوتایە لەگەڵ مرۆڤێكی تر كەوا ألله ناناسێت و شەریكی بۆ بڕیارداوە؟!

بێگومان لە دەستووره بۆگەنەكەی عیراق و لە بیروباوەڕی دیمۆكراسیخوازەكاندا بەڵێ یەكسانن، كەچی لە شەریعەتی ألله دا ئەم مرۆڤە موشریكانە پلەیان لە ئاژەڵ نزمترە. ڕاستە نەوەكانی ئادەم ڕێزیان لێگیراوە و مەلائیكە سوجدەی ڕێزیان بۆیان بردووە، بەڵام هەر كاتێک نەوەكانی ئادەم بەو ئەركە هەڵنەستان كەوا ألله لە پێناویدا دروستیكردوون، ئەوا بێگومان پلەیان زۆر نزمتر دەبێت لە ماڵات[1]؛ چونكە ماڵات هۆشمەندیی و عەقڵی پێ نەدراوە بۆیەش لێی ناگیرێت، هەروەها تایبەتمەندییەكی ئاژەڵ ئەوەیە كە گوێڕایەڵی خاوەنەكەیەتی، بەڵام ئەمانە عەقڵیان پێدراوە و دەتوانن حەق و ناحەق جیابكەنەوە، بەڵام ناحەق هەڵدەبژێرن و هەرگیز گوێڕایەڵی ألله نین، جا ئایا ئەمانە لە ئاژەڵیش نزمتر نین؟! ألله لە بارەیانەوە فەرموویەتی: {... **لهم قلوب لا يفقهون بها ولهم أعين لا يبصرون بها ولهم ءاذان لا يسمعون بها أولئك كالأنعام بن هم أضل ...**}[2]. واتە: {... ئەوان (واتە كافران) دڵیان هەیە بەڵام بەهۆیەوە بیرناكەنەوە لە حەق، هەروەها چاویان هەیە بەڵام بەهۆیەوە سەیری حەق ناكەن، هەروەها گوێیان هەیە بەڵام بەهۆیەوە گوێبیستی حەق نابن، ئەوانە وەكو ئاژەڵانن بەڵكو گومڕاتریشن ...}.

ألله پێمان دەفەرمووێت موسڵمان و كافر یەكسان نین، كەچی دیمۆكراسیخوازە تاغوتپەرستەكان دەڵێن نەخێر یەكسانن! لەڕاستیدا یەكسان نین، نە لە ئەحكامی دونیا

(١) ماڵات: ئەو ئاژەڵانەن كە ڕادەگیرێن، وەكو: مەڕ، حوشتر، مانگا، بزن و هتد...
(٢) سورەتی الأعراف، ئایەی ١٧٩.

یەکسانن لەلای ألله، نە لە ناو گۆڕیش یەکسانن، نە لە ڕۆژی قیامەتیش یەکسانن، نە لە شوێنە هەمیشەییەکەیان یەکسانن (واتە بەهەشت و ئاگر). ئەی قەومەکەم، ئیتر بۆچی پشت لە شەریعەت و گوفتارەکانی پەروەردگارمان بکەین و ڕوومان لە کەسانێکی دونیاپەرستی دیمۆکڕاسیخواز بێت؟!

**ج: حوکمی بە یەکسان دانانی مرۆڤەکان لە ڕووی مەزهەب:**

ئەمەش خاڵێکی ترە کە لەلای دیمۆکڕاسیخوازەکان جێگەی بایەخە و لە دەستوورە جاهیلیەتەکەی عیراقدا نووسراوە مرۆڤەکان یەکسانن بەبێ جیاوازیی مەزهەبەکانیان. مەبەستیان ئەوەیە کە موسڵمانێکی موەحید یەکسانە لەگەڵ "شیعە" و "سۆفی" و "ئیخوانی"! ئەمەش بە درێژتر لە لاپەڕی ٨٠ تا ٨٦ باسکراوە، لێرەش بە کورتیی باسم کردووە.

جا ئایا ئەهلی تەوحید یەکسانن لەگەڵ ئەمانە؟ نەخێر، چونکە:

١- موسڵمانێکی موەحید یەکسان نییە لەگەڵ "شیعە"؛ چونکە موسڵمانەکە تەنها ألله دەپەرستێت و خۆشەویستیی بۆ تێکڕای هاوەڵەکانی پێغەمبەر هەیە، بەڵام شیعە موشریکەکە بەتەنها ألله ناپەرستێ بەڵکو (علي) و (حسين) یش دەپەرستێت و هانای بۆ دەبات، هەروەها تەنها چەند دانەیەک لە هاوەڵانی پێغەمبەریان بەلاوە موسڵمانە، ئەوانی تریش بە کافر دەزانن، بەتایبەتیش (عمر) و (عائشة) و (أبي بكر) بە لایانەوە کافرن و شوێنیان دۆزەخە. کەی ئەم موشریکە پیسانە یەکسانن لەگەڵ موسڵمانێک کە تەوحیدی هەیە؟ کەچی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا یەکسانن.

٢- موسڵمانێکی موەحید یەکسان نییە لەگەڵ "سۆفی"؛ چونکە موسڵمانەکە خۆشەویستی بۆ زانایان هەیە و لەسەر سوننەت دینداریی دەکات، بەڵام هەرگیز زانایان بە پیرۆز نازانێ و هاوار ناکاتە گۆڕەکانیان. بەڵام سۆفیە گۆڕپەرستەکان زیادەڕەویی لە خۆشەویستیی هەندێک لە زاناکانیان دەکەن و دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە، هەروەها زۆرینەی کردەوەکانیان بیدعەیە و دژی سوننەتەکانن، هەروەها

ئەهلی تەوحید بە کافر دەزانن! کەچی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا ئەم دووانە یەکسانن.

٣- موسڵمانێکی موەحید یەکسان نییە لەگەڵ "ئیخوانی"؛ چونکە موسڵمانەکە باوەڕی بە هیچ شەریعەتێکی تاغوت نییە، تەنها باوەڕی بە شەریعەتی أللە هەیە، هەروەها موسڵمانەکە باوەڕی بە پارچەگەرێتی نییە بەڵکو دەیەوێت موسڵمانان کۆببنەوە و بەیعەت بە ئیمامێک بدەن بەبێ سەرپەرشتی و مۆڵەتی کافران. بەڵام ئیخوانییەکان نەک هەر باوەڕیان بە دیمۆکڕاسیەتە، بەڵکو تەنانەت یەکێک لە سەرانیان دەڵێت: ئێمە لەپێناوی دیمۆکڕاسیەت کوشتار دەکەین!. هەروەها ئەڕدۆگانی تاغوت و ئیخوانیی دەڵێت: ئێمە بە دیمۆکڕاسیەت و عەلمانیەت گەیشتووینەتە ئەمڕۆ! هەروەها باوەڕیان بە مومارەسەی دیمۆکڕاسیەت هەیە، هەروەها گاور و جولەکە و شیعە بە برای خۆیان دەزانن. جا چۆن ئەم تاغوتپەرستانە لەگەڵ موسڵمانێکی موەحید هاوتا دەکرێن؟

بێگومان لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا هەموو ڕەگەز و دین و مەزهەبەکان یەکسانن؛ چونکە ئەوان ئەسڵەن دان نانێن بە بوونی پەروەردگارێک بۆ ئەم گەردوونە! لە عەقڵیەتی دیمۆکڕاسییەکاندا ئەم ژیانە سودفە و فەوزایە، هیچ دروستکارێکیشی نییە! بۆیەش بەلایانەوە مرۆڤەکان هەموویان یەکسانن سەرەڕای بیروباوەڕە جۆراوجۆرەکانیان، هەروەها تێکڕای دینەکان و کتێبەکان بە یەکسان دەزانن.

**لە وەڵامدا ئێمەی موسڵمانان و ئەهلی تەوحید دەڵێین:** هەرگیز عەقڵی مرۆڤ قەبوڵی ئەوە ناکات ئەم گەردوونە بەبێ دروستکارێک دروست بووبێت، یاخود بەبێ ئامانج دروست بووبێت، منی نووسەر کاتێک سەیری دەوروپشتم دەکەم هیچ شتێک نابینم کە بەبێ هۆکار و بە سودفە دروست بووبێت، بەڵکو هەر یەک لەو شتانەی لە دەوروپشتمن لەپێناوی ئامانجی تایبەت دروست کراون. جا ئەگەر مێزێک و کورسییەک و دیوارێک دروستکاریان هەبێت و لەپێناوی ئامانجێک دروستکرابن، ئیتر چۆن مرۆڤ بەم هەموو توانا و عەقڵە بەهێزەی کە هەیەتی بەبێ هۆکار و بەبێ ئامانج پەیدابووە؟!

نەخێر، بەڵکو ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە پەروەردگارێک ئێمەی دروست کردووە و بەردەوامیمان پێدەدات، هەروەها ئەو پەروەردگارە دەستوور و ڕێسای بۆمان داناوە تاکو پەیڕەوی بکەین و لێی لانەدەین. ئەمەش لەلاپەڕەی ٣٨ بەدواوە ڕوون کراوەتەوە لە ڕووانگەی شەریعەتی ألله.

بێگومان لە شەریعەتی ألله دا مرۆڤەکان هەموویان لە مرۆڤێتی یەکسانن و ئەمە شتێکی وازحە، هەروەها مرۆڤ لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی ڕێز لێگیراوە، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**ولقد كرمنا بني ءادم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات فضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا**}[١]. واتە: {بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە نەوەکانی ئادەم گرتووە و هەڵمانگرتوون لە وشکانی و دەریادا و هەروەها ڕۆزییە پاکەکانمان پێداون و پلەوپایەمان بەرزتر کردوونە لەسەر زۆرێک لەوانەی دروستمان کردوون}.

بەڵام لەپاش ئەوەی ألله –سبحانه وتعالى– مرۆڤی دروستکرد و ڕێزی لێگرت، ئیتر ئیبلیس بە ئاشکرا ڕایگەیاند هەرگیز دەستبەرداری مرۆڤەکان نابێت تاکو گومڕایان نەکات، وەک ألله دەفەرمووێ: {**قال ربي بما أغويتني لأزين لهم في الأرض ولأغوينهم أجمعين**}[٢]. واتە: {–ئیبلیس گووتی:– ئەی پەروەردگارم، لەبەر ئەوەی تۆ منت گومڕا کرد ئەوا منیش جوانیی و خۆشییەکانیان بۆ دەڕازێنمەوە لەسەر زەوی و هەموویان گومڕا دەکەم}.

هەر بۆیەش شەیتان توانی لە سەردەمی قەومەکەی نوحەوە خەڵک بەرەو شیرک هان بدات، لەوکاتەوە مرۆڤەکان بەسەر چەندین بیروباوەڕ و دینی پووچەڵ دابەش بوونە و هەموویان غەیری ألله دەپەرستن. پەرستن بە هەموو جۆرەکانیەوە، نەک تەنها نوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن بۆ غەیری ألله.

---

(١) سورەتی الإسراء، ئایەی ٧٠.

(٢) سورەتی الحجر، ئایەی ٣٩.

مادام ئیتر مرۆڤەکان پەرتەوازە بوون و لە تەوحیدی ألله لایاندا، ئیتر بێگومان پلەوپایەشیان یەکسان نابێت و هەندێکیان لە هەندێکیان پایەدارترن. هەروەها هەندێکیشیان پلەیان لە ئاژەڵیش نزمترە، ئەمەش لە لاپەڕی ٧٢ و ٧٣ باسکرا.

ألله لە چەند ئایەتێکدا باسی باوەڕداران و موشریکەکان دەکات، دواتریش دەفەرموێت: **{مثل الفريقين كالأعمى والأصم والبصير والسميع هل يستويان مثلا أفلا تذكرون}**(١). واتە: {نموونەی ئەو دوو کۆمەڵەیە وەکو کوێر و نابیستە لەگەڵ چاوساغ و بیسەر، جا ئایا ئەم دووانە وەک یەکن؟! ئەوە ئێوە یاد ناکەنەوە؟!}.

هەروەها دەفەرموێت: **{أفنجعل المسلمين كالمجرمين}**(٢). واتە: {ئایا موسڵمانان و ستەمکارەکان وەکو یەکتر لێبکەین؟!}. کەچی دیمۆکڕاسیخوازە پیسەکان دەڵێن بەڵێ موسڵمان و موجریم هاوتان!

هەروەها ألله دەفەرمووێ: **{أم نجعل الذين ءامنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين في الأرض أم نجعل المتقين كالفجار}**(٣). واتە: {ئایا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکان دەکەن یەکسانیان بکەین لەگەڵ ئەوانەی کە فەساد و خراپەکاریی دەکەن لەسەر زەوی؟ یاخود ئەو کەسانەی لەخواترس و پارێزکارن یەکسانیان بکەین لەگەڵ تاوانکاران؟}.

ألله لە کتێبەکەیدا جیاوازیی لەنێوان مرۆڤەکان دەکات و پێمان دەفەرموێت کەوا شوێنی باوەڕداران و ئەهلی تەوحید بەهەشتە و هەمیشەش لێیان ڕازییە، هەروەها شوێنی ئەو کافرانەش دۆزەخە کە شەریعەتی ئیسلامیان ڕەتکردووەتەوە. هەروەک دەفەرمووێ: **{وعد الله المؤمنين والمؤمنات جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين**

(١) سورەتی هود، ئایەی ٢٤.
(٢) سورەتی القلم، ئایەی ٣٥.
(٣) سورەتی ص، ئایەی ٢٨.

**فيها ومساكن طيبة في جنات عدن ورضوان من الله أكبر ذلك هو الفوز العظيم}**[١]. واتە: {أللە بەڵێنی بە باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت داوە کە دەیانخاتە ناو باخاتێک کە لەژێریدا ڕووبارەکان تێپەڕ دەبن و بە نەمریی لەناویدا دەمێننەوە و هەروەها بەڵێنی خانووی چاکی پێداون لەناو باخچە و بەهەشتە هەمیشەییەکان. هەروەها ڕەزامەندیی أللە –لە هەموویان– گەورەترە، ئا ئەمەیە سەرکەوتنی گەورە}. هەروەها أللە دەفەرمووێ: **{إن الذين كفروا بئاياتنا سوف نصليهم نارا...}**[٢]. واتە: {ئەوانەی کە کوفریان بە ئایاتەکانمان کرد ئەوا دەیانگەیەنین بە ئاگر ...}.

ئەی قەومەکەم، هەرگیز مرۆڤی باوەڕدار لەگەڵ مرۆڤی موشریک یەکسان نین لەڕووی پلەوپایە و ئەحکامەکان، بەڵکو مرۆڤە باوەڕدارەکان ڕێزیان لێگیراوە و مرۆڤە موشریکەکانیش هەمیشە لە کتێبەکەی أللە ترسێندراون و هەڕەشەیان لێکراوە و وەکو کەسانێکی نەزان و گومڕا و دۆڕاو باسکراون؛ تاکو دڵیان بەخەبەر بێتەوە و ئیمان بهێنن و لە هەردوو دونیادا سەربەرز بن.

کەچی دێمۆکراسیخوازە تاغوتپەرستەکان ژینگەیەک دروست دەکەن، بەجۆرێک کە نەک جیاوازیی لەنێوان موسڵمان و موشریک ناکەن، بەڵکو ئەسڵەن جیاوازیی لەنێوان شەریعەتی أللە (واتە ئیسلام) ناکەن لەگەڵ شەریعەت و دینە پووچەڵەکانی تر! بەمەش جیل لەدوای جیل پەیدا دەبن و هەست بە هیچ جیاوازییەک ناکەن لە نێوان موسڵمان و ناموسڵمان، جیاوازیی ناکەن لە نێوان حەق و ناحەق.

هەر بۆیەش دەسەڵاتدارە تاغوتپەرستەکان بە ئاشکرا دەڵێن "برا مەسیحییەکان"، هەروەها "برا ئێزدییەکان"، هەروەها "برا کاکەیی و زەردەشتییەکان" و هتد...، دەبینین بۆ هەر یەکێک لەم دینە پووچەڵانە پشووی ڕەسمیان داناوە و زۆر ڕێزیان لێدەگرن و دەیانپارێزن و ڕێگایان بۆ خۆشدەکەن تاکو لەسەر شیرکەکانیان بەردەوام بن.

---

(١) سورەتی التوبة، ئایەی ٧٢.

(٢) سورەتی النساء، ئایەی ٥٦.

ئەمەش ڕێگا خۆشکەرە تاکو پەیڕەوانی دینە پووچەڵەکان هیچ هەست بە گومڕایی و شیرکی خۆیان نەکەن؛ چونکە دەبینن کەوا ئەوان لەگەڵ موسڵمانەکان جیاوازییان پێ ناکرێت لەلایەن حوکومەتە تاغوتپەرستەکان. هەروەک چۆن لە خاکی باشووری کوردستاندا هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان موسڵمانێکی موەحید لەگەڵ ئێزدیەکی شەیتانپەرست!، هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان جەژنی ڕەمەزانی موسڵمانان لەگەڵ جەژنی سەری ساڵی گاورەکان! هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان کتێبەکەی ألله (قورئان) لەگەڵ ئاڤێستای زەردەشتییەکان.

## بابەتی چوارەم: دروشمەکانی دیمۆکراسیەت.

### دروشمی یەکەم: ئازادیی پارچەگەرێتیی و دامەزراندنی حیزب.

شەریعەتی دیمۆکراسیەت کۆمەڵێک دروشم و پرۆسەی هەیە کە هەر کەسێک پەیڕەوی بکات و مومارەسەی یەکێک لەو دروشمانە بکات ئەوا مومارەسەی دیمۆکراسیەتی تاغوتی کردووە.

لەم شەریعەتە تاغوتیەدا دەرگا کراوەیە بۆ هەر کەسێک کەوا جەماعەتێکی تایبەت دروست بکات لەسەر بنەمای بیرکردنەوە و بیروڕایەکی تایبەت لەدوای ئەوەی دامەزرێنەرەکانی حیزبەکە ڕازی بوون بە دەستووری خاکەکە، جا ئیتر ئەو حیزبە بانگەشەی بیروباوەڕەکەی خۆی دەکات و بەشێکی قەومەکە پێی سەرسام دەبن و بەدەمیەوە دەچن، کەواتە لێرەدا قەومەکە بوونەتە دوو بەش. ئیتر حیزبێکی تریش دروست دەبێت و تۆزێک جیاوازە لە حیزبەکانی تر، ئیتر بەشێکی تری قەومەکە بۆ لای ئەو حیزبە نوێیەش دەچن، بەمەش قەومەکە دەبنە سێ پارچە. ئیتر هێواش هێواش هەرچەند حیزب دروست بێت ئەوا زۆرتر قەومەکە پارچە پارچە دەبن و هەر یەکێکیشیان خۆیان بە فریاڕەسی قەومەکەیان دەزانن لەکاتێکدا هەر ئەوان تەفرەقە و دووبەرەکییان خستە ناو قەومەکەیان!

کاتێک سەیری شەریعەتە بێگەردەکەی ألله دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت ألله – تبارك وتعالى– بەخراپە باسی حیزبایەتی و پارچەگەرێتیی کردووە، هەروەک نموونەمان بۆ دەهێنێتەوە بە گاور و جولەکەکان، دەفەرمووێت: **{ولا تكونوا كالذين تفرقوا واختلفوا من بعد ما جاءهم البينات وأولئك لهم عذاب عظيم}**[1]. واتە: {نەکەن وەکو ئەوانە بکەن کە پارچە پارچە بوون و جیاوازییان لەنێوان دروست بوو لەدوای ئەوەی بەڵگەکانیان پێگەیشتبوو، ئەوانە سزای گەورەیان بۆ هەیە}.

---

(١) سورەتی آل عمران، ئایەی ١٠٥.

هەروەها فەرموویەتی: {... **ولا تكونوا من المشركين * من الذين فرقوا دينهم وكانوا شيعا كل حزب بما لديهم فرحون**}[1]. واتە: {–ئەی موسڵمانان– لەسەر مەنهەجی موشریکەکان مەبن * ئەوانەی کە دینەکەیان پارچە پارچە کرد و بوونە چەند کۆمەڵەیەک، هەموو پارچە و حیزبێک دڵخۆشن بەوەی لەدەستیانە}.

هەروەها هەمیشە ألله –تبارك وتعالى– فەرمانی بە یەکگرتنی موسڵمانان کردووە لە چوارچێوەی قورئانەکەی و تەوحید. هەروەک فەرموویەتی: {**واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا ...**}[2]. واتە: {هەمووتان بەیەکەوە خۆتان بە پەتی ألله بگرن و پەرتەوازە مەبن ...}.

هەروەها ألله –سبحانه وتعالى– فەرموویەتی: {**شرع لكم من الدين ما وصى به نوحا والذي أوحينا إليك وما وصينا به إبراهيم وموسى وعيسى أن أقيموا الدين ولا تتفرقوا فيه ...**}[3]. واتە: {شەریعەتمان بۆتان داڕشتووە لە دین بەوجۆرەی کە وەسیەت کرا بۆ نوح، هەروەک ئەوەی وەحیمان بۆ تۆ نارد و هەروەها وەسیەتمان کرد بۆ إبراهيم و موسا و عیسا بەوەی کە دامەزراو بن لەسەر دین و پارچەگەرێتیی تێدا مەکەن ...}.

کەواتە تێکڕای پێغەمبەران –عليهم الصلاة والسلام– هۆشدارییان پێدراوە تاکو نەکەونە پارچەگەرێتی.

نەک هەر پارچەگەرێتی، بەڵکو تەنانەت ألله –عز وجل– هۆشداریمان پێدەدات کە خۆمان لە ناکۆکیش بپارێزین؛ چونکە ناکۆک بوون هەنگاوی یەکەمە بۆ پارچەگەرێتی و حیزبایەتی. هەروەک دەفەرمووێت: {... **ولا تنازعوا فتفشلوا وتذهب**

(١) سورەتی الروم، ئایەی ٣١ و ٣٢.
(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ١٨٣.
(٣) سورەتی الشورى، ئایەی ١٣.

**ريحكم ...}**[1]. واتە: {... دەمەتەقێ و ناکۆک مەبن لەگەڵ یەکتر ئەگینا دەشکێن و شکۆمەندیتان نامێنێ ...}.

تەنانەت ألله –سبحانه وتعالى– لەپێناوی لەناوبردنی پەرتەوازەیی لەناو موسڵمانان‌دا فەرمان بە کوشتنی ئەو کۆمەڵانە دەکات کە هەوڵی پارچە کردنی دین و بیروباوەڕی موسڵمانان دەدەن، هەروەک فەرموویەتی: **{وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله ...}**[2]. واتە: {بیانکوژن بۆ ئەوەی نەبنە مایەی فیتنە و ئاژاوە هەروەها بۆ ئەوەی دینداریی کردن هەمووی بۆ ألله بێت ...}.

هەموو ئەم ئایاتانە دەیسەلمێنن شەریعەتی ئیسلام لەم خاڵەشدا بەهەموو شێوەیەک دژی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتە؛ چونکە لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا پارچەگەرێتی و حیزبایەتی بنچینەن بۆ ئەم شەریعەتە تاغوتە. بەڵام لە شەریعەتی ألله دا موسڵمانان پێویستە لەسەریان کۆببنەوە لە دەوری شەریعەتی ألله، دەبێ کۆببنەوە لەژێر سێبەری ئیمامی موسڵمانان. نابێت هیچ کەسێک لە موسڵمانان خۆی لە کۆمەڵی موسڵمانان جیابکاتەوە بەهەر بیانووێک بێت. بەڵگەشمان زۆرە لەبارەی چارەنووسی ئەو جەماعەتانەی لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بوونەوە ئیتر چیان بەسەرهات، بۆ نموونە:

١- لە سەردەمی خەلیفەی باوەڕداران أبي بكر الصديق –رضي الله عنه– کۆمەڵێک کەس خۆیان جیاکردەوە لە موسڵمانان و گووتیان ئێمە بەهەموو شتێکی ئیسلام ڕازین تەنها زەکات نادەین. خەلیفەی باوەڕداران لێیان خۆش نەبوو و ئەم پارچەگەرێتیەی لێیان قەبوڵ نەکرد، بەڵکو کوشتارێکی زۆری لێکردن تاکو ئەو کاتەی پەشیمان بوونەوە و تەسلیمی خەلیفەی موسڵمانان بوون و ڕازی بوونەوە بە پێدانی زەکات[3].

---

(١) سورەتی الأنفال، ئایەی ٤٦.

(٢) سورەتی الأنفال، ئایەی ٣٩.

(٣) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الزكاة > باب وجوب الزكاة > فەرموودەی ژمارە: ١٣٩٩.

٢- کەسانێک پەیدا بوون کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد، ئەوە بوو کوشتاریان کرا و لەناوبران، هەندێکیشیان تەوبەیان کرد و پەشیمان بوونەوە. ژمارەیان زۆرە، بەتایبەتیش ئەوەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– زۆر ناودار بوو بریتی بوو لە مسيلمة الكذاب، ئەویش لە جەنگی اليمامة لەناوبرا[١].

٣- خەواریجەکانیش لە هەردوو خەلیفەی باوەڕداران عثمان بن عفان و علي بن أبي طالب –رضي الله عنهما– هەڵگەڕانەوە و تەکفیریان کردن بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لە چەند ئایەتێکی قورئان، ئیمامی عەلی نێردراوی بۆیان نارد و هەڵەکانیانی بۆ ڕاست کردنەوە بەڵام تەسلیم نەبوون و دەستیان چووە خوێنی باوەڕداران، بۆیەش ئیمام عەلی جەنگی لەدژیان بەرپا کرد و زۆرینەیانی کوشت و لاوازی کردن[٢].

٤- شیعەکانیش خۆیان لە موسڵمانان جیاکردەوە و بە ئیمام عەلی ـیان گووت: تۆ خودای! ئەوەبوو ئیمام عەلی زۆرێکیانی سووتاند[٣]. بەهەمان شێوە قەدەرییەکانیش لەلایەن خەلیفەکانی موسڵمانانەوە دەکوژران[٤]؛ بەهۆی باوەڕ نەهێنانیان بە قەدەری ألله.

لە شەریعەتی ألله تاکە حیزبێک کە ڕێگای پێدرابێت بریتییە لە "حیزبی ألله"، کە ئەویش بریتییە لە "قورئان" و "سوننەتی پێغەمبەر". هەر کەسێکیش لەم حیزبە لابدات ئەوا بەبێ گومان لەسەر مەنهەجێکی داهێنراوە نەک مەنهەجی سەلەفی ساڵح.

کەچی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتدا زۆر ئاساییە مرۆڤەکان پارچەگەرێتی بکەن لەسەر بنەمای بیروباوەڕی جیاواز! **ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە زیانی بۆ قەومەکە هەیە:**

---

(١) کتێبی السيرة النبوية لإبن هشام > بەرگی سێیەم > غزوة أحد > قتل وحشي لمسيلمة > لاپەڕی: ٣٥.
(٢) کتێبی البداية والنهاية لإبن كثير > بەرگی شەشەم > كتاب دلائل النبوة > إخباره –صلى الله عليه وسلم– عن الخوارج وقتالهم > لاپەڕی: ٢٤١.
(٣) کتێبی سنن الترمذي > أبواب الحدود > باب ما جاء في المرتد > فەرموودەی ژمارە: ١٤٥٨.
(٤) کتێبی السنة لعبدالله بن أحمد بن حنبل > سئل عن القدرية والصلاة خلفهم وما جاء فيهم > لاپەڕی: ٤٢٩.

**زیانی یەکەم:** حیزبایەتی دەبێتە هۆی دروست بوونی لێکترازانێکی گەورە لەناو قەومەکە، بەمەش بەتەواویی قەومەکە لاواز و بێ ڕێز دەبن.

**زیانی دووەم:** حیزب هۆکارێکە بۆ موشریک بوونی مرۆڤەکان؛ چونکە هەر کەسێک خۆشەویستیی بۆ حیزبێک هەبێت ئەوا دەچێتە سەر دین و بیروڕای حیزبەکە، بەمەش دەبێتە عەبدی ئەوان، ئەمەش لە چەند ڕوویێکەوە:

ڕووی یەکەم: لە ئیسلامدا موسڵمانان باوەڕیان بە هەموو ئەو شتانە هەیە کە لە دینەکەیان باسکراوە. بەهەمان شێوە ئەو کەسەی دەچێتە ڕیزی حیزبێک ئەوا حیزبەکە باوەڕیان بە هەر شتێک بێت ئەوا کەسەکەش باوەڕی پێ دەبێت، حیزبەکە ڕقیان لە هەر شتێک بێت ئەویش ڕقی لێ دەبێتەوە!

ڕووی دووەم: لە ئیسلامدا موسڵمانان کۆمەڵێک بابەت بە پیرۆز دەزانن، وەکو ألله و نێردراوەکانی و کتێبەکان و هاوەڵانی پێغەمبەر و دروشمەکانی ئیسلام. کەچی لەناو حیزبەکەدا دامەزرێنەرانی حیزبەکە زۆر پیرۆزن و هەمیشە گرینگیان پێدەدرێت و پلەوپایەی تایبەتیان هەیە و بوونەتە تاغوت، جا ئەو کەسەی کە خۆشەویستیی بۆ حیزبەکە هەیە دەبێ کارەکتەرەکانی حیزبەکە بەپیرۆز و هێڵی سوور بزانێت و بایەخ بە قسە و بیروڕاکانیان بدات!

ڕووی سێیەم: لە ئیسلامدا موسڵمانان برای یەکترن و یەکتریان خۆشدەوێت و پارێزگاریی لە یەکتر دەکەن لەپێناوی ألله، هەروەها ڕقیان لە ئەهلی کوفر و شیرک دەبێتەوە لە پێناوی ألله ئەگەرچی کافرەکە باوک و دایکیشی بێت. ئەمەش لە ئیسلامدا پێی دەگووترێ (الولاء والبراء). کەچی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا حیزبییەکان خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە لەسەر بنەمای حیزبەکەیان دادەمەزرێنن، واتە ئەوەی لەگەڵ حیزبەکەیان بێت زۆرتر خۆشیان دەوێت و ئەوەیشی لەگەڵ حیزبێکی تر بێت کەمتر خۆشیان دەوێت! بۆیەش بینیومانە چەندین برای ناو یەک خێزان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر پچڕاندووە تەنها لەبەر جیاوازیی حیزبەکانیان! یاخود بینیمان هەردوو

حیزبە تاغوتپەرستەکەی کوردستان (پارتی و یەکێتی) بە هەزاران چەکداری یەکتریان کوشت (براکوژیی) کە هاوزمانی خۆیان بوون و هەردوو لایەنیش دیمۆکراسیخواز بوون! ئەمەیە بەرهەمی پارچەگەرێتی کە بنچینەیەکی دیمۆکراسیەتی تاغوتە.

**زیانی سێیەم:** پارچەگەرێتی سوودی زۆری هەیە بۆ ناحەزانی قەومەکە؛ چونکە ناحەزەکان دەتوانن سوود لە حیزبێک ببینن و بەکرێی بگرن تاکو لەڕێگایەوە زیان بە قەومەکە بگەیەنن. ئەمەشمان بینیوە لە خاکی باشووری کوردستان، هەروەک چۆن لە کاتی سەددامەوە تاکو ئێستاش دەوڵەتە تاغوتپەرستە نێودەوڵەتییەکان سوود لەم دوو حیزبە تاغوتپەرستە دەبینن و بەکاریان دێنن بۆ لەناوبردن و ڕیسواترکردنی ئەم قەومە. ئەمەیە بەرهەمی پارچەگەرێتییەکەی دیمۆکراسیەت کە سەرئەنجام بووە بەڵا بەسەر ئەم قەومە.

ئەی قەومەکەم، خۆ بینیتان ئەم بنچینەیەی دیمۆکراسیەت چەندە زیانی گەورە دەگەیەنێت بە قەومەکان، هەم لەسەر بنەمای تاک، هەم لەسەر بنەمای کۆمەڵگە. هەر بۆیەش لە ئیسلامدا بە توندترین شێواز پارچەگەرێتیی ڕەت کراوەتەوە.

تاکە کۆمەڵەیەک لەناو ئەم ئوممەتە کە دەیانەوێ بەناوی ئیسلامەوە مومارەسەی دیمۆکراسیەت بکەن بریتین لە حیزبی ئیخوان، ئەم کۆمەڵەیە هەر لە سەرەتاوە لەسەر بنەمایەک دروستبوو کە پێچەوانەی دینە، دامەزرێنەرەکەشی لە تاغوتێکی گۆڕپەرست بەلاوە هیچی تر نییە، ئەمەش بە شاهێدی خودی کتێبی نووسەرە ئیخوانییەکان. بەداخەوە لە هەموو دەوڵەتێکدا ئەم ئیخوانییانە کۆمەڵێک بەچکە حیزبیان دروست کردووە، لە باشووری کوردستانیش سێ دانە حیزبن. جا لەو کاتەوە تاکو ئێستا ئەم کۆمەڵەیە لە کوفر و شیرک و بیدعە و دژایەتی کردنی قورئان و سوننە و ئەهلی تەوحید و موجاهیدان بەلاوە هیچی تریان لێ نەبینراوە. لە لاپەڕی ٢٠٢ بەلاوە وەڵامی زۆرێک لە بەڵگەکانیان دەدەمەوە.

**بابەتی چوارەم: دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت.**

**دروشمی دووەم: هەڵبژاردن و دەنگدان.**

هەروەک لەلاپەڕی ٣٥ بەدواوە ڕوونکرایەوە، پیرۆزترین شت لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت بریتییە لە مرۆڤ و گەل. هێزی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت پەیوەستە بە مومارەسە کردنی دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت لەلایەن قەومەکە.

یەکێکیش لە دروشمەکان کە زۆرینەی قەومەکەم تێیکەوتوون بریتییە لە "هەڵبژاردن و دەنگدان"، لەم دروشمەدا حوکومەتە تاغوتپەرستەکە بەهۆی هەر پێشهاتێکەوە یاخود بەهۆی کاتی هەڵبژاردنی حیزبە تاغوتپەرستەکانەوە کۆمەڵێک بنکە دەکاتەوە و خەڵکەکەش دەچن و دەنگ دەدەن و پەنجەی شایەتومانیان مۆر دەکەن بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆیان!

خۆی پێویستە ئەوە بزانین کە هەڵبژاردن شتێک نییە پەیوەست بێت بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت، هەروەها هەڵبژاردن خۆی لەخۆیدا هیچ کێشەیەکی تێدا نییە لە شەریعەتی ألله، بەڵام ئامانجی هەڵبژاردنەکە گرینگە؛ چونکە ئەگەر هەڵبژاردنەکە بە ئامانجێکی ئاسایی ئەنجام بدرێت و هیچ کوفر و شیرکێک لە دەنگدانەکە نەبێت ئەوا ئاساییە، بەڵام ئەگەر هەڵبژاردن و دەنگدانەکە لەپێناوی ئامانجێکی کوفر و شیرک بێت یاخود بە سەرپەرشتی حوکومەتێکی تاغوتپەرست بێت، ئەوا بێگومان دەنگدەرەکە پێی موشریک دەبێت.

هەر بۆ نموونە هەڵبژاردنی پەرلەمانتاران، **با بزانین بۆچی ئەو کەسەی دەنگ بە پەرلەمانتارێک بدات ئەوا پێی موشریک دەبێت:**

**هۆکاری یەکەم:** دەنگدەرەکە موشریک دەبێت چونکە مومارەسەی دروشمێکی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتی کردووە، لەکاتێکدا ألله فەرمانی پێیان کردووە کوفر

به تاغوتەکان بکەین، یەکێکیش لە تاغوتەکان بریتییە لە "تاغوتی شەریعەت"، ئەمەش لە لاپەڕی ٧ بەدواوە باسکراوە.

**هۆکاری دووەم:** پەڕلەمانتار کۆمەڵێک دەسەڵات و مافی پێدراوە کە ئەم ئەرکانە تەنها مافی ألله ــن، نەک هیچ مرۆڤێک، یەکێک لە ئەرکەکانی پەڕلەمانتار بریتییە لە یاسادانانێکی بێ سنوور! واتە بەیەکەوە ئەندامەکانی پەڕلەمان شەریعەتێکی فراوان دادەڕێژن لەسەر بنەمای ویستی گەل، نەک لەسەر بنەمای شەریعەتی ألله. کەواتە یەکێک لە کارەکانی ألله پەککخرا، ئەویش "حاکمیەت" بوو. لەکاتێکدا ألله دەفەرمووێ: **{إن الحكم إلا لله ...}**[1]. واتە: {بەڕاستیی دادگەرێتیی و حوکمدان تەنها مافی ألله یە ...}.

**هۆکاری سێیەم:** هەروەها ئەرکێکی تری پەڕلەمانتار بریتییە لە لێپرسینەوە و لێکۆڵینەوە تاکو بزانێت ئاخۆ حوکومەت بە باشیی مومارەسەی دێمۆکراسیەت دەکات یاخود نا! کەواتە هەمیشە لە هەوڵدایە بۆ پەرەپێدانی بنچینەکانی شەریعەتی دێمۆکراسیەتی تاغوت لە خاکی باشووری کوردستان. ئەو بنچینە پیسانەی کە باسمان کرد: ئازادیی بیروباوەڕ، ئازادیی ڕادەربڕین، جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت (عەلمانیەت)، یەکسانیی لەنێوان موسڵمان و کافر، هی تریش کە باسکران لە لاپەڕی ٣٥ تاکو ٦٨. کەواتە پەڕلەمانتار هەوڵدەدات زۆرتر ئەم بنچینە پیسانەی دێمۆکراسیەت لە خاکەکەدا جێگیر بکرێن!

**هۆکاری چوارەم:** هۆکارێکی تریش بۆ کافر بوونی دەنگدەر ئەوەیە کە بە دەنگدان و مۆر کردنی پەنجەی شایەتومانی ئیتر پاڵپشتی دێمۆکراسیخوازە موشریکەکان دەکات و بەهێزیان دەکات و ڕێگایان بۆ خۆش دەکات تاکو بنچینەکانی دێمۆکراسیەت بچەسپێنن لە خاکی کوردستان. ئەمەش دەبێتە هۆی پەرەسەندنی شەریعەتی دێمۆکراسیەت لە خاکەکە. هەر بۆیەش دەبینین زۆرجار دەسەڵاتدارە

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٤٠.

تاغوتپەرستەکانی کوردستان بە دڵێکی خۆشەوە دەڵێن: خەڵکی کوردستان خەڵکێکی دیمۆکڕاسیخوازن و ئەوەتا ڕێژەی دەنگدان زیادترە لە ٧٠٪ یاخود هەر ڕێژەیەکی تر...

جا ئەی قەومەکەم، ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت دەنگ بدەیت، ئەمانە لە گرینگترین ئەرکەکانی پەڕلەمانتارە تاغوتەکانن، ئەمانە ئەو کارانەن کە پەڕلەمانتار دەیانکات لەناو بینایە بۆگەنەکەی پەڕلەمان. ئیتر کاتێک تۆ پەنجەی شایەتومانت بۆ یەکێک لەم پەڕلەمانتارانە مۆر بکەیت یاخود خۆشتبوویێت ئەوا بەبێ گومان تۆ موشریک بوویت؛ چونکە تۆ پاڵپشتی کەسێکی تاغوت دەکەیت کە سیفەتی حاکمیەت و یاسادانانی ألله ـی داگیرکردووە و خۆی یاسا و حەلال و حەڕامەکان دادەنێت و فەڕزی دەکات لەسەر ئەم قەومە. بەبێ گومان ئەم دەنگدانە موشریکت دەکات.

**لەوانەیە کەسانێک بڵێن: ئەی ئەگەر حیزبی ئیسلامیی دروست بکەین و دەنگیان پێ بدەین لەپێناوی گەڕاندنەوەی شەریعەتی ألله؟ ئەمەیان حوکمی چییە؟**

لە وەڵامدا دەڵێم: ئەمە پرسیارێکی زۆر گرینگە و دەبێ هەموو لایەک (بە تایبەت ئیخوانییەکان) وەڵامی ئەم پرسیارە بزانن؛ چونکە زۆرێکیان لەسەر بنەمای ئەم پرسیارە باوەڕیان بە حیزبایەتیی هەیە و بە جیهادی دەزانن! زۆرجار پێمان دەڵێن: ئێوە چۆن حیزبە ئیسلامییەکان و ئەندامەکانیان و دەنگدەرانیان بە کافر دەزانن؟ خۆ ئەوان لەپێناوی دیمۆکڕاسیەت حیزبایەتی ناکەن بەڵکو دەیانەوێت لەم ڕێگایەوە دینی ئیسلام بگەڕێننەوە، چۆن تەکفیریان دەکەن؟!

با بزانین بۆچی ئەحزابی بەناو ئیسلامیی کافرن، بۆچی ئەندام و دەنگدەرەکانیان کافرن.

دەبێ سەرەتا ئەوە بزانین کە یەکەم هەنگاوی چەسپاندنی دیمۆکڕاسیەت لە هەر خاکێکدا بریتییە لە "دانانی دەستوور"، تەنانەت دروستکردنی ئەم دەستوورە دەکەوێتە پێش دروستکردنی حوکومەت؛ چونکە دەبێت لە سەرەتادا دەستوور و شەریعەتێک بوونی هەبێت تاکو لەسەر بنەمای ئەم دەستوورە حوکومەتێک دروست بکرێت.

هەروەک چۆن کاتێک لە ساڵی ٢٠٠٣ حیزبی "بعث" ی تاغوت لە عیراقدا لەناوچوو، ئیتر ئەمریکا ڕاستەوخۆ حوکومەتێکی دێمۆکڕاسی دروست نەکرد، بەڵکو لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٥ بەدواوە ئینجا حوکومەتی عیراق دروست بوو؛ ئەمەش چونکە لەم ماوەیەدا لیژنەیەک ڕێکخرابوو تاکو هەڵسێت بە نووسینی شەریعەت و دەستوورێک تاکو حوکومەتی عیراق بیکاتە بەرنامەی حوکمڕانیی خۆی.

دەستوورەکەش دروستکرا لەلایەن کۆمەڵێک دێمۆکڕاسیخواز لە هەموو نەتەوەکانی عیراق، ئینجا حوکومەتێک لەسەر بنەمای دەستوورەکە ڕاگەیەندرا. دەستوورەکە بەتەواویی تێکڕای بنچینە کوفرەکانی دێمۆکڕاسیەتی لەخۆی گرتووە کە باسمان کرد، بۆیەش گومان لەوە نییە کە هەر خاکێک ئەم دەستوورەی تێدابێت ئەوا دارولکوفرە، هەر زانایەکی ئەهلی سوننە ئەم دەستوورە بخوێنێتەوە ئەوا گومانی لەوە نامێنێت عیراق و کوردستان دارولکوفرن.

**جا حیزبی سیاسیش ئەگەر تەنانەت بەناوی ئیسلامیشەوە دروست بکرێت لە عیراق و کوردستان (و شوێنەکانی تریش) ئەوا لەبەر ئەم هۆکارانە کافرن بە دەنگدەرانیشیانەوە:**

**هۆکاری یەکەم:** هەر کەسێک بیەوێت حیزبی سیاسی دروست بکات ئەوا دەبێت ڕازی بێت بەوەی لە چوارچێوەی دەستووری عیراقیی سیاسەت بکات، خۆ ئەگەر ڕازی نەبێت بەم مەرجە ئەوا هەر لە سەرەتاوە ناهێڵن حیزبیش دروست بکات! کەواتە هیچ حیزبێک نییە لەم عیراق و کوردستانە کە ئیللا ڕازی بووە بە تێکڕای مەرجە کوفرەکانی دەستووری عیراقیی. تەنانەت ئەگەر بەناوی ئیسلامیشەوە حیزب دروست بکات ئەوا قەت مۆڵەتی پێ نادرێت کە باوەڕی بە یەک ماددەی دەستووری عیراقیی نەبێت لەکۆی ١٤٤ ماددە.

ئەم دەستوورە بۆگەنەی عیراق و تێکڕای دەستوورە تاغوتەکانی وڵاتانی تر، هەموویان وەکو دینیان لێهاتووە، ئەمەش چونکە دین دوو جۆرە، یەکەمیان بریتییە لە "دینی حەق" ئەویش دینی تێکڕای پێغەمبەرانە –علیهم الصلاة والسلام–، بەتایبەت

دینی ئیسلام کەوا دینی ئوممەتی محمدە. دووەمیشیان بریتییە لە "دینی مەلیکی"، ئەمەش بە بەڵگەی فەرمایشتی ألله: {**... ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك ...**}[1]. واتە: {... لە دین و دەستووری پاشای میسڕدا نەبوو کەوا یوسف براکەی خۆی بپارێزێت و بیهێڵێتەوە ...}.

کەواتە هەر دەستوور و شەریعەتێک لە غەیری شەریعەتی ألله بریتییە لە تاغوت، هەروەها بریتییە لە دینی مەلیکی. بەتایبەتیش دەستووری بۆگەنی عیراقیش یەکێکە لە دینە مەلیکییەکان و لەلایەن مرۆڤە شەیتانییەکان دانراوە، تێکڕای حیزبەکانیش دانیان پێداناوە، بەمەش موشریک بوونە؛ چونکە ألله دەفەرمووێت: {**... وإن الشياطين ليوحون إلى أوليآئهم ليجادلوكم وإن أطعتموهم إنكم لمشركون ...**}[2]. واتە: {... بەڕاستیی شەیتانەکان وەحی دەنێرن بۆ لای مرۆڤە پاڵپشتەکانیان تاکو دەمەتەقێ لەگەڵ ئێوە بکەن، جا ئێوەش ئەگەر گوێڕایەڵیان بکەن ئەوا بێگومان موشریکن ...}.

هەر بۆیەش تێکڕای ئەحزابەکان و تەنانەت ئیخوانییەکانیش موشریکن؛ چونکە گوێڕایەڵ و پابەندی ئەو دەستوورەن کە لەلایەن پاڵپشتەکانی شەیتانەوە داڕێژراوە. جا ئەم موشریک بوونە هەنگاوی یەکەمی حیزبە بەناو ئیسلامییەکانە.

**هۆکاری دووەم:** بۆ ئێمە ئاشکرایە کە لە شەریعەتی ألله دا بەهەموو شێوازێک دژایەتی حیزبایەتی و پارچەگەرێتیی کراوە و لەم پێناوەدا هاوەڵان ئەو کەسانەیان کوشتووە کە هۆکاری پارچەگەرێتی بوونە. ئەمەش لە لاپەڕی ٧٩ تا ٨٤ باسکرا.

بەڵام ئەو کەسە بەناو موسڵمانەی کە دەیەوێت حیزبێکی بەناو ئیسلامیی دروست بکات ئەوا دەبێ بەتەواویی ئەم هەڵوێستەی ئیسلام ڕەت بکاتەوە و باوەڕی بە حیزبایەتی و پارچەگەرێتیی هەبێت! هەروەها دەبێ دان بە هەموو هەر حیزبێکی تریش بنێت کە بوونیان هەیە، وەکو "شیوعی" و "نەتەوەپەرستی" و "ئێزدی" و "خاچ

---

(١) سوڕەتی یوسف، ئایەی ٧٦.

(٢) سوڕەتی الأنعام، ئایەی ١٢١.

پەرست"، نابێ لە بەرنامەی حیزبەکەیدا پڕۆژەیەکی تێدابێ دژی هیچ بیروباوەڕێک بێت! خۆ ئەگەر حیزبێک باوەڕی پارچەگەرێتیی و یەکسانیی نەبوو ئەوا ئەسڵەن بۆی نییە حیزبیشی هەبێت! کەواتە ئەی قەومەکەم، ئەو حیزبە بەناو ئیسلامییانە هەموویان دانیان بە دەستووره تاغوتەکە ناوە، هەروەها باوەڕیان بە پارچەگەرێتیی هەیە لە چوارچێوەی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت، هەروەها دژی هیچ بیروباوەڕێکی کوفر ناوەستنەوە، هەروەک چۆن یەکێک لە ئەندامەکانی حیزبی کۆمەڵی بەناو ئیسلامیی لە کاناڵی NRT لە بەرنامەی "دووجار بیربکەوە" گووتی: ئەگەر ئێمە هێز و دەسەڵاتمان گرتە دەست ئەوا دەستوورێکی "نائیسلامیی" دەنووسین کە تێیدا دان بنێت بە یەکسانیی و پێکەوەژیانی کۆمەڵگا!

وەڵڵاهی بە گوێیەکانی خۆم بیستم و بە چاوەکانی خۆم بینیم. ئیتر ئەمانە چ جیاوازییەکیان هەیە لەگەڵ پارتی و یەکێتی تاغوتپەرست و پێڵاوی ئەمریکا؟ ئەمریکا هەر ئەوەی دەوێت کە دەستوورەکە نائیسلامیی بێ.

ئەی قەومەکەم، چۆن ئەمانە حوکمی ألله دەگەڕێننەوە لەکاتێکدا خۆیان باوەڕیان بە پارچەگەرێتی و دەستووری نائیسلامی و یەکسانی نێوان موسڵمان و کافر هەبێت؟! هەرگیز ئەم مرۆڤە پیسانە ناتوانن شەریعەتی ألله بگەڕێننەوە بەڵکو هەموو کات دژایەتی ئەحکامەکانی ئیسلامیان کردووە لەپێناوی ڕەزامەندیی دڵی ڕۆژئاوا و دێمۆکڕاسیخوازەکان و قەومی کورد. چۆن پەنجەی شایەتومانت مۆر دەکەیت بۆ ئەم ئیخوانییە دینفرۆشانە؟

تەنانەت کاتێک گۆڤارێک پرسیار لە کوڕی حسن البنا دەکات و دەپرسن: ڕاتان چییە لەبارەی بوونی حیزب بۆ تێکڕای بیروباوەڕەکان بۆ نموونە شیوعیەکان؟ لە وەڵامدا کوڕەکەی حسن البنا گووتی: مافی خۆیانە حیزبیان هەبێ!

ئەمە چ بیروباوەڕێکی جاهیلانەیە کە ئیخوانییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن! ئیزن بۆ شیوعیەک و گاورێک و شەیتانپەرستێک هەبێت و حیزب دروست بکەن و بنکەی

حیزبیان هەبێت، هەروەها کاناڵیان هەبێت و بانگەواز بۆ بیروباوەڕی خۆیان بکەن، ئەگەریش زۆرینەی خەڵکەکە دەنگیان پێیاندا ئەوا دەگەنە هێز و دەسەڵات! جا ئەی ئیخوانییەکان پێمان ناڵێن کامە ئایەت و فەرموودە ئیزن بەم بیروباوەڕە پووچەڵەی ئێوە دەدات؟ هاوار بۆ حاڵی ئەو کەسەی پەنجەی شایەتومانی بۆ ئێوە مۆر بکات.

بۆیەش ئەی قەومەکەم، نەکەن هەڵخەڵەتێن بە سەر و ڕیش و قسە بریقەدارەکانی ئەندامی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان؛ چونکە ملکەچی دەستوورە بۆگەنەکەی عیراقن و خاڵ بە خاڵیان قەبوڵ کردووە ئەگینا ئەسڵەن نەیاندەهێشت! هاوار بۆ حاڵی ئەو کەسەی پەنجەی شایەتومانی خۆی مۆر دەکات بۆ ئەم ئیخوانییە مورتەدانە.

**هۆکاری سێیەم:** شەریعەتی دیمۆکراسیەت هەر بەم کافربوونەی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان ناوەستێ، بەڵکو زۆرتر دەیانخاتە ناو شیرک و کوفر، ئەویش لەدوای دروست کردنی حیزبەکە و دان پێدانانی حیزبەکە بە دەستوورە کوفرینەکەی عیراق، ئینجا ئەگەر دەنگ بهێنن و بگەنە پەڕلەمان ئەوا پێویستە سوێندی یاسایی یاخود سوێندی دەستووریی بخۆن! با بزانین ئەم کوفرە گەورەیەش چییە.

ئەی قەومەکەم، کاتێک تۆ دەچیت و خۆت موشریک دەکەیت و دەنگ بە پیاوێکی بەناو موسڵمانی دیمۆکراسیخواز دەدەیت و ئەویش دەگاتە پەڕلەمان و دەبێتە تاغوتێکی ئەم پەڕلەمانە، ئەوا لە پێش دەستبەکاربوونی فەرمانی پێدەکرێت لەبەردەم ئەندامەکانی پەڕلەمان دەستی لەسەر کتێبەکەی ألله (قوڕئان) دابنێت و سوێندێکی دەستووری بخوات کە ئەمەش دەقی سوێندەکەیە بە وەرگێڕدراوی کوردیی:

**سوێند دەخۆم بە ألله ی بەرز و مەزن، کە هەڵبستم بە ئەنجامدانی ئەرک و بەرپرسیارێتییە یاساییەکانم، بەوپەڕی لێبڕاویی و دڵسۆزییەوە، هەروەها پارێزگاریی لە سەربەخۆیی و سەروەریی عیراق بکەم، هەروەها بەرژەوەندییەکانی گەلەکەم لەبەرچاو بگرم، هەروەها شەونخونیی بکەم بۆ پاراستنی سەلامەتیی زەویەکەی و ئاسمانەکەی و ئاوەکەی و سامانەکەی و هەروەها سیستەمە دیمۆکراتیەکەی، هەروەها کار دەکەم بۆ**

**پاراستنی ئازادییە گشتیی و تایبەتییەکان، هەروەها بۆ سەربەخۆیی دادگاکان، هەروەها پابەند بوون بە جێبەجێ کردنی یاساکان بە ئەمانەت و بێلایەنییەوە، ألله شاهێدە بەوەی کە دەیڵێم.**

خۆ دەبینن ئەی قەومەکەم، ئەو کەسەی کە تۆ لەپێناویدا موماڕەسەی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتت کرد، ئەوەتا وا سوێند دەخوات بەم خاڵانە:

١- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی ئەو ئەرکانە ئەنجام بدات کە دەستوورە پیسەکەی عیراق بۆی داناوە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە (واتە ئیخلاس). واتە بەوپەڕی ئیخڵاسەوە ئەرکە کوفرەکانی دەکات.

٢- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی پارێزگاریی لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت بکات لە خاکی عیراق.

٣- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی ئازادییەکان بپارێزێت، وەکو ئازادیی بیروباوەڕ و ئازادیی بیروڕا و ئازادیی بڵاوکردنەوەی بیروڕایە کوفرەکان و هتد...

٤- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی کار بکات لەپێناوی سەربەخۆ کردنی دادگاکان تاکو بەوپەڕی ئازادییەوە حوکم بکەن لەسەر بنەمای ئەو یاسایە دەستکردە تاغوتییانەی کە لە بینایە پیسەکەی پەڕڵەمانەوە دەردەچن ئەگەرچی پێچەوانەی شەریعەتی ألله بن.

٥- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی هەڵسێت بە جێبەجێ کردنی یاساکانی دەستوور و یاسایە دەرچووەکانی ناو پەڕڵەمان، بەبێ ئەوەی لێیان لابدات، ئەگەرچی یاساکان کوفر و سەرپێچیش بن لە شەریعەتی ألله دا.

لەکۆتایی ئەم پێنج سوێندە کوفرەیدا دان بەوەش دەنێت کە ألله شاهێدە بەسەری و دەیبینێت! گوفتارەکانی وەک ئەوەن بڵێت: خوایە سوێند بە تۆ دەخۆم کە کوفرت

بەرامبەر بکەم! هەروەک جولەکەکان کە دەیانگووت "سمعنا وعصینا"! واتە: خودایە گوێبیستت بووین و سەرپێچیت دەکەین!

دەی هاوار بۆ حاڵی ئەو ئەندام پەڕلەمانە، ئەوەتا گومان نەما لە کافرێتییەکەی، ئەم کوفرە گەورەیەش یەکەم هەنگاوی کوفرەکانی داهاتوویەتی لەناو بینای پەڕلەمان. هاوار بۆ حاڵی ئەو کەسەی پەنجەی شایەتومانی خۆی بۆ مۆر کردووە.

**جا لێرەدا ئەندام پەڕلەمانە ئیخوانییەکان فێڵێک لە دەنگدەرانیان دەکەن، پێیان دەڵێن:** ئێمە ئەم سوێندەمان بە حەزی خۆمان نەخوارد بەڵکو ناچاربووین، هەروەها ئێمە لەکاتی سوێند خواردنەکە نیەتمان گەڕاندنەوەی حوکمی أللە بوو نەک حوکمی دیمۆکڕاسیەت! هەروەها ئەگەر هێز و دەسەڵاتمان گرتە دەست ئەوا دژی سوێندەکە دەجووڵێینەوە.

بێگومان ئەم شوبهەیەش خۆڵی کردووەتە چاوی زۆرێک لەو دەنگدەرانەی کە بەوپەڕی جەهل و بێ ئاگاییەوە دەنگیان بەم فێڵبازانە داوە. لە وەڵامی ئەم فێڵەدا دەڵێم: ئەم گوفتارەی ئیخوانییەکان هەرگیز نابێتە ڕێگر لە بەردەم تەکفیر کردنی ئەوان و دەنگدەرانیشیان، ئەمەش لەبەر چەند خاڵێک:

١- ئەوان دەڵێن ئێمە ناچاربووین بۆ ئەوەی ئەم سوێندە کوفرە بخۆین، لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر ناچار نەبوون ئەم سوێندە کوفرە بخۆن؛ چونکە ئەسڵەن خۆیان باوەڕیان بە ناوەڕۆکی سوێندەکە هەیە، باوەڕیان بە دەستووری عیراقیی هەیە، باوەڕیان بە دیمۆکڕاسیەت هەیە، ئەگەر باوەڕیان بە هەموو ئەمانە نەبێت ئەوا ئەستەمە بگەنە پەڕلەمان، بەڵام مادام گەیشتنە پەڕلەمان ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی باوەڕیان پێیەتی.

لەگەڵ ئەمەشدا با بزانین ئایا ئەم ئیخوانیانە بیانووی ناچاربوون (إکراه) دەیانگرێتەوە یان نا؟! لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر تەنانەت ئەم بیانووەش نایانگرێتەوە؛ چونکە عوزری ناچارکردن (إکراه) تەنها کەسێک دەگرێتەوە کە لەژێر هەڕەشە و ئەشکەنجەدان و لێدان و سووتاندن و بڕینەوەی لەشیدا زۆر ناچار بکرێت بەوەی

گوفتارێک یاخود کردارێکی کوفر دەربڕێت. ئەمەش مەنهەجی ئەهلی سوننەیە، بەتایبەت ئیمام أحمد بن حنبل و ئیمام إبن حجر العسقلاني و شێخی ئیسلام إبن تيمية –رحمهم الله–. بەڵام ئایا ئەم ئەندام پەڕلەمانە ئیخوانییانە ئەم بیانووە دەیانگرێتەوە؟ ئایا کاتێک سوێندە کوفرەکە دەخۆن چەک لەسەریان دانراوە و ناچارن بۆ ئەوەی مومارەسەی دیمۆکڕاسیەت و پەڕلەمانتاریی بکەن؟!

ناواللە بەڵکو بەوپەڕی ئاسوودەییەوە سوێندەکە دەخۆن و سووریشن لەسەر سوێندەکەیان، ئەسڵەن زۆر جددی تریشن لە حیزبە دیمۆکڕاسیخوازەکانی تر لە داواکردنی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت! کەواتە ئەی قەومەکەم ئاگاداربن، ئەم بیانووە تەنها فێڵێکە و هەرگیز نابێتە بەڵگەی شەرعیی؛ چونکە ئەمانە هەر لە سەرەتاوە بە حەزی خۆیان باوەڕیان بە دیمۆکڕاسیەت هێناوە و مومارەسەی دەکەن و حیزبیان بۆی دروست کردووە و چوونەتە پەڕلەمان، هەرگیز هیچ شتێک و هێزێک ناچاری نەکردوون.

٢- ئەوان دەڵێن ئێمە نیەتمان لە سوێندەکەدا گەڕاندنەوەی حوکمی ألله بوو نەک حوکمی دیمۆکڕاسیەت، لە وەڵامدا دەڵێم: تەنانەت ئەگەر نیەتیان گەڕاندنەوەی حوکمی ألله بووبێ ئەوا هیچ سوودی بۆیان نییە و نابێتە بەربەست لەبەردەم کافر بوونیان؛ ئەمەش چونکە ئەو پەڕلەمانتارە ئیخوانییانە لەسەر فەرمانی دەستووری عیراقیی سوێندەکەیان خواردووە. لەم حاڵەتەشدا نیەتی دڵ ناخوات، هەروەک نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– فەرموویەتی: «**اليمين على نية المستحلِف**»[1]. واتە: «**سوێند خواردن وەستاوەتە سەر نیەت و مەبەستی ئەو کەسەی داوای سوێند خواردنەکەی کردووە**».

(١) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الأيمان والنذور > باب يمين الحالف على نية المستحلف > فەرموودەی ژمارە: ١٦٥٤.

جا لەسەر بنەمای ئەم فەرموودەیەی سەرەوە دەپرسم: ئایا ئەندام پەرلەمانە ئیخوانییەکان بە حەزی خۆیان سوێندە کوفرینەکەیان خوارد یان لەسەر فەرمان و داوای دەستوور؟ بێگومان لەسەر فەرمانی دەستوور سوێندیان خواردووە، دەقی سوێندەکە دەکەوێتە ماددەی ٥٠ لە دەستووری عێراقیی، تیایدا فەرمانکراوە بەوەی هەموو ئەندامەکانی پەرلەمان ئەم سوێندە بخۆن. کەواتە بە حەزی خۆیان سوێندیان نەخواردووە.

جا لەم حاڵەتەدا مادام سوێندەکانیان لەژێر فەرمانی دەستوورە تاغوتەکە خوارد، کەواتە هەمان فەرموودەی سەرەوەیان لەسەر جێبەجێ دەبێت و ئیتر کەوتنە ژێر کاریگەریی ڕواڵەتی سوێندەکە و نیەتی دڵیشیان بێسوودە.

بەهەمان شێوە ئیمامی نووي –رحمه الله– لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا پێمان ڕادەگەیەنێت نیەتی دڵ و هەروەها "التورية" هیچ سوودیان نییە بۆ ئەو کەسەی سوێند دەخوات مادام داوای سوێند خواردنی لێکراوە[1].

٣- دەڵێن ئەگەر هێز و دەسەڵاتمان گرتە دەست ئەوا دژی سوێندەکە دەوەستینەوە، منیش دەڵێم: سوێند بە ألله لەم قسەیەشیان ڕاست ناکەن؛ چونکە ئەوەتا یەکێک لە ئەندامەکانی حیزبی کۆمەڵی ئیخوانیی لە کاناڵی Kurdsat News ی یەکێتی تاغوتپەرستدا بە ئاشکرا گووتی پێویستە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی لەژێر ڕەزامەندیی و پشتیوانی ئەمریکا بێت! ئەوەتا عەلی باپیری تاغوت لە کاناڵی Rudaw لە بەرنامەی "لەگەڵ ڕەنج" بە ئاشکرا گووتی دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی بە شێوازێکی کۆنفیدڕاڵیی و سەردەمیانە دروست بکرێت! ئەوەتا لە میسڕ دەسەڵاتیان گرتە دەست، هیچ گۆڕانکارییەک ڕوویدا؟ حوکم و شەریعەتی ألله جێبەجێ کرا؟ ئەسڵەن ئەوەتا تاکو ئێستاش دژایەتی ئەهلی تەوحید دەکرێت لە بیابانی سیناء تەنها لەبەر ئەوەی داوای شەریعەتی ألله دەکەن! ئەوەتا ئەردۆگانی سەرۆکی تورکیا

(١) کتێبی صحيح مسلم بشرح النووي > بەرگی یازدەهەم > لاپەڕی ژمارە: ١٦٨ و ١٦٩.

پیاوێکی تاغوت و ئیخوانییە، لە لوتکەی هێز و دەسەڵاتدایە، ئایا حوکم بە دینەکەی ألله دەکات لە خاکی خۆی؟ ئەسڵەن ئەوە فیلمە تورکییەکان بوون کە ئەخلاقی قەومی کورد و عەرەبیان تێکدا و بە ئاڕاستەی بێڕەوشتیی و غەرامیاتیان بردن. ئەوەتا بە ڤیدیۆ بەردەستە کەوا ئەردۆگان لە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ کاناڵی الجزیرة دەڵێت: ئێمە بە دیمۆکراسیەت و عەلمانیەت گەیشتووینەتە ئەمڕۆ.

٤- کاتێک سەیری ژیاننامە و ئاکاری پێغەمبەری خۆشەویستمان دەکەین لە مەککە، دەبینین هەرگیز کاری لەمجۆرەی نەکردووە! هەرگیز خۆی تێکەڵی سیاسەتە بۆگەنەکەی قوڕەیش نەکرد، بەڵکو بە ئاشکرا بەرائەتی لێکردن و لاوازیی قەبوڵ کرد نەک لەگەڵیان دابنیشێت و بەم ڕێگایە خۆی بگەیەنێتە هێز! بۆیەش ئەم ڕێگایەی ئەوان گرتوویانەتە بەر بەهەموو شێوازێک دژی بانگەوازی تێکڕای پێغەمبەرانە؛ چونکە بانگەوازی پێغەمبەران بەشێوازی بەرائەت بووە، واتە بەرائەتیان لە قەومی خۆیان کردووە و بانگەوازیان کردوون و بەشێک نەبوونە لە سیاسەتی دەسەڵاتدارە تاغوتییەکانی خۆیان، هەرگیز نەچوونەتە ڕیزەکانیان، هەر بۆیەش زۆرێکیان ئازار دەدران یاخود دەکوژران، ئەمەش لە لاپەڕی ٢٣ و ٢٤ باسکرا.

ئەی قەومەکەم، ئەوەتا ئەم فێڵەی ئیخوانییەکانت بۆ دەرکەوت کە هەڵساون و بەناوی ئیسلامەوە مومارەسەی دیمۆکراسیەت دەکەن و ئێوەی نەزانیش بەکاردەهێنن بۆ مەبەستە ناشەرعیی و پیسەکەیان، بۆت دەرکەوت کە ئەوان ڕاست ناکەن کاتێک دەڵێن ناچارین سوێندە کوفرینەکە بخۆین! هەروەها دەرکەوت ڕاست ناکەن کاتێک دەڵێن نیەتمان گەڕاندنەوەی حوکمی خوایە نەک دیمۆکراسیەت! ئیتر چ بیانوویێکت بۆ ماوەتەوە تاکو دەنگ بدەیت و مومارەسەی دروشمێکی دیمۆکراسیەت بکەیت؟

ئەی خوێنەری زانستخواز، ئەوە بۆت دەرکەوت دەنگدان بە حیزبەکان واتە مومارەسەکردنی دروشمێکی دیمۆکراسیەت، ألله پێمان دەڵێت کوفر بکەن بە تاغوت، کەچی ئەمانە باوەڕیان پێیەتی و خەڵکیشی بۆ هان دەدەن. بۆیەش هیچ گومانێک نییە لە کافرێتی ئەو کەسەی کە پەنجەی شایەتومانی خۆی مۆر دەکات و دەنگ دەدات؛

چونکە دەبێ کوفر بە تاغوت بکرێت نەک مومارەسەی دروشمەکانی بکرێت، ئەگینا موسڵمانێتی دروست نابێت، هەروەک ألله فەرموویەتی: {... **فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ...}**[1]. واتە: {... هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە ألله بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}.

لە بەشی دووەمدا لە لاپەڕی ٢٠٢ بەدواوە بە درێژیی وەڵامی گومانەکانی تری ئیخوانییەکان دەدەمەوە کە کەسانێکی نەزان و ساویلکەی پێ هەڵدەخەڵەتێنن.

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

## بابەتی چوارەم: دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت.

## دروشمی سێیەم: دەستاودەست کردنی دەسەڵات.

دروشمێکی تر لە دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت، بریتییە لە دەستاودەست کردنی دەسەڵات، یاخود ئاڵوگۆڕ کردنی دەسەلات، هیچ حیزبێکیش مۆڵەتی دروست بوونی پێنادرێت تاکو باوەڕی تەواو بەم دروشمە نەهێنێت. ئەگەر دەشڵێن: ئایا حیزبە بەناو ئیسلامییەکان دانیان بەم دروشمە ناوە؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بەڵێ باوەڕی تەواویان پێیەتی و دانیان پێدا ناوە ئەگینا هەرگیز مۆڵەتی دروستکردنی حیزبیان پێ نەدەدرا، بەڵام نایانەوێت خەڵک بیزانێت؛ چونکە ئەگەر خەڵک بۆی دەرکەوت ئەمانە باوەڕیان بە دەستاودەست کردنی دەسەڵات هەیە ئەوا ئەو تۆزە خەڵکەی کە دەنگیشیان پێدەدەن ئیتر لێیان هەڵدەگەڕێنەوە و هیچی تر پەنجەیان مۆر ناکەن بۆ هیچ حیزبێک.

**مەبەست لە دەستاودەست کردنی دەسەڵات:** بریتییە لە دروشمێکی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت کە تێیدا هەر حیزبێک زۆرترین ڕێژەی دەنگی هێنا ئەوا دەبێتە دەسەڵاتدار بۆ ماوەی چوار ساڵ، دواتر ئەگەر حیزبێکی تر دەنگی زۆرتری هێنا ئەوا دەبێ حیزبە دەسەڵاتدارەکە وازبهێنێت لە دەسەڵات و تەسلیمی حیزبەکەی تر ببێت.

کەواتە دوو خاڵ بەدی دەکرێت:

١- ئەو حیزبەی هێز و دەسەڵات دەگرێتە دەست ئەوا لە ماوەی چوار ساڵی حوکمڕانیەکەیدا هەوڵدەدات بەشێکی بیروباوەڕی خۆی بچەسپێنێت. لە وەڵامیشدا دەڵێم: لە شەریعەتی أللە دا هەرگیز ڕێگا بە بیروباوەڕە پووچەڵەکان نادرێت کە بانگەشە بۆخۆیان بکەن، تەنانەت نابێت بهێنرێنە ناو بەشێک لە سیاسەتی حوکمڕانی دەوڵەتی ئیسلامیی، چ جای ئەوەی بکرێنە دەسەڵاتدار و حوکم بکەن! هەموو ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان دژی موسڵمانانن و هەرگیز بەرژەوەندیی موسڵمانانیان ناوێت بەڵکو هەرچۆنێک پێیان بکرێت ئەوا زیان بە موسڵمانان دەگەیەنن، بۆیەش دەبێ

لەپێش هەموو شتێک لە سیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامیی دوور بخرێنەوە، هەروەک ألله فەرمانمان پێدەکات: **{يأيها الذين ءامنوا لا تتخذوا بطانة من دونكم لا يألونكم خبالا ودوا ما عنتم قد بدت البغضآء من أفواههم وما تخفي صدورهم أكبر قد بينا لكم الآيات إن كنتم تعقلون}**[1]. واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دۆست و هاوکارێک بۆخۆتان دامەنێن کە لەخۆتان نەبێت، ئەوان لە زیان پێگەیاندنی ئێوە درێغی ناکەن، ئەوان ئاواتەخوازی ناڕەحەتیی ئێوەن، لە دەمیانەوە توڕەیی و قین دەردەکەوێت، ئەوەیشی کە لە دڵیان دەیشارنەوە زۆر قین و ڕقێکی گەورەترە، بەڕاستیی ئێمە ئایاتەکانمان بۆتان ڕوون کردووەتەوە ئەگەر ئێوە بیر بکەنەوە}.

ئەوەتا لە ئایەتەکەدا وشەی "من دونكم" بەکارهاتووە، واتە هەرگیز نابێت موسڵمانان کەسێک بکەنە یاوەر و پاڵپشتی خۆیان کەوا موسڵمان نەبێت! تەنانەت بۆ یەک ڕۆژیش نابێت ئیزن بە ئەهلی کوفر و شیرک بدرێت کە ئاگاداری بارودۆخی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامیی بن، ئیتر چ جای ئەوەی ڕێگایان بدرێت تا خۆیان بەسەر موسڵمانان زاڵ بکەن. ئەم خاڵە بەتەواویی پێچەوانەی شەریعەتی ألله یە.

٢- ئەگەر لەدوای چوار ساڵ حوکمڕانیی حیزبێکی تر دەنگی زۆرینەی بەدەست هێنا ئەوا دەبێ حیزبە دەسەڵاتدارەکە ملکەچ بێت و دەسەڵاتی تەسلیم بکات، ئەمەش ئەستەم نییە و زۆر ئاساییە! لە وەڵامی ئەم خاڵەشدا دەڵێم: لە شەریعەتی ألله دا تەنها موسڵمان حوکم دەکات و تەنها بە شەریعەتی ألله حوکم دەکات نەک شەریعەتێکی تری دەستکرد و تاغوت، هەروەها ماوەکەیشی دیاریکراو نییە بەڵکو خەلیفەی موسڵمانان هەمیشە لەسەر حوکم دەمێنێ و هەمیشە حوکم بە شەریعەتی ألله دەکات تاکو مردن، موسڵمانانیش لەسەریان واجبە گوێڕایەڵی خەلیفەی موسڵمانان بکەن مادام حوکم بە شەریعەتی ألله دەکات، هەروەک ألله فەرموویەتی: **{يأيها الذين ءامنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسول وأولي الأمر منكم فإن تنازعتم في شيء فردوه إلى الله والرسول إن**

(١) سورەتی آل عمران، ئایەی ١١٨.

**كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر ذلك خير وأحسن تأويلا}**[1]. واتە: {ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، گوێڕایەڵی ألله بکەن و گوێڕایەڵی نێردراوەکەی بکەن و هەروەها –گوێڕایەڵی– ئەو دەسەڵاتدارانەش کە لە خۆتانن، ئەگەریش ناکۆکیتان بۆ دروست بوو لە هەر شتێک ئەوا بیگەڕێننەوە بۆ لای ألله و نێردراوەکەی ئەگەر باوەڕدارن بە ألله و ڕۆژی دوایی، ئەمە چاکتر و باشترە –بۆ ئێوە}.

سەبارەت بە ئاڵوگۆڕی دەسەڵات، لە شەریعەتی ئیسلامدا دەستاودەست کردنی دەسەڵات بوونی هەیە، بەڵام لە موسڵمانەوە بۆ موسڵمان، نەک لە موسڵمانەوە بۆ کافر و موشریک و بەپێچەوانەوە! هەرگیز نابێ ئەهلی کوفر هێز و دەسەڵاتیان هەبێت، جا ئەگەر بە خۆشیی داوای بکەن یاخود بە جەنگ و ناخۆشیی، هەرگیز موسڵمانان نابێت تەنازول لە حوکمی ألله بکەن بۆ یەک ڕۆژیش. کەچی لە شەریعەتی دیمۆکراسیەتدا حوکمڕانیی هەر حیزبێک ماوەکەی تەنها چوار ساڵە و هەموو حیزبەکانیش ئەگەری سەرکەوتنیان هەیە جا ئێزدی بێت یان کاکەیی! پەنا بە ألله لەم شەریعەتە تاغوتە کە دەرگا بۆ زاڵکردنی ئەهلی کوفر دەکاتەوە بەسەر ئەهلی تەوحید و ئیسلام.

لە ئیسلامدا بە یەکێک لەم سێ شێوازە موسڵمانێکی تر دیاری دەکرێت بۆ ئەوەی ببێتە خەلیفە و ئەمیری موسڵمانان:

**شێوازی یەکەم:** ئەهلی "حل وعقد" هەڵدەستن بە پێدانی پەیمان (بیعة) بە موسڵمانێکی شیاو، ئیتر دەکرێتە خەلیفەی باوەڕداران. ئەمەش هەمان شێوازی هەڵبژاردنی أبي بكر الصديق بوو –رضي الله عنه.

**شێوازی دووەم:** خەلیفەی موسڵمانان خۆی هەڵسێت بە دەستنیشان کردنی موسڵمانێک تاکو لەدوای ئەو ببێتە خەلیفەی موسڵمانان. ئەمەش هەمان شێوازی دەستنیشان کردنی عمر بن الخطاب بوو لەلایەن أبي بكر الصديق –رضي الله عنهما–، دەشکرێ خەلیفەی موسڵمانان بە یاوەریی ئەهلی "شورى" هەڵسن بە دەستنیشان

---

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٥٩.

کردنی موسڵمانێک تاکو لەدوای خەلیفەکە ببێتە خەلیفە و ئەمیری باوەڕداران. ئەمەش شێوازی دەستنیشان کردنی عثمان بن عفان بوو لەلایەن عمر بن الخطاب –رضي الله عنهما.

**شێوازی سێیەم:** لە سەردەمێکدا هیچ خەلیفەیەکی موسڵمانان نەبوو ئینجا موسڵمانێکی موەحید کەوا زانست و دانایی و خیبرە و جوامێریی تێدابێت و خۆی بسەپێنێت بە زەبری لەشکر و هێزێکی پتەوی موسڵمانان پاڵپشتی بکەن و خاکێکی دیاریکراو بخاتە ژێر فەرمانڕەوایەتی خۆی، ئەوا خەلیفەی موسڵمانانە و دەبێت هەموو موسڵمانانی خاکەکەی بەیعەتی پێ بدەن و گوێبیست و گوێڕایەڵی بن مادام حوکم بە شەریعەتی ألله بکات و موسڵمان بێت. ئەمەش شێوازی خەلیفە عبدالملك بن مروان بوو –رضي الله عنه– کاتێک معاوية و کوڕەکەی (يزيد) –رضي الله عنهما– خیلافەتیان کۆتایی پێهات و موسڵمانان پەرتەوازە ببوون، ئیتر عبدالملك گەیشتە دەسەڵات و موسڵمانان و زانایانی سەلەفی ساڵح –رضي الله عنهم أجمعين– پابەند بوون بە گوێڕایەڵ بوونی.

هەر کاتێکیش خەلیفەی باوەڕداران بۆ ماوەی یەک ڕۆژیش پشتی لە شەریعەتی ألله کرد و بڕیاریدا شەریعەت و دەستوورێکی تاغوت بهێنێتە شوێنی و حوکمڕانیی پێ بکات، ئەوا بێگومان ئەو کەسە چیتر وەلی ئەمری شەرعیی موسڵمانان نییە بەڵکو کوفری بەواحی لێ بینراوە و کافر بووە، هەروەک هاوەڵی پایەدار عبادة بن صامت –رضي الله عنه– باسی پەیمان و بەیعەتی هاوەڵان دەکات بۆ پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– کە ئاوا بووە: «... **بايعنا على السمع والطاعة على منشطنا ومكرهنا، وعسرنا ويسرنا، وأثرة علينا، وأن لا ننازع الأمر أهله، إلا أن تروا كفرا بواحا عندكم من الله فيه برهان**»[1]. واتە: «... **بەیعەتمان دایە پێغەمبەر لەسەر گوێڕایەڵ بوون (بۆ دەسەڵاتدار) لە هەردوو حاڵەتی چالاکیی و ناخۆشی، هەروەها لە هەردوو حاڵەتی تەنگانە و**

---

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الفتن > باب قول النبي –صلى الله عليه وسلم–: "سترون بعدي أمورا تنكرونها" > فەرموودەی ژمارە: ٧٠٥٦.

**ئاسوودەیی، وە حەقەکانیان بدەین (ئەمەیە مەبەستی أثرة علینا، والله أعلم)، هەروەها ململانێی کاربەدەستان نەکەین مەگەر کوفرێکی وازح و ڕۆشنیان لێ ببینرێت و لەلایەن ألله بەڵگە هەبێت لەسەر کوفرەکە»**.

کەواتە خەلیفەی موسڵمانان تا ئەو کاتە خەلیفەیە کە حوکم بە شەریعەتی ألله بکات و هیچ کردارێک یاخود گوفتارێک دەرنەبڕێت کە کوفر و شیرکی گەورە بێت، ئەگەری کوفر و شیرکی گەورەی لێ نەبینرا ئەوا موسڵمانە ئەگەرچی ستەمکاریش بێت، بەڵام ئەگەر کوفر و شیرکی گەورەی لێ بینرا و شەریعەتی ألله پەک بخات و حوکم بە تاغوت بکات، یاخود خۆشەویستیی بۆ ئەهلی کوفر هەبێت یاخود باوەڕی بە ئازادییە بێ سنوورەکانی بیروباوەڕ و ڕادەربڕین هەبوو ئەوا بێگومان کافرە، موسڵمانان دەبێ تەکفیری بکەن و کوشتاری بکەن ئەگەر هێزیان هەبوو، ئەگەریش هێزیان نەبوو ئەوا دەبێ ئامادەکاریی بکەن بۆ لەناوبردنی ئەم دەسەڵاتدارە لەپێناوی گەڕاندنەوەی حوکمی ألله.

## بابەتی چوارەم: دروشمەکانی دێمۆکڕاسیەت.

### دروشمی چوارەم: خۆپیشاندان.

یەکێکی تر لە دروشمەکانی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوت بریتییە لە "خۆپیشاندان"، ئەویش بریتییە لەوەی ئەگەر خەڵکەکە ناڕازیی بوون لە یاسایەکی حوکومەتە تاغوتپەرستەکە، یاخود هەر کێشەیەکی گشتییان هەبوو، ئەوا سەرەتا مۆڵەتی خۆپیشاندان لە حوکومەتەکە وەردەگرن، ئینجا دواتریش کۆدەبنەوە لە شوێنێکی دیاریکراو و لەوێدا بە شێوازی شیعر و هوتاف و بەرزکردنەوەی جۆرەها دروشم ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕن، بەو مەرجەی نابێ بگاتە ئاستی توندوتیژیی و شەڕ و ئاژاوە، خۆ ئەگەر وایان کرد ئەوا حوکومەتە تاغوتپەرستەکە لەڕێگای هێزە ناوخۆییەکانەوە هەوڵی بڵاوکردن و تێکدان و بێدەنگ کردنی خۆپیشاندەران دەدەن تاکو دۆخەکەیان ئاسایی بکەنەوە. جا ئەگەر حوکومەت بە باشی زانی ئەوا وەڵامی ناڕەزایەتی خەڵکەکە دەداتەوە، ئەگەریش بە باشی نەزانی ئەوا بێدەنگیان دەکات و وەڵامیان ناداتەوە.

با بەیەکەوە بزانین حوکمی خۆپیشاندان چییە لە ڕووانگەی شەریعەتی أللە، هەروەها با بزانین لە شەریعەتی أللە هیچ شوێنگرەوەیەک (واتە البدیل) دانراوە بۆ خۆپیشاندان یاخود نا.

بێگومان لە هەر وڵاتێکدا ئەگەر خەڵکەکە ناڕازیی بوون ئەوا لەبەر یەکێک لەم دوو هۆکارەیە:

١- ناڕازین لە خودی دەسەڵاتدارەکانیان.

٢- ناڕازین لە شێوازی حوکمڕانی کردنیان.

دەکرێت لە یەکێکیان ناڕازی بن، دەشکرێت لە هەردووکیان.

جا با بزانین حوکمی شەرعیی ئەم دوو حاڵەتەی سەرەوە چییە.

**حاڵەتی یەکەم: ناڕازی بوون لە خودی دەسەڵاتدارەکە.**

دەسەڵاتداری هەر وڵاتێک یان ئەوەیە کە موسڵمانە، یانیش کافرە، جا ئەگەر موسڵمان بوو ئەوا زۆر چاکە و نیعمەتی ألله یە بۆ عەبدە موسڵمانەکانی، بۆیەش دەبێ بە وەلی ئەمری خۆیانی بزانن و دوعای خێری بۆ بکەن و پشتگیریی بکەن و نوێژ و جیهادی لەپشت بکەن مادام موسڵمانە و ئەهلی تەوحیدە، ئەگەریش دەسەڵاتدارەکە کافرێکی موشریک یان عەلمانی یان زەردەشتی و گاور و ئێزدی بوو، ئەوا موسڵمانان دوو ڕێگاچارەیان لەپێشە:

ڕێگاچارەی یەکەم: ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی بوونی هەبوو کە دەسەڵاتدارانی موسڵمان و ئەهلی تەوحید بوون، ئەوا لەسەر موسڵمانان واجبە –ئەگەر توانایان هەبوو– ئەوا هیجرەت بکەن بۆ خاکی فەرمانڕەوایەتی ئەو دەسەڵاتدارانە.

هەروەک چۆن موسڵمانان هیجرەتیان دەکرد لە شاری مەککەوە بۆ لای نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– بۆ ئەوەی لەژێر حوکم و فەرمانڕەوایەتی ئەودا بژین و پشت هەڵبکەن لە خاکێک کە تیایدا خۆیان و دینەکەیان بێدەنگ دەکرێن.

ئەگەریش توانایان نەبوو بە هەر هۆکارێکی جەستەیی، یاخود نەشارەزایی، یاخود بەهۆی نەبوونی توانای دارایی، ئەوا لێیان ناگیرێت و عوزری شەرعیان بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی بوونی هەبوو و دەسەڵاتدارانی موسڵمان بوون و کەسانێکیش خۆیان بە موسڵمان بزانن بەڵام هیجرەت بۆ ئەو خاکە نەکەن و ئەوا تووشی سزای دونیا و دواڕۆژ دەبنەوە، هەروەک ألله فەرموویەتی: **{إن الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم قالوا فيم كنتم قالوا كنا مستضعفين في الأرض قالوا ألم تكن أرض الله واسعة فتهاجروا فيها فأولئك مأواهم جهنم وسآءت مصيرا * إلا المستضعفين من الرجال والنسآء والولدان لا يستطيعون حيلة ولا يهتدون سبيلا * فأولئك عسى الله**

**أن يعفو عنهم وكان الله عفوا غفورا}**[1]. واته: {بەڕاستیی ئەو کەسانەی کە فریشتە گیانیان دەکێشێت لەکاتێکدا ئەوان ستەمیان لەخۆیان کردبوو، ئیتر –فریشتەکان– لێیان دەپرسن: ئێوە حاڵتان چۆن بوو؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە لاواز بووین لەسەر زەوی. –فریشتەکانیش– لێیان دەپرسنەوە: مەگەر زەوییەکەی ألله فراوان نەبوو تاکو هیجرەتی تێدا بکەن؟. بەڕاستیی ئەوانە چارەنووسیان دۆزەخە، ئای لەم چارەنووسە نالەبارە * تەنها ئەو پیاو و ئافرەت و منداڵانە نەبێت کە لاوازن و توانای خۆ دەرباز کردنیان نییە و ڕێگاکەیشی نازانن * جا ئەمانە دەکرێت ألله لێیان ببوورێت، بەڕاستی ألله لێبووردە و چاوپۆشیکار بووە}.

ڕێگاچارەی دووەم: ئەگەر دەوڵەتێکی ئیسلامیی بوونی نەبوو کە دەسەڵاتدارانی موسڵمان و ئەهلی تەوحید بن، ئەوا موسڵمانان ئەگەر توانایان هەبوو ئەوا دەبێ لەژێر جەماعەتێکی شەرعیی کۆببنەوە و ئەمیرێک دیاری بکەن و بەیعەتی پێبدەن و جیهاد ڕابگەیەنن لەسەر بنەمای شەریعەتی ألله بۆ جێبەجێ کردنی حوکمی ألله، بەڵام نەک بەو جۆرەی کە لەژێر سەرپەرشتی و ڕەزامەندیی دەسەڵاتدارە کافرەکانی خاکەکە دروست بکرێ!، بەڵکو دەبێ موسڵمانان خۆیان بەم ئەرکە شەرعییە هەڵسن و هیچ گوێ نەدەن بە دەسەڵاتدارە کافرەکە ئەگەرچی دژایەتیان بکەن.

ئەگەریش موسڵمانان توانایان نەبوو تەنانەت جەماعەتێکی شەرعیش دروست بکەن و جیهاد لەدژی سەرانی کوفر بکەن لە خاکەکە، ئەوا عوزریان بۆ هەیە و ئیتر دەبێ بانگەوازی تەوحید بکەن بە زمانیان و هەروەها بە جۆرەها ڕێگای تری وەکو کتێب و پەیام و بڵاوکراوەی دەنگیی و ڤیدیۆیی. هەروەها دەبێ بەڕائەت لە سەرانی کوفر بکەن لە خاکەکە و هەروەها قەومەکەیان هۆشیار بکەنەوە لە کوفری دەسەڵاتدارانیان؛ تاکو خەڵکەکە پەشیمان ببنەوە و ئیتر ڕێژەی ئەهلی تەوحید زۆرتر بکەن تا ئەو ئاستەی بتوانن جەماعەت دروست بکەن و ڕووبەڕووی سەرانی کوفر بووەستنەوە.

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٩٧ تا ٩٩.

کەواتە لە شەریعەتی ئیسلامدا ئەگەر دەسەڵاتدار کافر بێت ئەوا ڕێگاچارەی شەڕعیی بریتییە لە هیجرەت، یاخود دروستکردنی جەماعەتێکی شەڕعیی و خۆ ئامادە کردن و کۆکردنەوەی هێز بۆ جیهادکردن، ئەگەریش نەکرا ئەوا موسڵمانان بەپێی توانایان بانگەواز بۆ دینی ألله دەکەن و بەڕائەت لە کافرانی خاکەکەیان دەکەن.

هیچ ئاماژەیەک نییە بۆ خۆپیشاندان؛ چونکە خۆپیشاندان لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا پێویستی بە مۆڵەتی خودی دەسەڵاتدارە کافرەکە هەیە! هەروەها نابێ بەجۆرێک هەڵسوکەوت بکەیت کە دەسەڵاتدارە کافرەکە پێی خۆش نەبێت، جا ئەگەر مۆڵەتت نەدات ئەوا هەر بۆت نییە خۆپیشاندان بکەیت! کەچی بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتیی هەمیشە پێغەمبەران هیچ حیسابێکیان بۆ قەومە موشریکەکانیان نەکردووە و ئیزنیان لێ وەرنەگرتوون بەڵکو ڕاستەوخۆ بانگەوازی تەوحیدیان کردووە و قەومەکانیان ترساندووە.

**حاڵەتی دووەم: ناڕازی بوون لە شێوازی حوکمڕانی دەسەڵاتدارەکە.**

شێوازی حوکمڕانی کردنی دەسەڵاتدارەکەش هۆکارێکە بۆ ناڕەزایەتی قەومەکە، جا با بزانین لەم حاڵەتەشدا هیچ ئاماژەیەک دوور و نزیک بۆ خۆپیشاندان هەیە یاخود نا.

بەگشتیی دەسەڵاتدارەکان دوو جۆرن لەڕووی شێوازی حوکمڕانییەوە:

جۆری یەکەم: ئەو دەسەڵاتدارانەن کە موسڵمانن و حوکم بە شەریعەتی ألله دەکەن لە سەرانسەری خاکەکەیان و باوەڕیان بەهیچ شەریعەتێکی تاغوت نییە، بەڵام کەموکوڕییان هەیە و مافی خەڵکەکە نادەن یانیش جۆرێک لە ستەمکارییان بەرامبەر خەڵکەکە هەیە و جارجارەش کەموکوڕیان دەبێت و حوکمێکی شەڕعیی دەوەستێنن تاکو ماوەیەکی دیاریکراو یان بۆ کەسێکی دیاریکراو. لەم حاڵەتەدا ئەو دەسەڵاتدارە موسڵمانە و خاکەکەشی دارولئیسلامە؛ چونکە ستەمەکانی دەسەڵاتدارەکە

نەگەیشتووەتە ئاستی دەرکەوتنی کوفر، واتە هیچ کوفرێکی نەکردووە و لە خاکەکەیشیدا ڕێگای نەداوە بە دەرکەوتنی دروشمەکانی کوفر و شیرک و تاغوت.

لەم حاڵەتەدا نێردراوی ألله –صلی الله علیه وسلم– فەرمانمان پێدەکات بەوەی گوێڕایەڵی ئەم جۆرە دەسەڵاتدارە بین ئەگەرچی ستەمکار و دەستدرێژیشە، مادام حوکم بە شەریعەتی ألله بکات و دژایەتی تاغوتەکان بکات و جیهاد بکات. هەروەک فەرموویەتی: «**"يكون بعدي أئمة لا يهدون بهداي، ولا يستنون بسنتي، وسيقوم فيهم رجال قلوبهم قلوب الشياطين في جثمان إنس". قال: قلت: كيف أصنع يا رسول الله إن أدركت ذلك؟. قال: "تسمع وتطيع للأمير، وإن ضرب ظهرك، وأخذ مالك فاسمع وأطع"**»[١].

واتە: «**"لەدوای مندا کۆمەڵێک دەسەڵاتدار دەبن کە لەسەر ڕێنموویی من نابن، هەروەها لەسەر ڕێگای من ناڕۆن، ئیتر پیاوانێکیان تێدا هەڵدەکەوێت کە دڵیان دڵی شەیتانەکانە لە لەشی مرۆڤ". دەڵێت (واتە حذيفة بن اليمان): منیش گووتم: ئەی نێردراوی ألله ئایا من چیبکەم ئەگەر گەیشتمە ئەوکاتە؟. گووتی: "گوێبیست و گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا دەبیت، ئەگەرچی لەپشتت بدات و ماڵەکەت ببات ئەوا هەر گوێبیست و گوێڕایەڵ بە"**».

ئەوەتا ئەی قەومەکەم، نێردراوی ألله پێمانی ڕاگەیاند ئەگەرچی تووشی دەسەڵاتدارێکی ئاوا دڕندە و خراپ بوون ئەوا هەر دەبێ گوێڕایەڵی بکەن مادام حوکم بە شەریعەتی ألله بکات و حوکمە شەرعییەکان پەک نەخات. جا ئەگەر ستەمیشی زۆر توند بوو ئەوا لەسەر موسڵمانانە کە کەسانێکی زانا و خاوەن حیکمەت بنێرنە لای ئەو دەسەڵاتدارە تاکو بەنهێنی قسەی حەقی بۆ بکات و بیترسێنێت، هەروەک نێردراوی ألله –علیه الصلاة والسلام– فەرموویەتی: «**أفضل الجهاد كلمة عدل عند**

(١) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الإمارة > باب الأمر بلزوم الجماعة عند ظهور الفتن، وتحذير الدعاة إلى الكفر > فەرموودەی ژمارە: ١٨٤٧.

**سلطان الجائر**»[1]. واتە: «**باشترین جیهاد بریتییە لە گوفتاری دادپەروەرانە لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار**».

ئەم جۆرەی یەکەمی دەسەڵاتداران سەرەڕای ستەمکارییەکانیان بەڵام هەر لەسەر موسڵمانان واجبە گوێڕایەڵیان بکەن مادام حوکم بە شەریعەتی ألله بکەن.

جۆری دووەم: ئەو دەسەڵاتدارانەن کە موسڵمان نین و حوکم بە شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوت دەکەن و لە هەمان کاتیشدا ستەم لە خەڵکەکە دەکەن. ئەم جۆرە دەسەڵاتدارانە تاغوتپەرست و کافرن، خاکەکەشیان دارولکوفرە بەهۆی ئەوەی کوفری گەورەیان لێ بینراوە و لە خاکەکەشیاندا دروشمەکانی کوفر و شیرک بەبێ هیچ ترسێک دەرکەوتوون. بۆیەش بچووکترین هەڵوێست لەبەرامبەریان ئەوەیە کە تەکفیر بکرێن، ئەگەر هێزیش هەبوو ئەوا دەبێ کوشتاریان بکرێت و لەناو ببرێن، ئەگەریش هێز نەبوو ئەوا دەبێ ئەهلی تەوحید کۆببنەوە و یەکبگرن لەپێناوی کۆکردنەوەی هێزی پێویست بۆ ئەم ئەرکە شەرعییە. ئەگەریش موسڵمانان ئەوەندەیان بۆ نەکرا ئەوا لەسەریان واجبە بیروباوەڕیان ئاشکرا بکەن و بەجۆرەها شێواز قەومەکەیان ئاگاداربکەنەوە لە شەریعەتی ألله؛ تاکو ژمارەی شوێنکەوتەکانی ئەم دەسەڵاتدارە تاغوتپەرستانە کەم بکەنەوە.

هەروەک هاوەڵی پایەدار عبادة بن صامت –رضي الله عنه– باسی پەیمان و بەیعەتی هاوەڵان دەکات بۆ پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– کە ئاوا بووە: «**... بايعنا على السمع والطاعة على منشطنا ومكرهنا، وعسرنا ويسرنا، وأثرة علينا، وأن لا ننازع الأمر أهله، إلا أن تروا كفرا بواحا عندكم من الله فيه برهان**»[2]. واتە: «**... بەیعەتمان دایە پێغەمبەر لەسەر گوێڕایەڵ بوون (بۆ دەسەڵاتدار) لە هەردوو حاڵەتی چالاکیی و**

(١) کتێبی سنن أبي داود > كتاب الملاحم > باب في الأمر والنهي > فەرموودەی ژمارە: ٤٣٤٤.
ئەم فەرموودەیە پلەی صحيح نییە بەڵکو "حسن"ـە.
(٢) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الفتن > باب قول النبي –صلى الله عليه وسلم–: "سترون بعدي أمورا تنكرونها" > فەرموودەی ژمارە: ٧٠٥٦.

**ناخۆشی، هەروەها لە هەردوو حاڵەتی تەنگانە و ئاسوودەیی، وە حەقەکانیان بدەین (ئەمەیە مەبەستی أثرة علینا، والله أعلم)، هەروەها ململانێی کاربەدەستان نەکەین مەگەر کوفرێکی وازح و ڕۆشنیان لێ ببینرێت و لەلایەن ألله بەڵگە هەبێت لەسەر کوفرەکە»**.

**جا لێرەدا کەسانێک دەڵێن:** کاکە ئێمە خۆپیشاندان دەکەین چونکە توانای جیهادمان نییە بۆیەش دەمانەوێ داوای مافەکانمان بکەین بە خۆپیشاندان. ئەوەتا پێغەمبەریش فەرموویەتی: «**من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الإيمان**»[1]. واتە: «**هەر کەسێک لەناو ئێوەدا شتێکی حەڕامکراو و نەشیاوی بینی ئەوا با بەدەستەکانی بیگۆڕێت، ئەگەریش نەیتوانی ئەوا بە زمانی، ئەگەریش نەیتوانی ئەوا بە دڵی، ئەمەش لاوازترینی ئیمانە**».

لە وەڵامی ئەم کەسانە دەڵێین: ئەگەر خۆتان بە موسڵمان دەزانن ئەوا پێویستە سەرەتا لەپێناوی مافەکانی ألله و شەریعەتەکەی و نێردراوەکەی لەماڵەکانتان بێنە دەرەوە بۆ جیهاد کردن، نەک لەپێناوی "نان" و "مووچە" و "خۆشگوزەرانیی". ئەی قەومەکەم، ئێوە تەنها بیرتان لای مووچە و خۆشگوزەرانییە، بۆیەش ئەگەر ژیانتان خۆشبکرێ ئەوا ئەسڵەن گوێ نادەن بە حەقەکانی ألله، ئەسڵەن هەر بیر لەوە ناکەنەوە ئاخۆ شەریعەتی ألله جێبەجێ دەکرێت یاخود نا. بەڵکو خۆم چەندین جار بیستوومە لە چەندین خۆپیشاندەر کە دەڵێن: ئێمە دەمانەوێ دیمۆکراسیەتی ڕاستەقینە جێبەجێ بکرێت!

ئەگەریش کەسێک هەیە کە توانای جیهادی نییە بەڵام دەیەوێت ناڕەزایەتی دەربڕێ لەسەر کوفرەکانی حوکومەت، ئەوا پێی دەڵێم: براکەم، دەبێ لەسەر سوننەتی پێغەمبەران ناڕەزایەتی دەربڕین، نەک بە شێوازی دیمۆکراسیخوازەکان. لە شەریعەتی

---

(١) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الإيمان > باب بيان كون النهي عن المنكر من الإيمان وأن الإيمان يزيد وينقص وأن الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر واجبان > فەرموودەی ژمارە: ٧٨.

أللە هیچ شتێک نییە بەناوی خۆپیشاندان، بەڵکو هەروەکو فەرموودەکەی سەرەوە باسکرا، ئەگەر توانای جیهادت هەبوو ئەوا جیهاد بکە، ئەگەریش توانای جیهادت نەبوو ئەوا بە زمانت بانگەواز بۆ شەریعەتی أللە بکە لە خزمەکانتەوە ئینجا دۆست و دراوسێ و ناسیارەکانت لەسەر بنەمای زانست و حیکمەت، هەروەها لە ڕێگای ئینتەرنێت، ئەگەر ئەوەشت بۆ نەکرا ئەوا لەدڵەوە پێت ناخۆشبێت.

بەڵام ئەگەر تۆ دەتەوێت بەشێوازێکی دوور لە سوننەت و دوور لە مەنهەجی پێغەمبەران نارەزایەتیی دەربڕیت بەرامبەر کوفر، ئەوا واللە سەرکەوتوو نابیت و ڕێگاکەت ناشەرعییە ئەگەرچی نیەتی دڵیشت باش بێت، لە لاپەڕی ٢٤٢ وەڵامی ئەو کەسانەم داوەتەوە کە گوێ نادەن بەوەی کارەکانیان شەرعییە یان نا، تەنها دەڵێن نیەتی دڵمان پاکە!

## بەشی دووەم

# وەڵام و هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر دێمۆکراسیەت و دەنگدان، لەگەڵ وەڵامی گومانەکان

بابەتی یەکەم: گوفتاری زانایانی ئەهلی سوننە لەبارەی حوکم کردن بە شەریعەتە تاغوت و دەستکردەکان.

بابەتی دووەم: دەنگدانی تۆ مانای چی دەگەیەنێت؟

بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

# وەڵام و هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر دێمۆکڕاسیەت و دەنگدان، لەگەڵ وەڵامی گومانەکان

## بابەتی یەکەم: گوفتاری زانایانی ئەهلی سوننە لەبارەی حوکم کردن بە شەریعەتە تاغوت و دەستکردەکان.

بەدرێژایی بەشی یەکەم –بەفەزڵی أللە– شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوتم ناساند لەگەڵ بنچینە و دروشمەکانی، هەروەها هەڵسەنگاندنمان بۆی کرد لەسەر بنەمای شەریعەتە پاک و بێگەردەکەی پەروەردگارمان، لەسەر بنەمای قورئان و سوننە. ئیتر بەتەواویی ڕوون بوویەوە کە دێمۆکڕاسیەت شەریعەتێکی تاغوتە و پێویستە موسڵمان کوفری پێ بکات، هەروەها کوفر بەو کەسانەش بکات کە باوەڕیان بە دێمۆکڕاسیەتە؛ چونکە حوکمی تاغوت ئەوەیە کە دەبێت کوفری پێ بکرێت. ئەمەش لە لاپەڕی ٧ ڕوون کرایەوە.

لەم بابەتەدا بۆ زۆرتر سەلماندنی گوفتارەکانم، ئیتر هەڵساوم بە کۆکردنەوەی گوفتاری ژمارەیەکی زۆر لە زانایە ناودار و تەقوادارەکانی ئەهلی سوننە –رحمهم الله– لەبارەی حوکم کردن بە شەریعەتە تاغوتەکان؛ ئەمەش چونکە گوفتاری زانایان زۆرتر دەیسەلمێنێ من لەسەر بنەمایەکی حەق بانگەوازتان دەکەم بە فەزڵی أللە.

فەرموون ئێوە و گوفتاری زاناکان:

**یەکەم: ئیمامی أبو یعلی بن الفراء -رحمه الله- (ساڵی ٤٥٨ ی هیجری مردووە):**

ئیمامی أبو یعلی الفراء دەڵێت: «**ومن اعتقد تحليل ما حرم الله بالنص الصريح، أو من رسوله صلى الله عليه وسلم أو أجمع المسلمون على تحريمه فهو كافر، كمن أباح شرب الخمر ومنع الصلاة والصيام والزكاة، وكذلك من اعتقد تحريم شيء حلله الله أو أباحه بالنص الصريح أو أباحه رسوله صلى الله عليه وسلم مع العلم بذلك فهو كافر**»[1].

واتە: «**هەر کەسێک باوەڕی بە حەلاڵ کردنی ئەو شتانە هەبێت کە ألله حەڕامی کردوون بە وازحی، یاخود نێردراوەکەی -صلى الله عليه وسلم- حەڕامی کردووە یاخود ئیجماعی موسڵمانان لەسەر حەڕامیەتی شتەکە هەبێت، ئەوا ئەو کەسە کافرە، بۆ نموونە ئەو کەسەی ئارەق خواردنی بەلاوە ئاساییە ئەگەر بخورێتەوە یان نا، یاخود ئەو کەسەی ڕێگریی لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات بکات، بەهەمان شێوە ئەو کەسەی باوەڕی بە حەڕام کردنی ئەو شتانە هەبێت کە ألله حەلالی کردوون یاخود موباحی کردوون بە وازحی یاخود لەڕێگای نێردراوەکەی -صلى الله عليه وسلم- سەرەڕای ئەوەی زانستیشی هەیە ئەوا ئەو کەسە کافرە**».

گوفتارەکەی ئەم ئیمامە پایەدارە -رحمه الله- ڕوونە کەوا ئەگەر کەسێک حەڕامکراوێک حەلاڵ بکات یاخود بەپێچەوانەوە، ئەوا گومان لە کافر بوونەکەی نییە بەو مەرجەی ئاگاداری حوکمەکەی بێت لە ئیسلام.

**جا لەوانەیە کەسانێک بیانوو (عذر) بۆ دەسەڵاتدارە تاغوتپەرستەکان بهێننەوە و بڵێن:** کاکە ئەمانە لەوانەیە نەزانن دیمۆکڕاسیەت تاغوتە! بۆیەش بیانووی "جەهل" دەیانگرێتەوە.

لە وەڵامدا دەڵێم: هەر حوکمێک کە لە قورئاندا باسکرابوو ئەوا بە گەیشتنی قورئان بۆ شوێنەکە ئیتر بیانوو بۆ خەڵکەکە نییە ئەگەر لێکۆڵینەوە لە قورئان نەکەن و

---

(١) کتێبی المعتمد في أصول الدين > بەرگی یەکەم > لاپەڕی ژمارە: ٢٧١.

نەزانن حەلال و حەڕامەکان چین؛ چونکە ئیتر قورئانیان لەبەردەستە و توانای فێربوونیان هەیە بەڵام خۆیان هەوڵی بۆ نادەن، ئەمەش یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام.

بۆیەش دەپرسم: ئایا لە خاکی کوردستاندا عیلمی شەرعیی بەردەست نییە؟! قورئان و تەفسیرەکانی بەردەست نین؟! توانای بەدەستهێنانی زانستی شەرعیی نییە؟!

بێگومان بەردەستن، ئەسڵەن بە کەمتر لە پێنج هەزار دینار دەتوانیت بەشدار بیت لە ئۆفەری ئینتەرنێتی ڕۆژانەی بێسنوور، بەمەش دەتوانیت لەماوەی ٢٤ کاژێردا کتێبی قورئانی پیرۆز و دەیان کتێبی تەفسیر و کتێبی عەقیدەی ئەهلی سوننە دابەزێنی بەشێوەی کتێبی ئەلیکترۆنی (PDF) بەبێ ئەوەی تەنانەت پێویست بەوە بکات لەماڵەکەشت بڕۆیتە دەرەوە!! کەوابێ ئایا هیچ عوزر و بیانوویەک بۆ ئەم دەسەڵاتدارانە ماوەتەوە لەبەردەم تەکفیر نەکردنیان لەکاتێکدا دژی شەریعەتی أللە ن و توانای بەدەستهێنانی زانستیشیان هەیە؟! ناواللە هیچ بەربەستێکیان لەپێش نییە، بەڵکو بە حەز و خواستی خۆیان دژایەتی شەریعەتی أللە دەکەن و حوکم بە شەریعەتی تاغوت دەکەن.

**دووەم: ئیمامی النووي -رحمه الله- (ساڵی ٦٧٦ ی هیجری مردووە):**

ئیمامی نەوەوی لە شەڕحەکەی بۆ کتێبی "صحيح مسلم" باسی ئەو فەرموودەیە دەکات کە تێیدا پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمانمان پێدەکات گوێڕایەڵی دەسەڵاتدارە خراپەکان بین، ئیتر ئیمام نەوەوی دەفەرموێت: «**فأمر النبي -صلى الله عليه وسلم- بطاعة ولي الأمر ولو كان بهذه الخساسة ما دام يقودنا بكتاب الله تعالى. قال العلماء: معناه ما داموا متمسكين بالإسلام والدعاء إلى كتاب الله تعالى على أي حال كانوا في أنفسهم وأديانهم وأخلاقهم**»(١).

واتە: «**نێردراوی أللە -صلى الله عليه وسلم- فەرمانی کرد بە گوێڕایەڵی کردنی وەلی ئەمر ئەگەرچی بەم ئاستەش بێ نرخ بێت، مادام حوکمڕانی خەڵک بکات بە کتێبەکەی أللە، جا زانایانیش دەڵێن: مادام ئەم وەلی ئەمرانە دەستیان گرتووە بە شەریعەتی ئیسلام و بانگەواز بۆ کتابی أللە ئەکەن ئەوا دەبێ گوێڕایەڵی بکرێن بەبێ ئەوەی گوێ بدرێت بە حاڵ و دین و ڕەوشتیان**».

کەواتە تا ئەو کاتە گوێڕایەڵی دەسەڵاتدار دەکرێت و بە موسڵمان دەزانرێت ئەگەر حوکم بە شەریعەتی أللە بکات و ڕێگریی لە دروشمەکانی تاغوت و کوفر و شیرک بگرێت، ئەگەرچی خودی دەسەڵاتدارەکە پیاوێکی زیناکای بەدڕەوشتیش بێت. هەربۆیەش ئەم ئیمامە -رحمه الله- لەبارەی حجاج دەڵێت: «**وحجة الجمهور أن قيامهم على الحجاج ليس بمجرد الفسق بل لما غير من الشرع وظاهر من الكفر**»(٢).

واتە: «**بەڵگەی جمهور کەوا هەڵسانەوە لە حجاج تەنها لەبەر تاوان (فسق) نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە شەریعەتی گۆڕی و کوفری پیشاندا**».

تەنانەت گوفتاری قاضي عياض -رحمه الله- نەقڵ دەکات بۆمان کە ئەویش ئیجماعی زانایانی ئەهلی سوننەی باسکردووە لەبارەی دەسەڵاتدارێک کە شەریعەتی

---

(١) کتێبی صحيح مسلم بشرح النووي > كتاب الحج > باب إستحباب رمي الجمرة العقبة يوم النحر راكبا.
(٢) کتێبی صحيح مسلم بشرح النووي > كتاب الإمارة > باب وجوب الطاعة الأمراء في غير معصية.

ألله دەگۆڕێت بۆ شەریعەتێکی دەستکرد، هەروەک ئیمام نەوەوی فەرموویەتی: «**قال القاضي عياض أجمع العلماء على أن الإمامة لا تنعقد لكافر وعلى أنه لو طرأ عليه الكفر انعزل قال وكذا لو ترك إقامة الصلوات والدعاء إليها قال وكذلك عند جمهورهم البدعة قال وقال بعض البصريين تنعقد له وتستدام له لأنه متأول قال القاضي فلو طرأ عليه كفر وتغيير للشرع أو بدعة خرج عن حكم الولاية وسقطت طاعته ووجب على المسلمين القيام عليه وخلعه ونصب إمام عادل إن أمكنهم ذلك**»[1].

واتە: «**قاضي عياض دەڵێت: زانایان کۆڕان لەوەی دەسەڵاتداریی بۆ کافر نابێت، ئەگەر دەسەڵاتدار کوفری ئەنجامدا ئەوا دەسەڵاتی لێ دەسەنرێتەوە. هەروەها قاضي عياض دەڵێت: بەهەمان شێوە ئەگەر دەسەڵاتدارەکە ئەنجامدانی نوێژی تەرک کرد یاخود بانگەوازی بۆ ئەنجامدانی نوێژ نەکرد (واتە پێی کافر دەبێت). هەروەها قاضي عياض دەڵێت: هەندێک لە زانایانی بەسرا (البصرة) دەڵێن کەوا بەیعەت و دەسەڵاتی پێدەدرێت چونکە تەئویلی هەیە.هەروەها قاضي عياض دەڵێت: خۆ ئەگەر کوفری لێ بینرا و شەریعەتی گۆڕی و بیدعەی ئەنجامدا ئەوا حوکمی دەسەڵاتدارێتییەکەی هەڵدەوەشێتەوە و هیچیتر گوێڕایەڵی ناکرێت و واجبە لەسەر موسڵمانان کە لێی هەڵسنەوە و لایبەرن و دەسەڵاتدارێکی دادپەروەر بهێننە شوێنی ئەگەر توانایان هەبوو**».

(١) کتێبی صحيح مسلم بشرح النووي > كتاب الإمارة > باب وجوب الطاعة الأمراء في غير معصية.

**سێیەم: شێخی ئیسلام، إبن تیمیة -رحمه الله- (ساڵی ٧٢٨ ی هیجری مردووە):**

شێخی ئیسلام لەبارەی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان نییە بە حوکمڕانی کردن بە شەریعەتی ألله، دەفەرمووێت: «**ولا ريب أن من لم يعتقد وجوب الحكم بما أنزل الله على رسوله فهو كافر، فمن استحل أن يحكم بين الناس بما يراه هو عدلا من غير اتباع لما أنزل الله فهو كافر؛ فإنه ما من أمة إلا وهي تأمر بالحكم بالعدل، وقد يكون العدل في دينها ما رآه أكابرهم، بل كثير من المنتسبين إلى الإسلام يحكمون بعاداتهم التي لم ينزلها الله سبحانه وتعالى، كسوالف البادية، وكأوامر المطاعين فيهم، ويرون أن هذا هو الذي ينبغي الحكم به دون الكتاب والسنة.**

**وهذا هو الكفر، فإن كثيرا من الناس أسلموا، ولكن مع هذا لا يحكمون إلا بالعادات الجارية لهم التي يأمر بها المطاعون، فهؤلاء إذا عرفوا أنه لا يجوز الحكم إلا بما أنزل الله فلم يلتزموا ذلك، بل استحلوا أن يحكموا بخلاف ما أنزل الله فهم كفار، وإلا كانوا جهالا**»[1].

واتە: «**گومان لەوە نییە کە هەر کەسێک باوەڕی بە واجبێتی حوکمکردن بەوە نەبێت کە ألله دایبەزاندووەتە سەر نێردراوەکەی ئەوا کافرە، هەر کەسێکیش ئەوە بە حەلاڵ دابنێت کەوا حوکم بەجۆرێکی تر بکات کە بەلایەوە دادپەروەرییە بەبێ ئەوەی شوێنی ئەوە بکەوێت کە دابەزیوە (واتە قورئان) ئەوا کافرە؛ چونکە هیچ ئوممەتێک نییە و ئیللا هەوڵدەدات حوکمڕانی بە دادگەرییەوە بکات، دادگەریش لە سیستەم و دینی ئەواندا بریتییە لە بیروڕای سەرکردەکانیان. بەڵکو زۆرێک لەوانەی خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام حوکم بەو دابونەریتانە دەکەن کەوا ألله -سبحانه وتعالى- داینەبەزاندووە، وەکو پێشینە گوندنشینەکان، یاخود وەکو ئەو فەرماندانەی کەوا پێویستە گوێڕایەڵیان بن، هەروەها وای دەبینن کە پێویستە حوکم بەمە بکرێت لەبری کتێبەکەی ألله و سوننەت.**

(١) کتێبی منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة القدرية > بەرگی پێنجەم > لاپەڕی ژمارە: ١٣٠.

**ئەمەش کوفرە، بەڕاستی زۆرێک لە خەڵک تەسلیم بوونە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوکم ناکەن ئیللا بە دابونەریتەکانیان نەبێ کە دەسەڵاتدارانیان فەرمانیان پێدەکەن، جا ئەمانە کاتێک زانیان کەوا نابێ حوکم بکرێت بە غەیری ئەوەی ألله دایبەزاندووە کەچی هەر پابەند نەبوون و بەڵکو بە حەلالیان زانی کە حوکم بە غەیری ئەوە بکەن کە ألله دایبەزاندووە ئەوا کافرن، ئەگینا جاهیلن»**.

**جا لێرەدا دەکرێت کەسانێک بڵێن:** ئەوەتا شێخ إبن تیمیة پێی وایە نابێ یەکسەر ئەو کەسانە تەکفیر بکرێن کە حوکم بە شەریعەتی ألله ناکەن، بەڵکو ئەوەتا بیانووی "جەهل" ی بۆیان هێنایەوە چونکە دەکرێ ئاگایان لە دینی ألله نەبێت.

لە وەڵامدا دەڵێم: بەڵێ ئەگەر کەسێک تازە بووبێتە موسڵمان یاخود لە ناوچەیەک بژیەت کە دووربێت لە زانستی شەرعیی، ئەوا ئەو کەسە بیانووی "جەهل" دەیگرێتەوە و یەکسەر تەکفیر ناکرێت، بەڵام ئەگەر کەسێک خۆی بەلاوە موسڵمان بێت و لەناو جەرگەی خاکی موسڵمانان بێت و بە ئاسانیی دەستی بگاتە قورئان و زانستی شەرعیی کەچی هەر سوور بێت لەسەر حوکم کردن بە شەریعەتێکی تاغوت ئەوا ئەو کەسە هەرگیز عوزری "جەهل" نایگرێتەوە؛ چونکە ئەو کەسە خۆی پشتی لە زانستی شەرعیی هەڵکردووە و ئینکاریی لێدەکات و نایهەوێت فێربێت. کەواتە کەوتووەتە ناو هەڵوەشێنەرەوەیەکی ئیسلام، کە ئەویش بریتییە لە: هەوڵ نەدان بۆ بەدەستهێنانی زانستی شەرعیی لەکاتێکدا توانای بەدەستهێنانی هەبێت. هەروەک ألله فەرموویەتی: **{ومن أظلم ممن ذكر بئايات ربه ثم أعرض عنها إنا من المجرمين منتقمون}**[1]. واتە: {جا کێ لەوە ستەمکارترە کە ئایاتەکانی پەروەردگاری خرابێتە یاد و ئینجا پشتی لێ بکات؟ ئێمە تۆڵەسێنەرین لە تاوانباران}.

هەروەها شێخ إبن تیمیة –رحمه الله– دەڵێت: «**والإنسان متى حلل الحرام –المجمع عليه– أو حرم الحلال –المجمع عليه– أو بدل الشرع –المجمع عليه– كان**

(١) سورەتی السجدة، ئایەی ٢٢.

**كافرا مرتدا باتفاق الفقهاء**»[1]. واته: «**مرۆڤ هەرکاتێک حەرامێک حەلال بکات کە زانایان هاوڕان لەسەر حەرامێتییەکەی، یاخود حەلالێک حەرام بکات کە زانایان هاوڕان لەسەر حەلالێتییەکەی، یاخود حوکمێکی شەریعەت بگۆڕێت کەوا زانایان هاوڕان لەسەری، ئەوا ئەو کەسە کافرێکی موڕتەدە بە کۆڕای زانایان**».

هەروەها کاتێک لەبارەی مەغۆلەکان پرسیارکرا لە شێخ إبن تیمیة کە گوایە مەغۆلەکان شایەتومان دەهێنن و دەڵێن ئێمە باوەڕمان بە ئیسلام هەیە بەڵام حوکم بە یاسق دەکەین نەک شەریعەتی ئیسلام. لە وەڵامدا إبن تیمیة فەرمووی: «**كل طائفة ممتنعة عن التزام شرائع الإسلام الظاهرة المتواترة من هؤلاء القوم أو غيرهم فإنه يجب قتالهم حتى يلتزموا شرائعه، وإن كانوا مع ذلك ناطقين بالشهادتين وملتزمين بعض شرائعه، كما قاتل أبو بكر والصحابة رضى الله عنهم مانعي الزكاة**»[2]. واته: «**هەموو ئەو کۆمەڵانەی کە ڕێگریی دەکەن لە پابەند بوون بە دروشمەکانی شەریعەتی ئیسلام جا لە قەومی مەغۆلەکان بن یان هەر قەومێکی تر، ئەوا پێویستە کوشتاریان بکرێت تاکو پابەند دەبن بە دروشمەکانی شەریعەت، ئەگەرچی شایەتومان بهێنن و پابەندی بەشێکی شەریعەتی ئیسلام بن، هەروەک چۆن أبو بکر و هاوەڵان هەڵسان بە کوشتاری ئەوانەی زەکاتیان نەدەدا**».

بێگومان ڕووداوەکەی خەلیفەی باوەڕداران أبي بكر الصديق –رضي الله عنه– ڕوون و ئاشکرایە، کاتێک کۆمەڵێک لەوانەی خۆیان بە موسڵمان دەزانی و تەوحیدیان هەبوو و جیهادیان دەکرد و نوێژکەر و ڕۆژووگریش بوون، بەڵام تەنها لەبەر ئەوەی ڕازی نەبوون بە پێدانی زەکات، بۆیەش ئیتر تەکفیر کران و کوشتاریان کرا لەلایەن أبي بكر الصديق، هەروەک لەبارەیانەوە فەرمووی: «**والله لأقاتلن من فرق بين الصلاة**

(١) کتێبی مجموع الفتاوى > بەرگی سێیەم > فصل: فيما قاله المؤلف للطيبرسي رسول نائب السلطان > دفع ما احتجت به الجهمية على نفي العلو.

(٢) کتێبی الكلمات النافعة في المكفرات الواقعة > لاپەڕی ژمارە: ٣٤٣.

**والزكاة**»[1]. واتە: «**والله کوشتاری هەر کەسێک دەکەم کە جیاوازیی بخاتە نێوان نوێژ و زەکات**».

ئەوانەی زەکاتیان نەدەدا پابەندی هەموو شتێکی ئیسلام بوون تەنها زەکات نەبێ، بەڵام هەر کوشتاریان کرا لەلایەن خەلیفەی موسڵمانان أبي بکر الصديق، ئیتر دەبێ حوکم ئەم دێمۆکڕاسیخواز و تاغوتپەرستانەی ئێستا چۆن بێت کە ئەسڵەن باوەڕیان بە هیچ حوکمێکی ئیسلام نییە و دژایەتیی شەریعەتی ألله دەکەن؟! هاوار بۆ حاڵی ئەو کەسەی مومارەسەی دروشمەکانیان دەکات و باوەڕیان پێدەکات و خۆشەویستی بۆ ئەم دێمۆکڕاسیخوازانە هەیە.

تەنانەت شێخی ئیسلام –رحمه الله– لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوەی زۆرتر دەدات و ڕێک دەڵێی باسی ئەم دێمۆکڕاسیخوازانە دەکات، دەفەرمووێت: «**فأيما طائفة ممتنعة امتنعت عن بعض الصلوات المفروضات أو الصيام أو الحج أو عن التزام تحريم الدماء والأموال أو الخمر أو الزنا أو الميسر أو نكاح ذوات المحارم أو عن التزام جهاد الكفار أو ضرب الجزية على أهل الكتاب أو غير ذلك من التزام واجبات الدين أو محرماته التي لا عذر لأحد في جحودها أو تركها والتي يكفر الواحد بجحودها. فإن الطائفة الممتنعة تقاتل عليها وإن كانت مقرة بها، وهذا مما لا أعلم فيه خلافا بين العلماء**»[2].

واتە: «**جا هەر کۆمەڵەیەک ڕێگریی لە نوێژە فەڕزەکان بکات یاخود ڕۆژووگرتن یاخود حەج، یاخود پابەند نەبێت بە حەڕامکردنی ڕژانی خوێن بە ناحەق، هەروەها پابەند نەبێت بە حەڕامکردنی ئارەق و داوێنپیسی و قومار و هاوسەرگیری مەحرەمەکان، یاخود پابەند نەبێت بە کوشتاری کافران و وەرگرتنی سەرانە لە ئەهلی کیتاب (گاور و جولەکە) یاخود پابەند نەبێت بە هەر واجب و حەڕامکراوێکی ئەم دینە کەوا هیچ بیانووی تێدا نییە بۆ هیچ کەسێک ئەگەر پێی پابەند نەبوو و هەروەها پێی کافر دەبێت. لەم حاڵەتەدا**

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الزكاة > باب وجوب الزكاة > فەرموودەی ژمارە: ١٣٩٩ و ١٤٠٠.
(٢) کتێبی الكلمات النافعة في المكفرات الواقعة > لاپەڕی ژمارە: ٣٤٣.

**پێویسته ئەم کۆمەڵەیە کوشتاریان بکرێت ئەگەرچی دان بنێن بە واجبێتی و حەڕامێتی شتەکان، ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە هیچ خیلافێکی لێ نابینم لەنێوان زانایان»**.

وەک بینیتان، شێخ إبن تیمیة –رحمه الله– لەم فەتوایەدا پێمان ڕادەگەیەنێت کە هیچ جیاوازییەک لەنێوان زانایانی ئیسلام نەبووە لە سەردەمی ئەودا لەبارەی هەر کەسێک یان هەر کۆمەڵەیەک کەوا لە حوکمڕانیکردن پابەند نەبن بە حەلال و حەڕامەکان، تەنانەت ئەگەر دانیشی پێدا بنێن و بڵێن دەزانین حەلالەکان حەلالن و حەڕامەکانیش حەڕامن، ئەوا هەر کافرن مادام حوکمەکەیان پەکخست لە حوکمڕانیی.

هەروەها دەڵێت: «**الشرع المنزل من عند الله تعالى وهو الكتاب والسنة الذي بعث الله به رسوله؛ فإن هذا الشرع ليس لأحد من الخلق الخروج عنه ولا يخرج عنه إلا كافر**»[1].

واتە: «**شەریعەتی دابەزێندراو لەلایەن ألله -تعالى- کە بریتییە لەو قورئان و سونەتەی کەوا ألله هەڵسا نێردراوەکەی پێ نارد، هیچ کەسێکیش لەناو خەڵکیدا بۆی نییە لەم شەریعەتە بچێتە دەرەوە، هیچ کەسێکیش لێی ناچێتە دەرەوە جگە لە کافر**».

منیش دەڵێم: ئەگەر مرۆڤ بەهۆی دەرچوون لە شەریعەتی ألله کافر ببێ، ئیتر دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە شەریعەتێکی دەستکرد دادەڕێژێت کەوا لە دەیان خاڵدا دژی شەریعەتی ألله یە؟! بێگومان ئەو کەسە کافرترە. ئەی دەبێ حاڵی ئەو بەناو موسڵمانە چۆن بێت کە پشت لە شەریعەتی ألله دەکات و مومارەسەی شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکە دەکات؟!

(١) کتێبی مجموع الفتاوى > بەرگی یازدەهەم > الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان > حديث "اجتمع آدم وموسى" ضل فيه فريقان.

**چوارەم: إبن القیم -رحمه الله- (ساڵی ٧٥١ ی هیجری مردووە):**

شێخ إبن القیم (کە قوتابی إبن تیمیة بووە) -رحمهما الله-، لەبارەی ئەو کەسانەی کە حوکم بە شەریعەتە دەستکردەکان دەکەن، دەڵێت: «**ثم أخبر سبحانه أن من تحاكم أو حاكم إلى غير ما جاء به الرسول فقد حكم الطاغوت وتحاكم إليه**»[١]. واتە: «**پاشان أللە -سبحانە- ڕایگەیاندووە کەوا هەر کەسێک حوکمڕانی بکات یاخود دادگەرێتی بگەڕێنێتەوە بۆ لای غەیری ئەوەی کەوا بۆ نێردراوەکە (واتە پێغەمبەر) هاتووە، ئەوا بێگومان حوکمی بە تاغوت کردووە و دادگەرێتی بۆ لای تاغوت گەڕاندووەتەوە**».

هەروەها شێخ إبن القیم -رحمه الله- حوکمی "دارولکوفر" بەسەر ئەو خاکانە دەدات کەوا بە شەریعەتی ئیسلام حوکمڕانیان تێدا ناکرێت، گوفتارەکەیشی تەنها هی خۆی نییە بەڵکو گوفتاری زۆرینەی زانایانی ئەهلی سوننەی نەقڵ کردووە بۆمان، هەروەک دەفەرمووێت: «**قال الجمهور: دار الإسلام هي التي نزلها المسلمون وجرت عليها أحكام الإسلام، وما لم تجر عليه أحكام الإسلام لم يكن دار إسلام وإن لاصقها، فهذه الطائف قريبة إلى مكة جدا ولم تصر دار إسلام بفتح المكة، وكذلك الساحل**»[٢].

واتە: «**جمهوری زانایان دەفەرموون: دارولئیسلام ئەو خاکەیە کە موسڵمانان چوونەتە ناوی و ئەحکامەکانی ئیسلامی لەسەردا جێبەجێ دەکرێت، بەڵام هەر خاکێک ئەحکامەکانی ئیسلامی لەسەر جێبەجێ نەکرێت ئەوا نابێتە دارولئیسلام ئەگەرچی لکابێت بە دارولئیسلامێکەوە، ئەوەتا ناوچەی طائف زۆر نزیک بوو لە مەککە بەڵام هەر نەبووە دارولئیسلام لەکاتی فەتحی مەککە، بەهەمان شێوە ناوچەی ساحل**».

ئەی قەومەکەم، ئەگەرچی بابەتی دارولئیسلام و دارولکوفر بابەتێکی جیاواز و سەربەخۆیە، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە کە چاک بزانن لە هەر خاکێکدا شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوتی وەکو "دیمۆکراسیەت" حوکمڕانی پێکرا و حەلال و

---

(١) کتێبی إعلام الموقعين عن رب العالمين > بەرگی یەکەم > المتحاكمون إلى الطاغوت > لاپەڕی ژمارە: ٩٢.
(٢) کتێبی إعلام الموقعين عن رب العالمين > بەرگی یەکەم > المتحاكمون إلى الطاغوت > لاپەڕی ژمارە: ٩٢.

حەڕامەکانی ئیسلام پەکخران و شەریعەتی ئیسلامیش خراپە ژێرپێ و کوفر و شیرکی گەورە لە خاکەکەدا بینرا ئەوا خاکەکە دارولکوفرە.

ئەی قەومەکەم، ببینن شێخ إبن القیم –رحمه الله– چۆن باسی سەرئەنجامی پشت کردن لە شەریعەتی ألله دەکات، ببینن و خۆتان بڕیار بدەن کە ئاخۆ ئێوە ئەمڕۆ تووشی هەمان حاڵەت بوونەتەوە یاخود نا. ئەو دەفەرمووێت: «**لما أعرض الناس عن تحكيم الكتاب والسنة والمحاكمة إليهما واعتقدوا عدم الاكتفاء بهما وعدلوا إلى الآراء والقياس والاستحسان وأقوال الشيوخ عرض لهم من ذلك فساد في فطرهم وظلمة في قلوبهم وكدر في أفهامهم ومحق في عقولهم وعمتهم هذه الأمور وغلبت عليهم حتى ربي فيها الصغير وهرم عليها الكبير فلم يروها مكرا فجاءتهم دولة أخرى قامت فيها البدع مقام السنن والنفس مقام العقل والهوى مقام الرشد والظلال مقام الهدى والمنكر مقام المعروف والجهل مقام العلم والرياء مقام الإخلاص والباطل مقام الحق والكذب مقام الصدق والمداهنة مقام النصيحة والظلم مقام العدل**»[(١)].

واتە: «**کاتێک خەڵک پشتیان هەڵکرد لە قورئان و سوننەت، هەروەها پشتیان کرد لەوەی حوکمی بۆ بگەڕێننەوە، هەروەها باوەڕیان بەوە بوو کە قورئان و سوننەت بەس نین، هەروەها ڕوویان کردە بیروڕا و قیاس و گوفتاری شێخەکان. ئەوا ئیتر فەساد و خراپەکاریی لە فیترەت و ناخیان پەیدابوو، هەروەها تاریکیی لەنێو دڵەکانیان پەیدا بوو، هەروەها تێگەیشتنیان ناڕوون بوو، هەروەها بیرکردنەوە و عەقڵیان لەناو چوو. ئیتر ئەم بابەتە هەموویانی گرتەوە و ئیتر مرۆڤە بچووکەکان پایەدار کران و مرۆڤە گەورەکانیش بێ توانا کران، ئیتر دەوڵەتێکی تر هات و نوێکاریی و بیدعەی لەناویاندا چەسپاند لەبری سوننەتەکان، هەروەها ئارەزووی خستە جێگەی عەقڵ و بیرکردنەوە، هەروەها هەوا و حەزی خستە جێگەی بەرپرسیاریەتی، هەروەها سێبەر و تاریکیی خستە جێگەی هیدایەت، هەروەها خراپەکاریی خستە جێگەی چاکەکاریی، هەروەها نەزانینی خستە جێگەی زانست، هەروەها ناحەقی خستە جێگەی حەق، هەروەها درۆی خستە جێگەی**

(١) کتێبی الفوائد > آثار الإعراض عن تحكيم الكتاب والسنة > لاپەڕی ژمارە: ٦٥.

**ڕاستبێژیی، هەروەها خۆ بێدەنگ کردنی خستە جێگەی ئامۆژگاری کردن، هەروەها ستەمی خستە جێگەی دادوەریی**».

کاتێک سەیری گوفتارەکەی شێخ إبن القیم –رحمه الله– دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە هەرکاتێک موسڵمانان پشتیان لە شەریعەتی ألله کرد و ڕوویان لە شەریعەتە تاغوتەکان کرد ئەوا ئیتر ئەم گۆڕانکارییانە لە نەفس و کۆمەڵگایان ڕوودەدات:

١- دڵیان ڕەش دەبێت و حەق و ناحەق لە یەکتر جیا ناکەنەوە.

٢- ئەهلی تەوحید بە دوژمنی خۆیان دەزانن و ئەهلی کوفر و شیرکیش بە دۆست و برای خۆیان دەزانن، وە داوا لە ئەهلی کوفر دەکەن تاکو هاوکاریان بکەن بۆ لەناوبردنی ئەهلی تەوحید.

٣- مرۆڤی نەشیاو و هیچ و پووچ دەکرێتە خاوەن پلەی بەرز و ڕێزی لێ دەگیرێ، مرۆڤی شیاو و ڕێزدار و ئەهلی خیبرە و تەقواداریش پلەی نزم دەکرێت و بە چاوێکی خراپ و کۆنەپەرست و سەیری دەکرێت.

٤- لە خاکەکەدا هێواش هێواش زانستە شەرعییەکان (هەروەها دونیاییەکانیش) دەسڕێنەوە و مەلایە دینفرۆشەکان زۆر دەبن و ئیتر خەڵکەکە حەق و ناحەقیان لێ تێکەڵ دەبێت و لەناو خاکەکەدا دروشمەکانی شیرک و کوفر و بیدعە سەرهەڵدەدەن، هەروەها دروشمەکانی تەوحید و ئیمان و وەلائوبەڕاء و سوننەت دژایەتیی دەکرێن.

٥- لەنێو کۆمەڵگاکەدا مرۆڤە لەخواترس و تەقوادار و ئەمینەکان کەم دەبنەوە و ئیتر مرۆڤە شەهوەتباز و خائین و درۆزن و ناپاک و دونیاپەرست و فێڵبازەکان زۆر دەبن و ئیتر هێواش هێواش کەس متمانەی بە کەس نامێنێ و هیچ مانایەک بۆ دۆستایەتیی و هاوڕێیەتیی و خزمایەتیی و برایەتیی نامێنێت.

٦- لەنێو کۆمەڵگاکەدا ڕاستەوخۆ جورئەت و مەردایەتی دەسڕێتەوە و موسڵمانانیش دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەم کۆمەڵگایە گومڕایە، بۆیەش ئیتر لەپێش چاوی موسڵمانان و زاناياندا کوفر و تاوان و شیرک ئەنجام دەدرێن بەڵام خۆیان بێدەنگ دەکەن و دەڵێن کاکە ئێمە ناوێرین قسەی حەق بکەین با تووشی بەڵایەک نەبین. ئیتر زۆرتر خەڵکەکە لەنێو ئەم کوفر و شیرکانە مەلە دەکەن و کەسیش نامێنێ دوو قسەی حەقیان بۆ بکات، خۆ ئەگەر بانگخوازێکی مەردیش پەیدابێ ئەوا هەر خەڵکەکە دژایەتی دەکەن و دەنگی کپ دەکەن.

٧- دادپەروەریی لە خاکەکە دەسڕێتەوە و زوڵم و سەرپێچی سەرهەڵدەدات و ئیتر چینێکی کۆمەڵگا ئازاد و خاوەن هێز دەبن و حیساب بۆ کەس ناکەن و تەنانەت سنووری یاسایە تاغوتییەکانیش دەبەزێنن و ستەم لە خەڵک دەکەن و حوکومەتە تاغوتپەرستەکەش پاڵپشتیان دەکات و ڕێگایان بۆ خۆش دەکات، چینەکەی تری کۆمەڵگاش بەتەواویی لاواز دەکرێن و نابێ هیچ هەڵەیەک بکەن و دەبێ پابەندی یاسایە کوفرینەکان بن.

ئەی قەومەکەم، لێتان دەپرسم: مەگەر دانە بە دانەی ئەم خاڵانە بە زەقی نابینرێن لەنێوتان؟ ئەگەر دەڵێن "بەڵێ"، ئەوا چاک بزانن ئێوە پشتتان لە شەریعەتی ألله کردووە و کۆمەڵێک مرۆڤتان کردووەتە خودا و دەنگیان پێدەدەن و پەنجەی شایەتومانی خۆتان مۆر دەکەن بۆیان، ئەوانیش بە یاسا تاغوتییەکان حوکمڕانیتان دەکەن، بەمەش دڵنیا بن ڕۆژ لە ڕۆژ حاڵتان خراپتر و خراپتر دەبێت تاوەکو تەسلیمی ألله نەبنەوە.

**پێنجەم: إبن كثير -رحمه الله- (ساڵی ٧٧٤ ی هیجری مردووە):**

شێخ إبن كثير (ئەویش قوتابی شێخ إبن تيمية بووە) -رحمهما الله- گوفتاری گرینگی هەیە لەبارەی حوکمی شەریعەتە تاغوتەکان و هەروەها حوکمی ئەو دەسەڵاتدارە تاغوتپەرستانەی کە حوکمڕانی دەکەن بە شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکان.

شێخ إبن كثير لەبارەی ئەو کەسانەی کە دادگەرێتیان بۆ لای یاسق[١] دەگەڕاندەوە دەفەرمووێت: «**فمن ترك الشرع المحكم المنزل على محمد بن عبد الله خاتم الأنبياء وتحاكم إلى غيره من الشرائع المنسوخة كفر، فكيف بمن تحاكم إلى الياسا وقدمها عليه؟ من فعل ذلك كفر بإجماع المسلمين**»[٢].

واتە: « **هەر کەسێک ئەو شەریعەتە حاکم و دابەزێنراوە تەرک بکات کە دابەزیوەتە سەر محمد کوڕی عبدالله ی کۆتایی پێغەمبەران، وە ئیتر حوکمڕانیی بگەڕێنێتەوە بۆ یەکێک لە شەریعەتە مەنسوخ و هەڵوەشێندراوەکان ئەوا کافر بووە، ئەی چی بۆ حاڵی ئەو کەسەی حوکم بگەڕێنێتەوە بۆ لای "الياسا" و بیخاتە پێش ئیسلام؟! هەر کەسێک وابکات ئەوا بە ئیجماعی موسڵمانان کافر بووە**».

ئەی قەومەکەم، ئەگەر باوەڕتان بە منیش نییە خۆ ئەوەتا ئەمە شێخ إبن كثير وای فەرمووە، ئەو زانایەی کە تەفسیرەکەی یەکێکە لە بەهێزترینی تەفسیرەکان، ئەو

---

(١) یاسق یاخود یساق یاخود یاسا: بریتی بوو لە دەستوورێکی دەستکرد و تاغوت کە "جەنگیزخان" ی سەرۆکی مەغۆلەکان دایناوبوو تا حوکمڕانی پێبکات لە خاکی موسڵمانان، دەستوورەکە تێکەڵ بوو لە حوکمەکانی قورئان و ئینجیل و تەورات، لەگەڵ چەند حوکمێکی دەستکردی خۆیشی، هەموو ئەمانەی تێکەڵ کردبوو بۆ حوکمڕانی کردن لە خاکی موسڵمانان!! بۆیەش زانایانی ئەهلی سوننە -رحمهم الله- پێکەوە تەکفیریان کرد. هەروەها پێموایە ئەم وشەی "یاسا" یەی کە لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر بەکاردێت و دەیبیستین، ئەوا سەرچاوەکەی بریتییە لە ناوی دەستوورەکەی جەنگیزخان -والله أعلم.

(٢) کتێبی البداية والنهاية > بەرگی سێزدەهەم > ثم دخلت سنة أربع وعشرين وستمائة فيها كانت عامة أهل تفليس الكرج فجاؤوا إليهم فدخلوها فقتلوا العامة والخاصة، ونهبوا وسبوا وخربوا وأحرقوا، وخرجوا على حمية، وبلغ ذلك جلال الدين فسار سريعا ليدركهم فلم يدركهم > وممن توفي فيها.

زانایەی کە کتێبی مێژووەکەی یەکێکە لە بەهێزترین سەرچاوەکان بۆ موسڵمانان، دەی فەرموون ئەمەیە تێگەیشتنی ئەم زانایە پایەدارە لە بابەتی داڕشتنی دەستوور و حوکمڕانی کردن پێی.

لە سەردەمی ئەو زانایەدا شەریعەتە تاغوتەکە ناوی "الیاسا" یاخود "یاسق" بوو، ئێستاش ناوەکەی بووەتە "دیمۆکڕاسیەت"، جیاوازیشیان ئەوەیە کە شەریعەتەکەی جەنگیزخان تێکەڵەیەک بوو لە هەموو دینەکان، بەڵام شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت دوورە لە هەموو دینەکان. هەردووکیشیان تاغوتن و دژی شەریعەتی أللە ـن؛ چونکە هەردووکیان خۆیان لەوە دەبیننەوە کە دینی أللە لەگەڵ دینە دەستکرد و پووچەڵەکان بە هەمان چاو سەیر دەکەن.

هەروەها شێخ إبن کثیر لە تەفسیری ئایەتی {**أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون**}[1]. لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا شێخ إبن کثیر نموونە دەهێنێتەوە بە تەتەرەکان (مەغۆلەکان)، دەفەرمووێ: «**وكما يحكم به التتار من السياسات الملكية المأخوذة عن ملكهم جنكزخان، الذي وضع لهم الياساق وهو عبارة عن كتاب مجموع من أحكام قد اقتبسها عن شرائع شتى، من اليهودية والنصرانية والملة الإسلامية، وفيها كثير من الأحكام أخذها من مجرد نظره وهواه، فصارت في بنيه شرعا متبعا، يقدمونها على الحكم بكتاب الله وسنة رسوله صلى الله عليه وسلم. ومن فعل ذلك منهم فهو كافر يجب قتاله، حتى يرجع إلى حكم الله ورسوله -صلى الله عليه وسلم**»[2].

واتە: «**هەروەک چۆن تەتەرەکان (واتە مەغۆلەکان) حوکم دەکەن بەو سیاسەتە پاشاییەی کە لەلایەن پاشاکەیان جەنگیزخان بۆیان دانراوە، ئەو پیاوەی کە "الیساق" ی بۆیان دانا کەوا بریتییە لە دەستوورێکی تێکەڵ لە ئەحکامی شەریعەتە جیاوازەکان، لە دینی جولەکەکان و گاورەکان و ئیسلام، هەروەها ئەحکامی زۆریشی تێدایە کەوا**

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٥٠. بۆ زانینی مانا و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکە بگەڕێوە بۆ لاپەڕی ٣٦.
(٢) تەفسیری إبن کثیر –رحمه الله– بۆ سورەتی المائدة، ئایەی ٥٠.

بیەوێت، بەڕاستیی ئەو بەهەموو شتێک زانایە}، جا ئایا ئەو کافر و تاوانبارانەی شەریعەتە شەیتانییەکان دادەڕێژن هیچیان شایەنی ئەوەن کە پێیان بگووترێت "پەروەردگار" بەجۆرێک کە کێشەکان بۆ لایان بگەڕێندرێنەوە و پشتیان پێ ببەسترێت؟! یاخود ئایا دەتوانرێت بگووترێت ئەوان داهێنەری ئاسمانەکان و زەوین و دروستکاریانن؟! ئایا دەتوانرێت بگووترێت ئەوان هاوسەریان بۆ مرۆڤ دروستکردووە؟! ئەی موسڵمانان، پێویستە لەسەرتان ئاگاداری سیفەتەکانی ئەو زاتە بن کەوا شایەنی داڕشتنی شەریعەت و حەلال و حەڕامەکردنە، نەکەن شەریعەت لە کافرێکی کەموکوڕی جاهیلی بچووک.

هەروەها لەو ئایاتانەی کە سەلمێنەری ئەوەن، بریتین لە گوفتاری أللە -تعالی-: {... غەیب و نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوی هەر لای ئەون و هی ئەون، ئای چەندە بینەرە و چەندە بیسەرە، ئەوان هیچ پشتیوانێکیان نییە لەبری ئەو، هەروەها هیچ کەسێک لە حوکمەکانیدا هاوبەش نییە}، جا ئایا ئەو کافرە تاوانبارانەی شەریعەت دادەڕێژن هیچیان شایەنی ئەوەن کە وەسف بکرێن بەوەی نهێنییەکانی ئاسمان و زەویان لەلایە؟! هیچیان شایەنی ئەوەن کە وەسف بکرێن بە توانایەکی بێسنوور لە بیستن و بینین؟ بەجۆرێک کە بتوانن هەموو بیستراوێک ببیستن و هەموو بینراوێک ببینن؟! ئایا هیچیان لەبری أللە پشتیوانیان هەیە؟! أللە پاک و پایەدارترە لەوە.

هەروەها لەو ئایاتانەی کە سەلمێنەری ئەوەن، بریتین لە گوفتاری أللە -تعالی-: {لەگەڵ أللە هاوار بۆ پەرستراوی تریش مەکە، هیچ پەرستراوێک حەق نییە جگە لە ئەو، هەموو شتێک لەناو دەچێت تەنها ڕووی ئەو نەبێت (واتە خودی خۆی)، حوکمدان هەر بۆ ئەوە و گەڕانەوەشتان هەر بۆ لای ئەوە}. جا ئایا ئەو کافرە تاوانبارانەی شەریعەت دادەڕێژن هیچیان شایەنی ئەوەن کە پێیان بگووترێت پەرستراوی تاک و تەنها؟! هەروەها ئایا شایەنی ئەوەن کە پێیان بگووترێت هەموو شتێک لەناودەچێت جگە لە ئەوان؟! هەروەها ئایا شایەنی ئەوەن کە پێیان بگووترێت بوونەوەرەکان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە؟! پەروەردگارمان پاک و بێگەردە و پایەدار و پیرۆزترە لەوەی کە مرۆڤە کەموکوڕەکان بە سیفەتەکانی بچووێندرێن.

**هەروەها ألله دەڵێت: {... حوکمدان تەنها مافی ئەوە، حەق و ڕاستیی دەگێڕێتەوە و هەر ئەویش باشترینی جیاکەرەوەکانە}. جا ئایا هیچ کەسێک لەوان (واتە ئەو کافرانەی شەریعەت دادەڕێژن) شایەنی ئەوەن کە پێیان بگووترێت حەق دەگێڕنەوە؟! یاخود هیچیان شایەنی ئەوەن پێیان بگووترێت کە باشترینی جیاکەرەوەکانن؟!**

**هەروەها گوفتاری ألله -تعالی-: {-ئەی محمد- بڵێ: ئایا ئەو ڕزقەتان بینیوە کە ألله بۆتانی دابەزاندووە و ئێوەش هەندێکیانتان حەڕام کردووە و هەندێکیشیانتان حەلال کردووە، بڵێ: ئایا ألله مۆڵەتی پێداون یاخود درۆ بەدەم ألله دەکەن؟!}، جا ئایا ئەو کەسانە (واتە ئەو کافرانەی شەریعەتە دەستکردەکان دروست دەکەن) هیچیان تێدایە کە شایەنی ئەوەبێت ڕزق دابەزێنێ بۆ بوونەوەرەکان؟! هیچیان شایەنی ئەوەن کە حەڕام و حەلال دانەنرێن ئیللا بەئیزنی ئەو؟!**

**هەموو ئەمەش چونکە: پێویستە کەوا ئەو کەسەی ڕزق دروست دەکات و دایدەبەزێنێت هەر ئەویش مافی ئەوەی هەیە کە حەلال و حەڕامەکانی لەدەست بێت، ألله زۆر پاک و بێگەرد و بەرز و پایەدارترە لەوەی هاوبەش و شەریکی هەبێت لە حەلال کردن و حەڕام کردن**».

جا بەڕاستیی تێڕامانەکەی شێخ محمد الشنقيطي زۆر جوانە، چۆن حوکمدان و یاسادانان و شەریعەت داڕشتن بدرێتە دەستی مرۆڤ لەبری ألله؟! لەکاتێکدا کەوا ڕزق و ژیاندن و مراندنی مرۆڤەکان لەدەستی ألله یە، هەروەها بیسەری هەموو دەنگێک و بینەری هەموو دیمەنێک هەر ألله یە، هەروەها دروستکاری هەموو شتێک هەر ألله یە، هەر ئەویش ئاگاداری غەیب و نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوییە بەبێ ئەوەی هیچ مرۆڤێک ئاگاداری ئەم حەقیقەتە گەورانە بێت.

ئیتر ئەی قەومەکەم، چۆن و بە چ بەڵگەیەک پشت لە پەروەردەکاری خۆتان هەڵدەکەن و گوێڕایەڵی شەریعەتەکەی ئەو نابن و هانا بۆ کۆمەڵێک مرۆڤی تاغوت و تاغوتپەرست دەبەن تاکو ئەوان یاساتان بۆ دابڕێژن لەبری ألله؟!

**شازدەهەم: محمد أمان الجامي -رحمه الله- (ساڵی ١٤١٥ ی هیجری مردووە):**

شێخ محمد الجامي -رحمه الله- هۆشداریی توند دەداتە هەر کەسێک کە خۆی بە موسڵمان بزانێت و پەرستن بۆ ألله بکات کەچی لەڕووی شەریعەت و حوکمڕانییەوە پشت بە حوکم و شەریعەتی غەیری ألله ببەستێت.

هەروەک دەڵێت: «**لا بد أولا من الكفر بالطاغوت والإيمان بالله، ولو ءامن المرء بالله ووحده بالعبادة لكنه لم يكفر بالطاغوت في أي نوع من أنواع العبادات، إما في شعائر العبادة كالدعاء والإستغاثة والنذر، أو في توحيد الحاكمية، لو ءامن العبد ووحد الله في توحيد العبادة في شعائر العبادة، ولكن لم يوحد الله -سبحانه وتعالى- في حاكميته، ما قبل منه توحيد العبادة، بل لا بد أن تكفر بالطاغوت الكفر الشامل في جميع الأبواب، وتؤمن بالله الإيمان الكامل التي لا يتجزء، ومن يعبد الله وحده، لا يستغيث إلا بالله، لا يدعوا غير الله، نذره لله، والتقرب إلى الله بأنواع عبادات المعروفة، لكن يتحاكم إلى الطاغوت، ما نفعه هذا الإيمان، لا بد من الكفر بالطاغوت في جميع الأبواب، أي: من يتحاكم إلى غير ما أنزل الله ما نفعه توحيد العبادة، بل لا بد من الكفر بالطاغوت في جميع الأبواب**»[1].

واتە: «**پێویستە لە سەرەتادا کوفر بە تاغوت بکرێت و ئیمان بە ألله بهێنرێت، خۆ ئەگەر مرۆڤ ئیمانی بە ألله هێنا و لەڕووی پەرستنیشەوە بە تاک و تەنها پەرستنی بۆ کرد، بەڵام کوفر بە تاغوت نەکردبوو لە هەر جۆرێک لە جۆرەکانی عیبادەت، وەکو دروشمە عیبادەتەکانی وەکو پاڕانەوە و هانا بۆ بردن و سەربڕینی ئاژەڵ، یاخود لەڕووی تەوحیدی حاکمیەت. خۆ ئەگەر مرۆڤ باوەڕی بە ألله هێنا و لەڕووی دروشمەکانی عیبادەتەوە بەتەنها ألله بپەرستێ کەچی تەوحیدی ألله نەکات لەڕووی حوکمدان و یاسادانانەوە، ئەوا یەکتاکردنی ألله لەڕووی پەرستن سوودی بۆی نابێت. بەڵکو پێویستە ئیمانێکی تەواو بە ألله بهێنرێت کەوا بەش بەش نەبێت. هەر کەسێک ألله بەتەنها**

(١) شرح التدمرية لمحمد أمان الجامي -رحمه الله- > فایلی یەکەم > خولەکی ٢٧ تا ٣٠.

**بپەرستێت، هاوار نەكات تەنها بۆ أللە نەبێت، نەپاڕێتەوە تەنها لە أللە نەبێت، هەروەها ئاژەڵ بەناوی ئەوەوە سەربڕێت و بە عیبادەتە شەڕعییەكان خۆی لە أللە نزیک بكاتەوە، كەچی حوكم بۆ لای شەریعەتێكی تاغوت بگەڕێنێتەوە، ئەوا ئیمانەكەی سوودی بۆی نابێت، بەڵكو پێویستە كوفر بە تاغوت بكرێت لە هەموو جۆر و بەشەكانی**».

بینیمان كەوا گوفتارەكەی ئەم زانایە پایەدارە چەندە ڕۆشنە، ئەوەتا پێمان دەڵێت ئەگەر مرۆڤێک هەموو پەرستنەكان بۆ أللە بكات و هیچ شیركێک لەڕووی پەرستنەوە ئەنجام نەدات، ئەوا هێشتا نابێتە ئیماندار تاكو دان بەوە نەنێت كە تەنها شەریعەتی أللە شایەنی حوكمڕانییە و هەموو شەریعەتەكانی تریش تاغوتن و دەبێ كوفریان پێ بكرێت، كەواتە "تەوحیدی پەرستن" و "تەوحیدی حاكمیەت" گرێدراوی یەكترن، مرۆڤ نابێتە موسڵمان ئەگەر یەكێكیان ئەنجام بدات بەبێ ئەوەی تریان، بەڵكو پێویستە لەسەر مرۆڤەكان –ئەگەر خۆیان بە موسڵمان دەزانن– ئەوا هەروەک چۆن نوێژ بۆ غەیری أللە ناكەن، با ئاواش پشت هەڵبكەن لە هەموو شەریعەتە دەستكرد و تاغوتەكان، هەروەها مومارەسەی دروشمە بۆگەنەكانیان نەكەن، خۆ ئەگەر وایان نەكرد ئەوا موسڵمان نین ئەگەرچی بانگەشەی ئیمانیش بكەن، ئەوەتا گوفتاری ئەم هەموو زانایەش بەڵگەن و ئەوانیش لەژێر ڕۆشنایی ئایاتەكانی أللە فەتوایان داوە.

**حەڤدەهەم: إبن عثيمين –رحمه الله– (ساڵی ١٤٢١ ی هیجری مردووە):**

ئەگەر بیرتان مابێت لە لاپەڕی ٧ بەدواوە باسی ئەوەمان کرد کە دوو حاڵەتی جیاواز هەن لە بابەتی حوکمڕانی، یەکێکیان بریتییە لە "شەریعەتی تاغوت" کە تێیدا دەستوور و شەریعەتێکی فراوان بکرێتە سیستەمی بەڕێوەبردنی خەڵک و خاک و کۆمەڵگە کەوا ئەو دەستوورە دەستکردی مرۆڤەکانە و تاغوتە. حاڵەتەکەی تریش بریتییە لە "الحكم بغير ما أنزل الله"، کە تێیدا لە خاکەکە حوکم بە شەریعەتی ألله دەکرێت نەک شەریعەتە دەستکردە تاغوتییەکان، بەڵام دەسەڵاتدارەکە یاخود قازیەکە لە حاڵەتێکی تایبەتدا حوکمێکی ئیسلام دەوەستێنێت بەهۆکارێک بەبێ ئەوەی ڕەتی بکاتەوە، بۆ نموونە لەبەر خزمایەتی یاخود واستە یاخود بەرتیل حوکمەکە دەوەستێنێ بۆ کەسێک، بەڵام باوەڕی بە واجبێتی حوکمەکە هەیە و لەسەر کەسانی تر جێبەجێی دەکات.

لە لاپەڕی ٧ بەدواوە ئەوەم باسکرد کە حاڵەتی یەکەم کوفری گەورەیە و بکەرەکەی پێی دەچێتە دەرەوەی ئیسلام، بەڵام حاڵەتەکەی دووەم کوفری گەورە نییە و بکەرەکەی هەر موسڵمانە.

لێرەدا شێخ إبن عثيمين –رحمه الله– ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە کاتێک لێی دەپرسن: ئایا جیاوازیی هەیە لەوەی کە قازییەک حوکم بە شەریعەتی ألله نەکات لە بابەتێکی تایبەت هەروەها لەگەڵ حاڵەتی شەریعەتێکی فراوان؟

لە وەڵامدا دەڵێت: «**نعم هناك فرق فإن المسائل التي تعتبر تشريعًا عامًا لا يتأتى فيها التقسيم السابق وإنما هي من القسم الأول فقط؛ لأن هذا المشرع تشريعا يخالف الإسلام إنما شرعه لاعتقاده أنه أصلح من الإسلام وأنفع للعباد كما سبقت الإشارة إليه.**

**والحكم بغير ما أنزل الله ينقسم إلى قسمين:**

**أحدهما: أن يستبدل هذا الحكم بحكم الله -تعالى- بحيث يكون عالما بحكم الله، ولكنه يرى أن الحكم المخالف له أولى وأنفع للعباد من حكم الله، أو أنه مساو لحكم**

الله، أو أن العدول عن حكم الله إليه جائز فيجعله القانون الذي يجب التحاكم إليه فمثل هذا كافر كفرا مخرجا عن الملة لأن فاعله لم يرض بالله ربا ولا بمحمد رسولا ولا بالإسلام دينا وعليه ينطبق قوله -تعالى-: {أفحكم الجاهلية يبغون ومن أحسن من الله حكما لقوم يوقنون}[١] وقوله -تعالى-: {... ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون}[٢]. وقوله -تعالى-: {ذلك بأنهم قالوا للذين كرهوا ما نزل الله سنطيعكم في بعض الأمر والله يعلم إسرارهم * فكيف إذا توفتهم الملائكة يضربون وجوههم وأدبارهم * ذلك بأنهم اتبعوا ما أسخط الله وكرهوا رضوانه فأحبط أعمالهم}[٣]. ولا ينفعه صلاة، ولا زكاة، ولا صوم، ولا حج؛ لأن الكافر ببعض كافر به كله قال الله -تعالى-: {... أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض فما جزاء من يفعل ذلك منكم إلا خزي في الحياة الدنيا ويوم القيامة يردون إلى أشد العذاب وما الله بغافل عما تعملون}[٤]، وقال سبحانه: {إن الذين يكفرون بالله ورسله ويريدون أن يفرقوا بين الله ورسله ويقولون نؤمن ببعض ونكفر ببعض ويريدون أن يتخذوا بين ذلك سبيلا * أولئك هم الكافرون حقا وأعتدنا للكافرين عذابا مهينا}[٥].

الثاني: أن يستبدل بحكم الله -تعالى- حكما مخالفا له في قضية معينة دون أن يجعل ذلك قانونا يجب التحاكم إليه فله ثلاث حالات:

الأولى: أن يفعل ذلك عالما بحكم الله -تعالى- معتقدا أن ما خالفه أولى منه وأنفع للعباد، أو أنه مساو له، أو أن العدول عن حكم الله إليه جائز فهذا كافر كفرا مخرجا عن الملة لما سبق في القسم الأول.

الثانية: أن يفعل ذلك عالما بحكم الله معتقدا أنه أولى وأنفع لكن خالفه بقصد

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٥٠.

(٢) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٤.

(٣) سورەتی محمد، ئایەی ٢٦ تا ٢٨.

(٤) سورەتی البقرة، ئایەی ٨٥.

(٥) سورەتی النساء، ئایەی ١٥٠ و ١٥١.

الإضرار بالمحكوم عليه أو نفع المحكوم له، فهذا ظالم وليس بكافر وعليه يتنزل قول الله -تعالى-: {... ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الظالمون}[1].

الثالثة: أن يكون كذلك لكن خالفه لهوى في نفسه أو مصلحة تعود إليه فهذا فاسق وليس بكافر وعليه يتنزل قول الله -تعالى-: {ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الفاسقون}[2].»[3].

واته: «بەڵێ جیاوازییان هەیە، ئەو بابەتانەی کە بریتین لە یاساداناني فراوان و شەریعەتی گشتی (وەکو شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت) ئەوا وەسفەکەی پێشوو نایگرێتەوە بەڵکو ئەمە تەنها تایبەتە بە بڕگەی یەکەمی پێشووتر، چونکە ئەوەی کە ئەمجۆرە شەریعەتانە دادەڕێژێت کە دژی ئیسلامن ئەوا بێگومان دایڕشتووە چونکە باوەڕی وایە ئەو شەریعەتە دەستکردە باشترە لە ئیسلام، هەروەها بە سوودترە بۆ مرۆڤەکان.

هەروەها حوکم نەکردن بە شەریعەتی ألله بەسەر دوو بەش دابەش دەبێ:

بەشی یەکەم: ئەگەر شەریعەتە دەستکردەکە بهێنرێتە شوێنی حوکم و شەریعەتی ألله -تعالى-، لەکاتێکدا کەسەکە ئاگاداریشە لە حوکمەکانی ألله بەڵام وای دەبینێت کەوا شەریعەتە دەستکردەکە باشتر و لەپێشترە بۆ مرۆڤەکان بەبەراورد بە حوکمی ألله، یاخود یەکسانە بە حوکمی ألله. ئیتر شەریعەتە دەستکردەکە وا لێدەکات کە حوکمڕانی پێ بکرێت. ئەمجۆرە کەسە کافرە و لە دینی ئیسلام چووەتە دەرەوە؛ چونکە کەسەکە ڕازی نییە بەوەی دان بنێت بە پەروەردگارێتیی ألله، هەروەها ڕازی نییە بەوەی دان بنێت بە پێغەمبەرایەتی محمد -صلى الله عليه وسلم-، هەروەها ڕازی نییە بەوەی دان بنێت بە دینی ئیسلام. ئەم کەسانە ڕاستەوخۆ ئەم گوفتارەی ألله لەسەریان جێبەجێ دەبێت: {ئایا ئەمانە حوکمی جاهیلیەتیان دەوێت؟ ئایا حوکمی کێ باشترە لە ألله بۆ قەومێک کە

---

(١) سوڕەتی المائدة، ئایەی ٤٥.

(٢) سوڕەتی المائدة، ئایەی ٤٧.

(٣) کتێبی فتاوى الشيخ محمد الصالح العثيمين > العقيدة > أنواع الشرك والكفر > هل هناك فرق بين المسئلة المعينة وبين التشريع العام؟.

ئیمانی تەواویان هەبێت؟} هەروەها گوفتاری ألله: {ئەمەش چونکە ئەوان بەو کەسانەیان گووت کەوا ڕقیان لەوە دەبووەوە کە ألله دایبەزاندبوو: ئێمە گوێڕایەڵتان دەبین لە هەندێک بابەت و فەرمان، ألله نهێنییەکانیان دەزانێت * ئاخۆ دەبێ حاڵیان چۆن بێت کاتێک فریشتەی گیان کێشان -لە سەرەمەرگ- لە ڕووخسار و پشتیان دەدەن * ئەمەش چونکە ئەوان شوێن شتانێک کەوتن کە ألله تورە دەکات، هەروەها ڕەزامەندیی ألله ـیان بەدڵ نەبوو بۆیەش کردەوەکانیان هەڵوەشێندرایەوە}. بۆیەش ئیتر نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج سوودی بۆ ئەمجۆرە کەسانە نییە؛ چونکە ئەو کەسەی کە کافر بێت بە بەشێکی ئیسلام ئەوا کافرە بە هەمووی. هەروەک ألله -تعالی- فەرموویەتی: {ئەوە ئێوە باوەڕ بە بەشێکی ئەم کتێبە دەهێنن (واتە قورئان) هەروەها کوفر بە بەشێکی تری دەکەن؟ جا پاداشتی ئەو کەسە چییە کە وابکات جگە لەوەی سەرشۆڕ دەکرێت لە ژیانی دونیا و هەروەها لە ڕۆژی قیامەتیش دەنێردرێن بەرەو سزایەکی توندتر، ألله بێ ئاگا نییە لەوەی کە دەیکەن}. هەروەها ألله -سبحانە- دەڵێت: {ئەوانەی کە کوفر بە ألله و نێردراوەکەی دەکەن و دەیانەوێ جیاکاریی بکەن لەنێوان ألله و نێردراوەکەی و دەڵێن: ئێمە باوەڕ بە بەشێک دەهێنین و باوەڕ بە بەشێک ناهێنین. هەروەها دەیانەوێت لەم نێوانەدا ڕێگایەک بگرنە بەر * ئەوانە هەر بەڕاستیی کافرن، ئێمە بۆ کافران سزای ڕیسواکەرمان داناوە}.

بەشی دووەم: کەسێک کە حوکمێکی ألله -تعالی- بگۆڕێت بە حوکمێکی تر لە بابەتێکی تایبەت و دیاریکراو بەبێ ئەوەی بیکاتە یاسایەکی گشتگیر و هەمیشەیی تاکو خەڵک حوکمی بۆ بگەڕێننەوە. ئەمەش بەسەر سێ ئەگەر دابەش دەبێ:

ئەگەری یەکەم: ئەگەر ئەو کەسەی حوکمە تایبەتەکە دەوەستێنێ چونکە باوەڕی وایە حوکمێکی دەستکرد باشتر و لەپێشترە لەو حوکمەی ألله، یاخود یەکسانە لەگەڵ حوکمەکەی ألله، ئەوا ئەو کەسە کافرە و لە دین چووەتە دەرەوە هەروەک چۆن لە بەشی یەکەم باس کرا.

ئەگەری دووەم: ئەگەر کەسە حوکمەکە بگۆڕێت و ئاگاداری حوکمی ألله بێت و باوەڕیشی وابێت کە حوکمەکەی ألله باشترە لە حوکمی ئەو، بەڵام بۆیە حوکمی پێ

**ناکات چونکە دەیەوێت زیان بگەیەنێ بەو کەسەی حوکمەکەی لەسەر دەدرێت یاخود دەیەوێت بابەتەکە لە بەرژەوەندیی لایەنەکەی تر بشکێتەوە. ئەوەیان "ظالم" ـە و کافر نییە، هەروەها ئەم ئایەتەی لەسەر جێبەجێ دەبێت: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە ستەمکارن}.**

**ئەگەری سێیەم: ئەگەر کەسەکە بەهەمان شێوەی پێشوو بێت (واتە باوەڕی بە حوکمی ألله هەبێت نەک حوکمە تاغوتییەکان) بەڵام حوکمی پێ ناکات لەبەر ئارەزووی خۆی یاخود لەپێناوی بەرژەوەندییەکی خۆی، ئەوا ئەو کەسە "فاسق" ـە و کافر نییە، هەروەها ئەم ئایەتەی لەسەر جێبەجێ دەبێت: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە فاسقن}.«**

کەواتە ئەوەی کە لە لاپەڕی ٧ بەدواوە باسم کردووە هەر هەمان مەنهەجی زانایانە و پاڵپشتە بە ئایاتەکانی قورئانی پیرۆز، هەر پشت لە شەریعەتی ألله بکات و ڕوو بکاتە شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوت، هەروەها بیکاتە یاسای بەڕێوەبردنی خاک و خەڵکەکە، ئەوا بێگومان ئەو کەسە هەرگیز "فاسق" و "زاڵم" نییە، بەڵکو ئیللا کافرە؛ چونکە –هەروەک شێخ إبن عثیمین ڕوونی کردەوە– کەوا ئەوجۆرە کەسانە هێشتا کوفریان بە تاغوت نەکردووە و ڕازی نین بەوەی ألله سیفەتی حوکمدان و تەشریعی هەبێت، بەڵکو دەیانەوێت ئەم دوو سیفەتە بۆخۆیان ببەن.

بەڵام ئەوەی کە تەکفیر ناکرێت بریتییە لەو دەسەڵاتدار و قازیە موەحیدەی کە حوکم بە شەریعەتی ألله دەکات لە خاکەکەی، هەروەها باوەڕی بە هیچ شەریعەتێکی تاغوت نییە، بەڵام لە هەندێک حاڵەتی تایبەتدا حوکمێک جێبەجێ ناکات بۆ ماوەیەکی کاتیی، دەکرێت یەک جار بێت، ئەمجۆرە دەسەڵاتدار و قازیە تەکفیر ناکرێن بەڵکو هەر موسڵمانن.

**جا کەسانێک هەر بەم ئایاتانەش ناوەستن و سنوور دەبەزێنن لە پرسیارکردن، دەڵێن:** ئەی ئەگەر حوکم بە شەریعەتی دیمۆکراسیەت بکرێت بەڵام حوکمی ألله بە باشتر بزانرێت، هەر کافرە؟!

هەر بە وەڵامی شێخ إبن عثیمین –رحمه الله– وەڵامتان دەدەمەوە: «**فإنهم لم يضعوا تلك التشريعات المخالفة للشريعة الإسلامية إلا وهم يعتقدون أنها أصلح وأنفع للخلق، إذ من المعلوم بالضرورة العقلية والجبلة الفطرية أن الإنسان لا يعدل عن منهاج إلى منهاج يخالفه إلا وهو يعتقد فضل ما عدل إليه، ونقص ما عدل عنه.**»[1].

واتە: «**ئەوان ئەو شەریعەتە دەستکردانەیان دانەڕشتووە کەوا پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامن تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە باوەڕیان وایە شەریعەتەکانی ئەوان باشتر و بەسوودترە بۆ خەڵک، چونکە لەڕووی عەقڵییەوە هەست بەوە دەکەین کە مرۆڤ هیچ مەنهەجێک لەگەڵ مەنهەجێکی تر بەیەکسان نازانێت لەکاتێکدا پشتی لە یەکێکیان کردووە! بەڵکو ئیللا ئەو کەسە باوەڕی وایە مەنهەجەکەی خۆی باشترە، مەنهەجەکەی تریش کەموکوڕە**».

جا بەڕاستیی هەر وایە؛ چونکە ئەگەر شەریعەتی ئیسلام بە باشتر دەزانن بۆ حوکمڕانی ئەوا بۆچی شەریعەتێکی دەستکردتان هێناوە و حوکمی پێدەکەن کە لە دەیان خاڵدا کوفری گەورەی تێدایە و دژی شەریعەتی ألله یە.

(١) کتێبی فتاوى الشيخ محمد الصالح العثيمين > العقيدة > أنواع الشرك والكفر > ما حكم من حكم بغير ما أنزل الله ؟

**هەژدەهەم: مقبل الوادعي -رحمه الله- (ساڵی ١٤٢٢ ی هیجری مردووە):**

شێخ مقبل -رحمه الله- لەبارەی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت هۆشدارییەکی توند دەداتە تێکڕای ئوممەت، هەروەک دەڵێت: «**أتدرون لو حصل تصويت أيصوم الناس أم لا؟ أيحج الناس أم لا يحجون؟ أيصلى الناس أم لا يصلون؟ أيباح الزنا أم لا يباح الزنا؟ أتباح السرقة أم لا تباح؟ أتقطع يد السارق أم لا تقطع؟ كل هذا ممكن أن يخضع لتصويت الشعب بمعنى الديمقراطية، فإنا لله وإنا إليه راجعون، وحسبنا الله ونعم الوكيل، سخرت الإذاعات وأصبحت تتباهى بالديمقراطية. فعلينا أن نثبت على ديننا حتى يتوفانا الله عز وجزل، فإن الأمر خطير، ردة سافرة وكفر بواح**»[1].

«**ئایا دەزانن کە ئەگەر کارەکان بە دەنگدان بێت ئەوا ڕۆژوو دەگیرێت یان نا؟ ئایا خەڵک حەج دەکەن یان نایکەن؟ ئایا خەڵک نوێژ دەکەن یان نایکەن؟ ئایا زینا ڕێگاپێدراو دەبێت یان نابێت؟ ئایا دزی کردن ڕێگاپێدراو دەبێت یان نابێت؟ ئایا دەستی دز دەبڕێتەوە یان نابڕێتەوە؟ هەموو ئەمانە ئەگەری ئەوەیان هەیە کە بخرێنە ژێر دەنگدانی گەل بەناوی دیمۆکڕاسیەت. إنا لله وإنا إليه راجعون، حسبنا الله ونعم الوكيل. ڕادیۆکان وایان لێهاتووە کە شانازیی بە دیمۆکڕاسیەت دەکەن. کەوابێ پێویستە لەسەرمان کە دامەزراو بین لەسەر دینەکەمان تاکو ألله -عز وجل- دەمانمرێنێت. بەڕاستیی باسەکە ترسناکە، مورتەدبوون و هەڵگەڕانەوەیەکی ئاشکرایە و کوفرێکی بەواح و ڕوونە**».

لێرەدا دەپرسم: جا کە ئەمە حەقیقەتی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت بێت، ئەی دەبێ حوکمی ئەو کەسە چی بێت کە پڕ بەدڵ باوەڕی پێی هەبێت و بیسەپێنێ لەسەر خەڵک و حوکمی پێبکات؟ هەروەها دەبێ حوکمی ئەو خەڵکە چی بێت کە بەشداریی لەم شەریعەتە دەکەن و پەنجەی شایەتومانیان مۆر دەکەن بۆ هەڵبژاردنی کەسانێکی تاغوت کە ئەرکیان ئەوەیە کەوا شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت بەرەوپێش ببەن؟! بێگومان ئەمانە کافرن، هەروەک چۆن شێخ مقبل الوادعي گوتی: مورتەد بوونەوەیە و کوفری

(١) کتێبی قمع المعاند وزجر الحاقد الحاسد > بەرگی دووەم > الديمقراطية كفر > لاپەڕەی ژمارە: ٢٢٣.

بەواحە، واتە کوفرێکی هێندە گەورە و ڕۆشنە کەوا کەس ناتوانێ ڕەتی بکاتەوە و دژی ژمارەیەکی زۆر لە ئایاتەکانی قوڕئانە.

**نۆزدەهەم: إبن جبرين -رحمه الله- (ساڵی ١٤٣٠ ی هیجری مردووە):**

شێخ إبن جبرين –رحمه الله– پرسیاری لێکراوە لەبارەی عەلمانیەت و حوکمی ئیسلام لەبارەی عەلمانیەت، لە وەڵامدا گووتی: «**الجواب: مذهب جديد وحركة فاسدة تهدف إلى الإكباب على الدنيا والانشغال بشهواتها وملذاتها، وجعلها هي الهدف الوحيد في هذه الحياة، ونسيان الدار الآخرة والغفلة عنها، وعدم الالتفات إلى الأعمال الأخروية أو الاهتمام بها، وقد يصدق على العلماني قول النبي -صلى الله عليه وسلم- : "تعس عبد الدينار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد الخميصة، تعس عبد الخميلة، إن أعطي رضي، وإن لم يعط لم يرض، تعس وانتكس، وإذا شيك فلا انتقش"**[1].

**وقد دخل في هذا الوصف كل من عاب شيئا من تعاليم الإسلام قولا أو فعلا، فمن حكم القوانين وألغى الأحكام الشرعية فهو علماني، ومن أباح المحرمات: كالزنا والخمور والأغاني والمعاملات الربوية، واعتقد أن منعها ضرر على الناس، وتحجر لشيء فيه مصلحة نفسية، فهو علماني، ومن منع أو أنكر إقامة الحدود كقتل القاتل، ورجم أو جلد الزاني والشارب، أو قطع السارق أو المحارب، وادعى أن إقامتها تنافي المرونة، وأن فيها بشاعة وشناعة - فقد دخل في العلمانية.**

---

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الجهاد والسير > باب الحراسة في الغزو في سبيل الله > فەرموودەی ژمارە: ٢٨٨٦.

ئەوەشمان بیرنەچێت کە فەرموودەکە لەنێو حەوت کتێبە ناودارەکەی فەرموودەدا لەفزەکەی بەمجۆرە نییە کە شێخ إبن جبرين –رحمه الله– نووسیویەتی، بەڵکو ئاوایە: "تعس عبد الدينار والدرهم والقطيفة والخميصة، إن أعطى رضي، وإن لم يعط لم يرض"، بۆیەش من مانای فەرموودەکەی صحيح البخاري دەنووسم نەک ئەوەی شێخ إبن جبرين نووسیویەتی.

أما حكم الإسلام فيهم، فقد قال -تعالى- في وصف اليهود: {... أفتؤمنون ببعض الكتاب وتكفرون ببعض فما جزاء من يفعل ذلك منكم إلا خزي في الحياة الدنيا}[١] الآية، فمن قبل ما يناسبه من الدين كالأحوال الشخصية وبعض العبادات ورد ما لا تهواه نفسه، دخل في الآية.

وهكذا يقول -تعالى-: {من كان يريد الحياة الدنيا وزينتها نوف إليهم أعمالهم فيها وهم فيها لا يبخسون * أولئك الذين ليس لهم في الآخرة إلا النار ...}[٢]، فالعلمانيون هدفهم جمع الدنيا والتلذذ بالشهوات ولو محرمة، ولو منعت من الواجبات، فيدخلون في هذه الآية، وفي قوله -تعالى-: {من كان يريد العاجلة عجلنا له فيها ما نشاء لمن نريد ثم جعلنا له جهنم يصلاها مذموما مدحورا}[٣]، ونحو ذلك من الآيات والأحاديث. والله أعلم.»[٤].

واته: «وەڵام: عەلمانیەت ڕێبازێکی نوێیە و بزووتنەوەیەکی خراپەکارە ئامانجی بریتییە لە ڕووکردنە دونیا و سەرقاڵبوون بە شەهەوات و چێژەکانی، هەروەها دەیەوێت ئەمە بکات بە تاکە ئامانجی ئەم ژیانە. هەروەها لەبیر بردنەوەی ماڵی کۆتایی (واتە بەهەشت و دۆزەخ) هەروەها ئەنجام نەدانی ئەو کردەوانەی بەسوودن بۆ ڕۆژی دوایی هەروەها گرینگی نەدان پێی، بۆیەش مرۆڤی عەلمانی فەرموودەکەی پێغەمبەری لەسەر جێبەجێ دەبێت -صلى الله عليه وسلم- کاتێک گووتی: "لەناوچێت ئەو کەسەی عەبدی دینار و درهەم و جلوبەرگە، ئەگەر ئەو شتانەی پێ بدرێت ئەوا ڕازییە، ئەگەریش پێی نەدرێت ئەوا ناڕازییە".

ئەم وەسفە لە هەر کەسێک جێبەجێ دەبێت کەوا دروشمێکی ئیسلام بە کەموکوڕ بزانێت، دروشمی گوفتاریی بێت یان کرداریی. هەر کەسێک حوکم بە یاسا

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٨٥.
(٢) سورەتی هود، ئایەی ١٥ و ١٦.
(٣) سورەتی الإسراء، ئایەی ١٨.
(٤) کتێبی فتاوى في التوحيد > وەڵامی پرسیاری ژمارە: ٢١.

دەستکردەکان بکات و حوکمە شەڕعییەکان هەڵوەشێنێتەوە ئەوا عەلمانیە. هەروەها هەر کەسێک حەڕامکراوەکان بە ئاسایی و ئازادیی دابنێت، وەکو: زینا و مەیخۆریی و گۆرانی و کڕین و فرۆشتنی ڕیبا، هەروەها باوەڕی وابێت کە ڕێگرتن لەم شتانە زیانی هەیە بۆ سەر مرۆڤەکان، هەروەها سوور بوو لەسەر شتێک کە مەسڵەحەتی نەفس و ئارەزووی تێدابێت، ئەوا ئەو کەسە عەلمانیە. هەروەها هەر کەسێک ڕێگریی سزایە شەڕعییەکان بکات یاخود بەدڵی نەبێت، وەکو: کوشتنی بکوژ، هەروەها بەردباران کردن و قامچی لێدان لە داوێنپیس و مەیخۆر، یاخود بڕینی دەستی دز. ئیتر ئەو کەسە بانگەشەی ئەوە بکات گوایە ئەنجامدانی ئەم سزایانە پێچەوانەی نەرمونیانین و ئەم سزایانە ناپەسند و بێزراون، ئەوا ئەو کەسە چووەتە ناو عەلمانیەتەوە.

سەبارەت بە حوکمی ئیسلام بۆ ئەو کەسانە: ألله -تعالی- لە وەسفی جولەکەکان گووتی: {... ئەوە ئێوە باوەڕ بە بەشێکی کتاب دەهێنن (واتە قورئان) هەروەها کوفر بە بەشێکی دەکەن؟! جا پاداشتی ئەو کەسە چییە کە وابکات جگە لە سەرشۆڕیی لە ژیانی دونیا}. جا هەر کەسێک ئەو بەشەی ئیسلام قبوڵ بکات کە لەگەڵی دەگونجێت وەکو بابەتە شەخسییەکان و هەندێک عیبادەت، هەروەها ئەو بەشەش ڕەت بکاتەوە کە لەگەڵ ئارەزووەکانی ناگونجێن، ئەوا دەچێتە ژێر مەبەستی ئایەتەکە.

ئەوەتا ألله -تعالی- دەفەرمووێت: {هەر کەسێک ژیانی دونیا و جوانییەکەی دەوێت ئەوا ئێمە بەرهەمی کردەوەکانیان پێدەدەین هەر لەوێدا، هەروەها کەموکوڕیان لەگەڵ ناکرێت}. جا عەلمانییەکان ئامانجیان بریتییە لە کۆکردنەوەی دونیا و چێژ وەرگرتن و شەهەوات ئەگەرچی حەڕامکراویش بێت، ئەگەرچی ڕێگریش لە بەردەم واجبە شەڕعییەکان دروست بکات، بۆیەش دەچنە نێو مەبەستی ئایەتەکە، هەروەها ئایەتی ألله -تعالی-: {هەر کەسێک ئەم دونیایەی بوویێت ئەوا ئێمە پەلەی بۆ دەکەین لەو شتەی کە خۆمان بمانەوێت و بۆ ئەو کەسەی کە خۆمان بمانەوێت، ئینجا دۆزەخمان بۆی داناوە کە بە لۆمەکراویی و دەرکراویی دەگەیەنرێت پێی}. هەروەها ئایات و فەرموودەکانی لەم جۆرە. والله أعلم».

هەروەها دووبارە شێخ إبن جبرين –رحمه الله– لەدوای ئەوەی باسی دوو جۆرەکەی عەلمانییەکان دەکات کە یەکێکیان خۆی وەکو دۆستی دینەکان پیشان دەدات و ئەوەی تریش خۆی وەکو دوژمنی دینەکان پیشان دەدات، ئیتر دەڵێت: **«والخلاصة: أن العلمانية بصورتيها السابقتين كفر بواح لا شك فيها ولا ارتياب، وأن من آمن بأي صورة منها وقبلها فقد خرج من دين الإسلام والعياذ بالله؛ وذلك أن الإسلام دين شامل كامل، له في كل جانب من جوانب الإنسان الروحية، والسياسية، والإقتصادية، والأخلاقية، والإجتماعية، منهج واضح وكامل، ولا يقبل ولا يجيز أن يشاركه فيه منهج آخر.»**[١].

واتە: **«پوختەی باسەکە: ئەوەیە کە عەلمانیەت بەهەردوو جۆرەکەی کە پێشتر باسکران بریتین لە کوفری بەواح و ڕۆشن، هیچ گومان و دوودڵییەک لەمەدا نییە. هەر کەسێکیش باوەڕی بە هەر کامێک لە جۆرەکانی هەبێت و قەبوڵی بکات ئەوا لە ئیسلام چووەتە دەرەوە پەنا بە ألله؛ ئەمەش چونکە ئیسلام دینێکی فراوان و تەواوە، لە هەموو ڕووێکی مرۆڤەکانەوە مەنهەجێکی ڕوونی هەیە، وەکو ڕووی ڕۆحیی و سیاسی و ئابووری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیی. بۆیەش ئیسلام قەبوڵ ناکات و بە دروستی نازانێت لەگەڵ مەنهەجێکی تر هاوبەش بێت»**.

**بیستەم: محمد جميل زينو –رحمه الله– (ساڵی ١٤٣١ ی هیجری مردووە):**

شێخ محمد جميل زينو –رحمه الله– لە زنجیرەی پەیامەکانیدا ژمارەیەک خاڵی داناوە بە ناونیشانی "نواقض الإسلام" واتە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، واتە هەرکەسێک بکەوێتە ناو یەکێکیان ئەوا ئیمانی نەماوە و پێی کافر بووە.

بۆیەش هۆشداریی بە ئوممەت دەدات تاکو خۆمان لێیان بپارێزین. جا لە خاڵی ١٥ تا ١٩ و هەروەها لە خاڵەکانی ٢١ و ٢٢ و ٢٤ بە بەڵگەوە دەڵێت:

---

(١) کتێبی العلمانية وثمارها الخبيثة > صور العلمانية > لاپەڕی ژمارە: ١٨.

«١٥- الحكم بغير ما أنزل الله إذا اعتقد عدم صلاحية حكم الإسلام أو أجاز الحكم بغيره لقوله تعالى: {ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون}[١].

١٦- التحاكم لغير الإسلام، وعدم الرضا بحكم الإسلام، أو يرى في نفسه ضيقا وحرجا في حكمه لقوله تعالى: {فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما}[٢].

١٧- إعطاء غير الله حق التشريع كالديكتاتورية، أو الديمقراطية، أو غيرها ممن تسمح بالتشريع المخالف لشرع الله. لقوله تعالى: {أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله}[٣].

١٨- تحريم ما أحل الله، أو تحليل ما حرم الله كتحليل الزنى أو الربا غير متأول، لقوله تعالى: {... وأحل الله البيع وحرم الربا ...}[٤].

١٩- الإيمان بالمبادئ الهدامة، كالشيوعية الملحدة، أو الماسونية اليهودية، أو الاشتراكية الماركسية، أو العلمانية الخالية من الدين، أو القومية التي تفضل غير المسلم.

٢١- مناصره اليهود والنصارى والشيوعين ومعاونتهم على المسلمين لقوله تعالى: {لا يتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله في شيء إلا أن تتقوا منهم تقاة ...}[٥].

٢٢- عدم تكفير الشيوعين المنكرين لوجود الله، أو اليهود والنصارى الذين لا يؤمنون بمحمد - صلى الله عليه وسلم - ، لأن الله كفرهم فقال: {إن الذين كفروا من

---

(١) سوڕەتی المائدة، ئایەی ٢٢.

(٢) سوڕەتی النساء، ئایەی ٦٥.

(٣) سوڕەتی الشورى، ئایەی ٢١.

(٤) سوڕەتی البقرة، ئایەی ٢٧٥.

(٥) سوڕەتی آل عمران، ئایەی ٢٨.

أهل الكتاب والمشركين في نار جهنم خالدين فيها أولئك هم شر البرية}[1].

٢٤- القول بانفصال الدين عن الدولة، وأنه ليس في الإسلام سياسة حكم لأنه تكذيب للقرآن والحديث والسيرة النبوية.»[2].

واته: «١٥- حوكم كردن به غەیری شەریعەتی ألله له حاڵەتێک که کەسەکە حوکمی ئیسلام به باش و گونجاو نەزانێت یاخود بەلایەوە ئاسایی و شەرعیی بێت کەوا حوکم به غەیری ئیسلام بکات. هەروەک ألله فەرموویەتی: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە کافرن}.

١٦- گەڕاندنەوەی حوکم و دادگەرێتیی بۆ غەیری شەریعەتی ئیسلام، هەروەها ڕازی نەبوون به حوکمی ئیسلام، یاخود دەروونی توند بێت و نیگەران بێت به حوکمی ئیسلام. هەروەک ألله فەرموویەتی {نەخێر سوێند به پەروەردگارت (ئەی محمد) ئەوان ئیمان ناهێنن تاکو تۆ نەکەن به دادگەر له ناکۆکی نێوانیان، هەروەها لەناو دەروونیاندا هیچ دڵتەنگییەکیان نەبێت بەرامبەر حوکمدانەکەت، هەروەها تەسلیم ببن به تەسلیم بوونێکی تەواو}.

١٧- پێدانی مافی داڕشتنی شەریعەت بۆ غەیری ألله، وەکو شەریعەتی دیکتاتۆریی یاخود دیمۆکراسیەت یاخود هی تریش لەو شەریعەتانەی که ڕێگا دەدەن به داڕشتنی یاسای پێچەوانەی شەریعەتی ألله، ئەمەش چونکه ألله دەفەرموێت: {یان ئایا ئەوان هاوبەش و شەریکیان هەیە کەوا شەریعەتیان بۆ دادەڕێژن لەکاتێکدا ألله مۆڵەتی پێ نەداوە؟!}.

١٨- حەڕام کردنی ئەو شتانەی که ألله حەلالی کردوون، یاخود حەلال کردنی ئەو شتانەی که ألله حەڕامی کردوون، وەکو حەلال کردنی داوێنپیسی و ڕیبا. هەروەک ألله فەرموویەتی: {... ألله کڕین و فرۆشتنی حەلال کردووە و ڕیباشی حەڕام کردووە ...}.

---

(١) سوڕەتی البينة، ئایەی ٦.

(٢) کتێبی مجموعة رسائل التوجيهات الإسلامية لإصلاح الفرد والمجتمع > بەرگی یەکەم > نواقض الإسلام.

**١٩- باوەڕهێنان بە کۆمەڵێک بنچینەی وەکو شیوعیەتی مولحید، یاخود ماسۆنیەتی جولەکە، یاخود شەریعەتی ئیشتیراکیەتی ماڕکسیەت، یاخود عەلمانیەتی دابڕاو لە دین، یاخود نەتەوەپەرستی کە هۆکارێکە بۆ خۆشویستن و پایەدارکردنی ناموسڵمان.**

**٢١- سەرخستنی جولەکە و گاورەکان و شیوعییەکان، هەروەها هاوکاریکردنیان لەدژی موسڵمانان، هەروەک ألله -تعالی- فەرموویەتی: {نابێ باوەڕداران کافرەکان بکەن بە پشتیوانی خۆیان لەبری باوەڕداران، هەر کەسێک وابکات ئەوا هیچی لەگەڵ ألله نەماوە، مەگەر کەسێک لەبەر ترس وابکات ...}.**

**٢٢- تەکفیر نەکردنی شیوعییەکان کەوا بوونی ألله ڕەت دەکەنەوە، یاخود جولەکە و گاورەکان کەوا باوەڕ بە محمد ناهێنن -صلی الله علیه وسلم-؛ چونکە ألله تەکفیری کردوون و فەرموویەتی: {ئەوانەی کە کافربوون لە ئەهلی کیتاب (واتە جولەکە و گاور) هەروەها موشریکەکانیش ئەوانە شوێنیان ئاگری دۆزەخە و بە نەمریی تێیدا دەمێننەوە، ئەوان خراپترینی بوونەوەرەکانن}.**

**٢٤- گووتن و دابڕاندنی دین لە دەوڵەت، یاخود گووتنی ئەوەی کە گوایە ئیسلام هیچ حوکمێکی نییە بۆ سیاسەت کردن؛ ئەم قسەیە بەدرۆخستنەوەی قوڕئان و فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەرە»).**

بەڵێ ئەی قەومەکەم ئەمانە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامن و هەر کەسێک یەکێک لەم نیشانانەی تێدا هەبێت، یاخود خۆشەویستی بۆ کەسێک هەبێت کەوا ئەم نیشانانەی تێدایە، هەروەها پاڵپشتی بکات و زاڵی بکات بەسەر ئەهلی ئیسلام و تەوحید، ئەوا بێگومان ئەو کەسە کافرە.

هەر هەموو خاڵەکانی سەرەوە لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت خۆیان دەبیننەوە؛ چونکە دیمۆکڕاسیخوازەکان دەیانەوێ برایەتییەک دروست بکەن لەنێوان موسڵمان و موشریک و شیوعی و گاور و جولەکە! هەروەها دیمۆکڕاسیخوازەکان بە هەموو جۆرێک دژی تەکفیر کردنن! هەروەها دیمۆکڕاسیخوازەکان دینیان دابڕاندووە لە

سیاسەت، هەروەها دێمۆکڕاسیخوازەکان حەلال و حەڕامەکانیان بەپێی ئارەزووی پەڕلەمانتارە تاغوتەکان داڕشتووە نەک بەپێی فەرمانی ألله و نێردراوەکەی. ئیتر ئەی قەومەکەم چۆن موماڕەسەی ئەم شەریعەتە پیسە دەکەن؟ چۆن پەنجەی شایەتومانتان تێیدا مۆر دەکەن و دەنگ دەدەن؟! هێشتا تێنەگەیشتن سەرئەنجامی ئەم کارە کافر بوونە؟

بۆیەش شێخ محمد جمیل زینو –رحمه الله– لە کۆتایی خاڵەکاندا دەڵێت: «**إن هذه المبطلات أشبه بنواقض الوضوء، فإذا فعل المسلم واحدا منها، فليجدد إسلامه، وليترك المبطل، وليتب إلى الله قبل أن يموت فيحبط عمله، ويخلد في نار جهنم قال تعالى: {... لئن أشركت ليحبطن عملك ولتكونن من الخاسرين}**»[1].

واتە: «**ئەم هەڵوەشێنەرانەی ئیمان وەکو هەڵوەشێنەرەوەکانی دەستنوێژن، واتە ئەگەر موسڵمان یەکێک لەوانە ئەنجام بدات ئەوا پێویستە ئیسلامەکەی نوێ بکاتەوە، هەروەها وازبهێنێت لە هەڵوەشێنەرەکە، هەروەها تەوبە بکات بۆ لای ألله پێش ئەوەی بمرێت، ئەگینا کردەوەکانی هەڵدەوەشێنەوە و شوێنی هەمیشەیی هەر ئاگر دەبێت. هەروەک ألله فەرموویەتی: {... ئەگەر شیرکت ئەنجامدا ئەوا کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە و لە ڕیزی دۆڕاوەکان دەبیت}**».

---

(١) سورەتی الزمر، ئایەی ٦٥.

**بیست و یەکەمین: خالد بن علي المرضي الغامدي -حفظه الله-:**

شێخ خالد المرضي -حفظه الله- یەکێکە لەو زانایانەی ئەم سەردەمە کە زۆرترین بانگەوازی بۆ تەوحید کردووە بەبێ ئەوەی گوێی دابێتە لۆمەی لۆمەکاران، زۆرترین بانگەوازی بۆ "کوفر بە تاغوت" کردووە لەسەر بنەمای ئایاتەکانی ألله -سبحانه وتعالى.

لە کتێبێکیدا بەشێوازێکی زۆر فراوان باسی "شرك الحكم" دەکات، ئینجا لە باسی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت دەفەرمووێ: «**والديمقراطية تعتبر دينا باطلا ومن دان بها وفرح بها فهو كافر خارج عن الملة**»[1].

واتە: «**دێمۆکڕاسیەت دینێکی پووچەڵە، هەر کەسێک دینداریی پێ بکات (واتە مومارەسەی بکات) و هەروەها دڵی پێ خۆشبێت ئەوا کافرە و لە دەرەوەی ئیسلامە**».

نامەوێ لێرەدا لەم گوفتارەی زیادتر دابنێم؛ چونکە ئەسڵەن شێخ خالد هەر کتێبێکی تەواوی لەمبارەیە داناوە و زۆر بەسوودە بۆ هەر کەسێک کەوا خۆی بە موسڵمان بزانێت و حەقی بووێت، جا داوا لە خوێنەران و ڕاستیخوازەکان دەکەم کتێبەکەی بخوێننەوە کە لە تێبینی ژێرەوەی ئەم لاپەڕەیە ناویم داناوە، کتێبێکی زۆر فراوانە و پڕیەتی لە بەڵگەی قوڕئان و فەرموودەی صحیح و گوفتاری گەورە زانایانی ئیسلام، هەروەها وەڵامی ڕەخنە و گومانێکی زۆر زۆری داوەتەوە، ألله بیکاتە توێشووی دونیا و قیامەتی شێخ خالد المرضي -حفظه الله.

---

(١) کتێبی شرك الحكم > الفصل السابع > مبحث: الديمقراطية.

**بیست و دووەمین: صالح الفوزان -حفظه الله-:**

شێخ صالح الفوزان بەهەمان شێوەی شێخ إبن عثیمین -رحمه الله- ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەگەر شەریعەتێکی دەستکرد بکرێتە سەرچاوەی سەرەکیی بۆ حوکمڕانی کردنی خاکەکە بەشێوەیەکی فراوان (وەکو دیمۆکڕاسیەت) ئەوا دەسەڵاتدار و حاکم و دادوەرەکان بەهۆیەوە لە ئیسلام دەچنە دەرەوە. بۆیەش لەدوای ئەوەی گوفتارێکی شێخ محمد بن إبراهیم دادەنێت، ئیتر دەڵێت: «**ففرق -رحمه الله- بين الحكم الجزئي الذي لا يتكرر، وبين الحكم العام الذي هو المرجع في جميع الأحكام، أو غالبها، وقرر أن هذا الكفر ناقل عن الملة مطلقا؛ وذلك لأن من نحى الشريعة الإسلامية، وجعل القانون الوضعي بديلا منها، فهذا دليل على أنه يرى أن القانون أحسن وأصلح من الشريعة، وهذا لا شك أنه كفر أكبر يخرج من الملة ويناقض التوحيد**»[1].

واتە: «**بۆیەش ئەو -رحمه الله- (واتە شێخ محمد بن إبراهیم) جیاوازیی کرد لەنێوان حوکمێکی تایبەت کەوا دووبارە نابێتەوە، لەگەڵ حوکمێکی گشتی کەوا سەرچاوەی هەموو یاخود زۆرینەی حوکمەکانە، هەروەها گووتی کەوا ئەم جۆرە کوفرە مرۆڤەکە دەخاتە دەرەوەی دین بەگشتیی؛ چونکە هەر کەسێک شەریعەتی ئیسلام لابەرێت و یاسای دەستکرد بخاتە شوێنی، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسە یاسایەکەی خۆی بە باشتر و چاکتر دەزانێت لە شەریعەتی ئیسلام، ئەمەش گومانی تێدا نییە کەوا کوفری گەورەیە و کەسەکە دەخاتە دەرەوەی ئیسلام و تەوحید هەڵدەوەشێنێتەوە**».

هەروەها شێخ صالح الفوزان لە شەڕحی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: **{ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم ءامنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا}**[2].

---

(١) کتێبی عقيدة التوحيد وبيان ما يضادها من الشرك الأكبر والأصغر والتعطيل والبدع وغير ذلك > باب الرابع: أقوال وأفعال تنافي التوحيد أو تنقضه > الفصل السادس: الحكم بغير ما أنزل الله.

(٢) سورەتی النساء، ئایەی ٦٠. بۆ زانینی مانا و ڕوونکردنەوەی بگەڕێوە بۆ لاپەڕی ٧ بەدواوە.

لە شەڕحەکەیدا دەفەرمووێت: «فالمؤمن بالله وبرسوله يحكم كتاب الله وسنة رسوله -صلى الله عليه وسلم-، أما الذي يدعى الإيمان ولكنه في الحكم لا يرجع إلى الله ولا إلى رسول الله، فهذا ليس بمؤمن، ولهذا قال "يزعمون" والزعم هو أكذب الحديث، وهذا يدل على أنهم كاذبون في دعواهم الإيمان، والدليل على كذبهم: أنهم يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت، ولو كان إيمانهم صادقا لم يتحاكموا إلا إلى كتاب الله وسنة رسول الله.

فدل هذا على أن إرادة التحاكم إلى غير كتاب الله وسنة رسول الله -مجر الإرادة والنية- يتنافى مع الإيمان، فكيف إذا فعل؟ كيف إذا فعل وتحاكم إلى غير كتاب الله وسنة رسوله؟ إذا كان من نوى بقلبه واستباح هذا الشيء ولو لم يفعل غير مؤمن، فكيف بمن نفذ هذا وتحاكم إلى غير كتاب الله وسنة رسوله في أموره كلها، أو في بعضها؟»[١].

واتە: «ئەو کەسەی ئیمانی بە ألله و نێردراوەکەی هەیە ئەوا حوکم دەکات بە کتێبەکەی ألله و سوننەتی نێردراوەکەی -صلى الله عليه وسلم-، بەڵام ئەو کەسەی بانگەشەی ئیمانداریێتی خۆی دەکات بەڵام لە حوکمڕانی و دادگەریێتیدا ناگەڕێتەوە بۆ حوکمی ألله و نێردراوەکەی، ئەو کەسە ئیماندار نییە. هەر بۆیەش ألله فەرمووی "يزعمون"، الزعم واتە گوفتاری درۆ. ئەمەش دەیسەلمێنێ کەوا ئەوان لە بانگەشەی ئیمانداریيەکەیاندا درۆ دەکەن. بەڵگەش لەسەر درۆزن بوونیان ئەوەیە کە دەیانەوێت حوکم و دادگەریێتیی بۆ لای تاغوت بگەڕێننەوە، جا ئەگەر ڕاستگۆ بوونایە لە ئیمانەکەیان ئەوا حوکم و دادگەریێتیان تەنها بۆ کتێبی ألله و سوننەتی نێردراوەکەی دەگەڕاندەوە.

ئەمە دەیسەلمێنێ کەوا تەنها هەبوونی ئیرادە و نیەتێک بۆ ئەوەی حوکم و دادگەریێتیی بۆ لای غەیری کتێبەکەی ألله و سوننەتی نێردراوەکەی بگەڕێندرێتەوە وادەکات ئیمان لەناوبچێت، جا ئەی دەبێ چی ڕووبدات ئەگەر کەسەکە بە کرداریش بیکات؟! ئەی

---

(١) کتێبی إعانة المستفيد بشرح كتاب التوحيد > بەرگی دووەم > باب قوله تعالى: {ألم تر إلى الذين يزعمون ...} > لاپەڕی ژمارە ١٦٦ و ١٦٧.

**دەبێ چی ڕووبدات ئەگەر بە کردەوە حوکم و دادگەرێتیی گەڕاندەوە بۆ غەیری کتێبی ألله و سوننەتی نێردراوەکەی؟! ئەگەر کەسێک ئیمانی تێدا نەمابێت لەکاتێکدا تەنها لە دڵیدا ئەم کردەوەیە بە ئاسایی بزانێت بەبێ ئەوەی ئەنجامی بدات، جا دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە بە کردەوە جێبەجێی بکات و حوکم بگەڕێنێتەوە بۆ لای غەیری کتێبەکەی ألله و سوننەتی نێردراوەکەی؟!**».

ئەی قەومەکەم، هەموو گوفتاری ئەم زانایانە سەلمێنەری ئەوەن کە هەموو شەریعەتە دەستکردەکان تاغوتن و دەبێ کوفریان پێ بکرێت و پشتیان لێ بکرێت و هیچ دروشمێکیان مومارەسە نەکرێت، هەروەها دەبێ تەکفیری هەر کەسێکیش بکرێت کە باوەڕی بە یەکێک لەم شەریعەتە دەستکردانە هەبێت یاخود مومارەسەی بکات، ئەگەرچی خۆیشی بە موسڵمان بزانێ.

## بابەتی دووەم: دەنگدانی تۆ مانای چی دەگەیەنێت؟

ئەی ئەو کەسەی خۆت بە موسڵمان دەزانیت، ئەگەر خۆت ئامادە کردووە بۆ ڕۆژی دەنگدان تاکو بچیت و پەنجەی شایەتومانت مۆر بکەیت و مرۆڤێک هەڵبژێریت، پێویستە بزانیت کە دەنگدان تەنها مۆرکردنی پەنجە و هەڵبژاردنی مرۆڤ نییە، بەڵکو بابەتەکە لەوە فراوانترە و پێویستە مرۆڤ زۆر لەوە هۆشیارتر بێت.

ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت دەنگ بدەیت و موماڕەسەی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت بکەیت، بزانە ئەمەیە مانای دەنگدان:

١- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا هیچ ئاگاداری تەوحید نییە و کوفریشی بە تاغوتەکان نەکردووە و ئەسڵەن نازانێت تاغوتەکان چین؛ چونکە مرۆڤ تەنها بەکورتیی بزانێت تەوحید چییە ئەوا بەسیەتی بۆ ئەوەی کوفر بە دیمۆکڕاسیەت بکات و ئەو کەسانەش تەکفیر بکات کە موماڕەسەی دیمۆکڕاسیەت دەکەن. (لە بەشی سێیەمدا بە پوختی و بە بەڵگەوە تەوحیدم بۆتان ڕوون کردووەتەوە کە پێویستە هەموو مرۆڤێک بیزانێت).

٢- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا تاکو ئێستا قوڕئانی پیرۆزی بە تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە نەخوێندووەتەوە؛ چونکە مرۆڤ ئەگەر قوڕئان بە تێگەیشتن و تەفسیر و وردبوونەوە بخوێنێتەوە ئەوا یەکسەر دەگاتە ئەو بیروباوەڕەی کە هەموو شەریعەتەکان تاغوتن جگە لە شەریعەتی ألله. بۆیەش لێیان دوور دەکەوێ و کوفریان پێدەکات، هەروەها ئەو کەسانەش تەکفیر دەکات کە باوەڕیان بە شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکە هەیە. ئەوەتا من –بە فەزڵی ألله– لە لاپەڕی ١٤ تا ١٢٥ تەنها بە بەڵگەی قوڕئان و فەرموودەی صحیح سەلماندم دیمۆکڕاسیەت شەریعەتێکی تاغوتە و ئەوانەیشی باوەڕیان پێیەتی یاخود موماڕەسەی دروشمەکانی دەکەن ئەوا کافرن.

٣- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا ڕازییە بەوەی سیفەتی یاسادانان (التشریع) لە ألله بسەندرێتەوە و بدرێتە مرۆڤ؛ چونکە بێگومان کاتێک تۆ دەچیت و پەنجەی شایەتومانت مۆر دەکەیت بۆ هەڵبژاردنی مرۆڤێک ئەوا ئەم کارەت دەیسەلمێنێ تۆ باوەڕت بەو مرۆڤە هەیە و پێت خۆشە یاسا دابڕێژێ، ئیتر ئەویش دەبێتە پەڕلەمانتار، ئەرکی پەڕلەمانتاریش ئەوەیە کە یاسا دابنێت و پەرە بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت بدات. هەموو ئەمەش لەکاتێکدایە کەوا سیفەتی داڕشتنی شەریعەت و یاسادانان تەنها مافی ألله یە و کەس بۆی نییە شەریعەت و یاسا دروست بکات بەپێی ویستی دڵی خۆی یاخود بەپێی دڵی خەڵک. بەڵام تۆی دەنگدەر هەموو ئەم ئایاتانە ڕەت دەکەیتەوە کەوا لە لاپەڕی ٣٥ تا ٣٨ باسکراون لەم بارەیەوە. بۆیەش تۆ بەهۆی دەنگدانەوە مرۆڤێک دەکەیتە خودا ئەویش یاسات بۆ دادەڕێژێ نەک لەسەر بنەمای قورئان بەڵکو لەسەر بنەمای خواستی خەڵک و پەڕلەمانتارەکانی تر. بەمەش وەکو گاورەکانت لێدێت کاتێک قەشە و پاپاکانیان کردبووە خودای خۆیان و ئەوانیش یاسایان بۆ دادەنان بەدڵی خۆیان، کەواتە شیرکەکەیان لەڕووی پەرستن نەبوو بەڵکو لەڕووی یاسادانان بوو.

٤- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا ڕێباز و شەریعەتی ئەمریکیی و ئەوڕوپییە کافرەکان بە باشتر دەزانێت لە شەریعەتی ألله، بۆیەش مومارەسەی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتەکەی ئەوان دەکات و گوێ بەو هەموو ئایاتە نادات کە دەیسەلمێنن دیمۆکڕاسیەت تاغوتە و شیرکە و کوفرە و ئیتر پێی لەدین دەچیتە دەرەوە، بۆیەش بەهۆی دەنگدانەکەیەوە دین و ئیمان و شەریعەتی ألله دەفرۆشێت لەپێناوی مومارەسە کردنی شەریعەتە دەستکردەکەی ئەوڕوپی و ئەمریکییەکان.

٥- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا هیچ کێشەیەکی نییە لەگەڵ بنچینە و بیروباوەڕی دیمۆکڕاسیخوازەکان کەوا باوەڕیان بە ئازادیی بیروباوەڕ و ئازادیی بیروڕا و ئازادیی تاکەکەسیی هەیە؛ چونکە گومان لەوە نییە کە هەموو کاندیدەکان باوەڕیان بە دیمۆکڕاسیەت و بنچینەکانی هەیە، ئەگەر باوەڕیان پێی

نەبووایە ئەوا ئەسڵەن ڕێگایان پێ نەدەدرا خۆیان کاندید بکەن. بۆیەش ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت دەنگ بدەیت، بزانە تۆ پەنجەی شایەتومانت مۆر دەکەیت بۆ مرۆڤێک کە باوەڕی بە ئازادیی مرۆڤەکان هەیە لە ڕووی بیروباوەڕەوە، لەکاتێکدا لە لاپەڕی ٣٩ تا ٤٧ بەبەڵگەی ئایەت سەلماندم هەرکەسێک ئەم بیروڕایەی هەبێت ئەوا لەدین دەچێتە دەرەوە. هەروەها ئەو کەسەی تۆ دەنگی پێدەدەی باوەڕی بە ئازادیی ڕادەربڕین هەیە و کێشەی نییە لەوەی مرۆڤ هەرچی بڵێت ئەگەرچی کوفریش بێت! لەکاتێکدا لە لاپەڕی ٤٨ تا ٥٣ بەبەڵگەی ئایەت و فەرموودە سەلماندم هەر کەسێک ئەم بیروڕایەی هەبێت ئەوا کافرە ئەگەرچی بڵێت موسڵمانم. هەروەها ئەو کەسەی کە تۆ دەنگی پێدەدەی باوەڕی بە ئازادییە تاکەکەسییەکان هەیە، واتە کەس بۆی نییە سنووری کەسی تر ببەزێنێ و لێپرسینەوە لەگەڵ کەسی تر بکات ئەگەر سنووری دەستوورە تاغوتەکەیانی نەبەزاندبێ، تەنانەت ئەگەر حەڕام و کوفریش ئەنجام بدات ئەوا هەر ئازادە مادام دژی دەستوورە بۆگەنەکەیان نییە! کەواتە ئەو کاندیدە ئەسڵەن باوەڕی بە "الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر" نییە، بەهەمان شێوە لە لاپەڕی ٥٤ تا ٦٤ سەلماندم ئەم خاڵەش کوفری گەورەیە و ئەوەی بیروباوەڕی وابێت ئەوا لەدین دەچێتە دەرەوە. بەڵێ ئەمە بیروباوەڕی ئەو کەسانەیە کە تۆ دەنگیان پێدەدەی و پەنجەی شایەتومانیان بۆ مۆر دەکەیت و باوەڕیان پێدەهێنیت و خۆشت دەوێن.

٦- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا ڕێگا بۆ مرۆڤەکە خۆشدەکات تاکو بگاتە پەڕلەمان، لەوێدا سوێندە کوفرەکە دەخوات کە لە لاپەڕی ١٠٣ باسکرا، ئینجا دەستیشی لەسەر کتێبی ألله دادەنێت لەکاتی سوێندەکە! هەروەک لە لاپەڕی ١٠٤ یش باسم کرد کەوا لەناو سوێندخواردنەکەدا پێنج دانە کوفری گەورەی تێدایە و بەبەڵگەی فەرموودەی صحیح سەلماندم کەوا ئەگەر پەڕلەمانتارەکە لەدڵیشی باوەڕی بە سوێندەکە نەبێت ئەوا هەر پێی کافر دەبێت چونکە لەسەر فەرمانی دەستوور سوێندی خواردووە. جا هاوار بۆ حاڵی ئەو پەڕلەمانتارە تاغوتە، هاوار بۆ حاڵی ئەو کەسانەی پەنجەیان بۆی مۆر کردووە و خۆشیاندەوێت.

٧- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا لەسەر بنەمای تاوان و کوفر هاوکاریی مرۆڤەکە دەکات و پشتگیریی دەکات، نەک لەسەر بنەمای ئیمان و تەقوا. بۆیەش دەنگدەرەکە بەپێچەوانەی فەرمانی ألله دەجووڵێتەوە و دەچێت دەنگ دەدات لەکاتێکدا ألله –عز وجل– فەرموویەتی: {**... وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان ...**}[1]. واتە: {... هاوکاری یەکتر بکەن لەسەر چاکە و تەقوا، هەروەها هاوکاری یەکتر مەکەن لەسەر خراپەکاریی و دەستدرێژیی ...}.

جا ئەو کەسەی دەنگ دەدات و مرۆڤەکە دەنێرێتە پەڕڵەمان ئەوا لەوێدا ئەو پەڕڵەمانتارە تاغوتە خەریکی ئەنجامدانی "إثم" و "عدوان" دەبێت، واتە ئەم پەڕڵەمانتارە هەم خراپەکاریی ئەنجام دەدات و یاسایە دەستکردە کوفرینەکان بەرهەم دەهێنێت و دەیکاتە دەستوور و شەریعەتێک بۆ سەر قەومەکە، هەمیش دەستدرێژیی دەکاتە سەر دینی ألله، حەلالەکان قەدەغە دەکات ئەگەر دژی دیمۆکراسیەت و خواستی پەڕڵەمانتاران بێت! هەروەها حەرامەکان بە ئاسایی دادەنێت و قەدەغەیان ناکات مادام خەڵکەکە ئارەزوویان لێیەتی و دژی دیمۆکراسیەت نییە!

**جا لێرەدا کەسانێک دەڵێن:** کاکە من دەنگم داوەتە پەڕڵەمانتارێکی دیندار، ئەو کاری وا ناکات لە پەڕڵەمان.

منیش دەپرسم: ئەگەر ئەو بە برای خۆت دەزانی و بە موسڵمانی دەزانیت ئەوا بۆچی ڕێگای پێدەدەی موماڕەسەی تاغوت بکات؟ بۆچی هانی دەدەیت و پەنجەی شایەتومانی بۆ مۆر دەکەیت تاکو بگاتە پەڕڵەمان و لەوێدا بەتەواویی کافر بێت و سوێندە کوفرەکە بخوات؟ مەگەر ئەمە ناچێتە ژێر مانای "هاوکاریکردن لەسەر بنەمای خراپە"؟!

خۆ ئەگەر ناتوانیت هۆشداریی پێبدەیت لەوەی دیمۆکراسیەت کوفرە و تاغوتە، ئەوا خۆ دەتوانیت پەنجەی شایەتومانت بۆی مۆر نەکەیت و هانی نەدەیت و نەبیتە

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٢.

هۆکارێک بۆ زۆرتر نوقم بوونی مرۆڤەکە لەناو دیمۆکڕاسیەتی تاغوت، هەروەک نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– فەرموویەتی: «**"انصر أخاك ظالما أو مظلوما". قالوا: يا رسول الله هذا ننصره مظلوما، فكيف ننصره ظالما؟ قال: "تأخذ فوق يديه"**»[١]. واتە: «**"براکەت سەربخە جا ئەگەر ستەمکار بوو یان ستەم لێکراو". هاوەڵان گووتیان: ئەی نێردراوی ألله، ئەوە ستەم لێکراوەکە سەردەخەین، بەڵام چۆن ئەو کەسە سەربخەین کەوا ستەمکارە؟ ئەویش فەرمووی: "دەستی بگرە"**».

جا مەبەست لە گوفتارەکەی پێغەمبەر –عليه السلام– ئەوەیە کە دەستی بگرە و بیگەڕێنەوە لە ئەنجامدانی زوڵم و ستەم، مەهێڵە ئەنجامی بدات. جا ئەگەر تۆ ئەوەندەشت پێ ناکرێت بۆ ئەو کاندیدە ڕیشدار و دیمۆکڕاسیخوازەی خۆی بە موسڵمان دەزانێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە بە دەنگدانەکەت پاڵپشتی مەکە. چونکە ئەگەر لە پەرلەمانیشدا هیچ یاسایەکی کوفر دەرنەکات ئەوا بەلایەنی کەمەوە بەهۆی سوێند خواردنەکەیەوە کافر بووە، ئەمەشم لە لاپەڕی ١٠٣ بەدواوە ڕوونکردەوە.

٨- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا پەرە بە دروشمێکی دیمۆکڕاسیەت دەدات لە خاکەکەی، ئەویش دروشمی "دەنگدان" ـە، ئەمەش زۆر جێگەی دڵخۆشییە بۆ دیمۆکڕاسیخوازەکان؛ چونکە ئەوان دەیانەوێت ڕێژەی ئەو کەسانە زۆر بێت کەوا بەشداریی لەم پرۆسەیە دەکەن، زۆرجاریش بیستوومانە چۆن شانازیی بە زۆربوونی ژمارەی دەنگدەران دەکەن. تەنانەت بە جۆرەها شێواز مرۆڤەکان ناچار دەکەن تاکو دەنگ بدەن. بۆیەش ئەی ئەو کەسەی دەتەوێت دەنگ بدەیت، موماڕەسەی دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت مەکە و ڕێژەی دەنگدەرانیان زۆر مەکە و دڵیان خۆش مەکە، بەڵکو لە ڕیزی ئەهلی ئیسلام و تەوحید بمێنەرەوە و دڵیان توند بکە و مەڕۆ بۆ دەنگدان.

٩- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا زۆرتر ئەگەری گەڕاندنەوە و

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب المظالم > باب أعن أخاك ظالما أو مظلوما > فەرموودەی ژمارە: ٢٤٤٤.

جێبەجێکردنی حوکمی ألله دادەبەزێنێت؛ ئەمەش چونکە هەرچەند دەنگدەران زۆرتر بن ئەوا دیمۆکڕاسیەت پەرە دەسێنێت، بەمەش ڕێگا بۆ دێمۆکڕاسیخوازەکان خۆشتر دەبێت تاکو لە هەموو ڕوویێک دێمۆکڕاسیەتەکەیان بسەپێنن و ڕەگیان داکوتن و مێشکی جیلە نوێیەکان بشۆرن بە ئاوی پیسی دێمۆکڕاسیەت.

١٠- ئەو کەسەی دەنگ دەدات مانای ئەوەیە کەوا خۆشەویستیی و پشتیوانیی بۆ ئەهلی کوفر و تاغوتپەرستەکان هەیە (واتە الولاء)، هەروەها پشتی لە ئەهلی ئیسلام و شەریعەتی ألله کردووە و ڕقی لێیانە (واتە البراء). ئەمەش لە کاتێکدایە کە ألله –تبارك وتعالی– پێمان ڕادەگەیەنێت کەوا خۆشەویستیی و پاڵپشتیتان بۆ ئەهلی ئیسلام هەبێت و زاڵیان بکەن، هەروەها ڕقتان لە ئەهلی کوفر ببێتەوە و بەڕائەتیان لێ بکەن. کەچی ئەو کەسەی دەنگ دەدات هیچ ئاگاداری "الولاء والبراء" نییە، بۆیەش لێی پێچەوانە بووەتەوە و ئەوەتا مومارەسەی دروشمی شەریعەتێکی تاغوت دەکات، بەڵام گوێ ناداتە ئەو هەموو ئایەت و فەرموودەیەی کەوا ئەهلی ئیسلام دەیخەنە بەر گوێی خەڵک لەبارەی دێمۆکڕاسیەت.

بەڕاستیی خاڵی تریش زۆر زۆرن، بەپێی ئەو لێکدانەوەیەی ئەنجاممدا، بۆم دەرکەوت هەر کەسێک دەنگ دەدات ئەوا پشتی هەڵکردووە لە نزیکەی ١٠٠ ئایاتی موحکەم و فەرموودەی صحیح! لەکاتێکدا ئەو ئایات و فەرموودانە دەیسەلمێنن شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت تاغوتە و پێویستە کوفری پێ بکرێت و شوێنکەوتەکانیشی بە کافر بزانرێت، کەچی ئەو کەسەی دەنگ دەدات ئەوا بێ ئاگایە لەم هەموو ئایاتەی قوڕئان، بەتایبەت کە هەموو ئایاتەکان عەقیدەیین، واتە پەیوەستن بە بیروباوەڕ، ناکرێت مرۆڤ خۆی پێ موسڵمان بێت و نەشزانێت لەکاتێکدا قوڕئان لەنێو ماڵ و مزگەوت و مۆبایلی هەبێت! **بۆیەش هیچ هیچ گومانێک نییە لەوەی هەر کەسێک بچێت و دەنگ بە مرۆڤێک بدات و پەنجەی شایەتومانی مۆر بکات، ئەوا دیارە کوفری بە تاغوت نەکردووە، بۆیەش گومان لە کافرێتییەکەی نییە تا ئەو کاتەی کوفر بە دێمۆکڕاسیەت و دێمۆکڕاسیخوازەکان نەکات.**

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

## گومانی یەکەم: کارکردنی یوسف -علیه السلام- لە حوکومەتی پاشاکە.

**بەر لەوەی وەڵامی گومانەکان بدەمەوە، وەکو پێشەکییەک دەڵێم:** بەگشتیی لە لاپەڕی ١٤ تا ١٢٥ الحمدلله توانیم شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت و بنچینە و دروشمەکانی شیبکەمەوە؛ تاکو قەومەکەم چاک بزانن ئەم شەریعەتە تاغوتە و دەبێ کوفری پێ بکرێت هەروەها پێویستە کوفر بە دێمۆکڕاسیخوازەکانیش بکرێت.

بەڵام لەم بابەتەدا ڕووی دەمم لە کەسانێکی ترە، ئەوانیش ئەو کەسانەن کە بەناوی ئیسلامەوە مومارەسەی ئیسلام دەکەن و باوەڕیان وایە دێمۆکڕاسیەت دژی هیچ ئایەتێکی قورئان نییە و ئەسڵەن دێمۆکڕاسیەت و ئیسلام هەمان شتن!! هەموو ئەمەش لە کاتێکدایە کەوا بەدرێژیی سەلماندمان ئەم شەریعەتە پیسە دژی نزیکەی ١٠٠ ئایەت و فەرموودەیە، هەروەها کێشەی ئیسلام لەگەڵ دێمۆکڕاسیەت پەیوەستە بە "تەوحید"، هەروەها پەیوەستە بە "الولاء والبراء"، هەروەها پەیوەستە بە لایەنی پەروەردگارێتی ألله (واتە الربوبیة). **کەواتە کێشەی ئیسلام لەگەڵ دێمۆکڕاسیەتدا کێشەیەکی عەقیدەییە،** کەچی کەسانێک دەڵێن: نەخێر ئەسڵەن ئیسلام دێمۆکڕاسیەتە!

بە دیاریکراویی ئەوانەی ئەم بیروباوەڕەیان هەیە بریتین لە "ئیخوان موسلیمین" و بەچکەکانیان لە سەرانسەری خاکی موسڵمانان، جا لە خاکی باشووری کوردستاندا سێ حیزبیان هەیە: کۆمەڵ، بزووتنەوە، یەکگرتوو. هەر هەموویان لەسەر مەنهەجی ئیخوان موسلیمین و حسن البنا ی گۆڕپەرست دەڕۆن و پڕ بەدڵیان باوەڕیان بە دێمۆکڕاسیەت و بنچینەکانی هەیە.

بەداخەوە ئەمانە یەکێکن لە کاریگەرترین پاڵنەرەکان بۆ چەسپاندنی شەریعەتی دێمۆکڕاسیەت لە خاکی موسڵمانان؛ چونکە ئەم قەومە زۆر نەزان و ساویلکەن، زۆریش بێئاگان لە دینەکەی ألله، بۆیەش کاتێک سەیری سیمای ئەم ئیخوانییانە

دەکەن و دەبینن کەسانێکی ڕیشدارن و قوڕئانخوێن و مەلان، ئیتر هەڵدەخەڵەتێن، دەڵێن دیارە دیمۆکڕاسیەت زۆر ئاساییە ئەگینا ئەم مەلایانە مومارەسەی ناکەن و خەڵکی بۆ بانگ ناکەن!

بێگومان ئیخوانییەکان (واتە حیزبە بەناو ئیسلامییەکان) کۆمەڵێک بەڵگەیان کۆکردووەتەوە بۆ شەرعیەتدان بە دیمۆکڕاسیەت، جا بە پێویستی دەزانم قەومەکەم ئاگادار بکەمەوە لەم حیزبە بەناو ئیسلامییانە، ئیتر با بزانین بەڵگەکانیان لەمبارەیەوە ڕاستە یان نا.

یەکێک لە شوبهە و بەڵگەکانیان ئەوەیە کە دەڵێن: بەشداربوون لە شەریعەتێکی دەستکرد کوفر نییە، چونکە ئەوەتا پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– بەشداربوو لە حوکومەتی پاشاکەی میسڕ سەرەڕای ئەوەی پاشاکە کافریش بوو و حوکومەتەکەش بە شەریعەتی تاغوت حوکمی دەکرد.

بە پێویستی دەزانم وەڵامی ئەم گومانەیان بەدرێژیی بدەمەوە؛ چونکە ئەمە زەقترین و بەهێزترین بەڵگەی ئیخوانییەکانە بۆ مومارەسە کردنی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت.

وەڵامی ئەم گومانەیان لە ٣ ڕوو دەدەمەوە:

**ڕووی یەکەم:** ئەو کەسانەی کە دەڵێن پێغەمبەر یوسف کاریکردووە لەناو شەریعەتێکی تاغوت، ئەوا دیارە ئەو کەسانە ألله بەدرۆ دەخەنەوە –پەنا بە ألله–؛ چونکە ألله فەرموویەتی کەوا بانگەوازی تێکڕای پێغەمبەران –علیهم السلام– لەپێناوی پەرستنی ألله بوو، هەروەها لەپێناوی دوورخستنەوەی خەڵک بوو لە تاغوتەکان، هەروەک ألله –عز وجل– فەرموویەتی: **{ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ...}**[1]. واتە: {بەڕاستیی ئێمە نێردراومان بۆ هەموو ئوممەتێک ناردووە بەوەی کە ألله بپەرستن و دوور بکەونەوە لە تاغوت ...}.

(١) سوڕەتی النحل، ئایەی ٣٦.

کەواتە نێردراوەکانی ألله بە قەومەکانیان ڕاگەیاندووە تاکو دووربکەونەوە لە تاغوت، یەکێک لە جۆرەکانی تاغوت بریتییە لە شەریعەتە دەستکردەکان، کەچی ئیخوانییەکان ئەم ئایەتە ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن: نەخێر پێغەمبەر یوسف موماڕەسەی شەریعەتێکی تاغوتی کرد لە سەردەمی خۆی!

ئەوەتا پێغەمبەر یوسف –علیه الصلاة والسلام– لەناو زیندان بە قەومەکەی دەگووت: {**... إن الحكم إلا لله ...**}[1]. واتە: {... حوکمدان تەنها بۆ ألله یە ...}.

هەروەها هەر لەناو زیندان بوو کاتێک بە قەومەکەی دەگووت: {**... یاصاحبي السجن ءأرباب متفرقون خير أم الله الواحد القهار**}[2]. واتە: {... ئەی دوو هاوڕێ زیندانییەکەم، ئایا کۆمەڵێک پەروەردگاری جیاواز بپەرسترێن یاخود ألله ی تاک و تەنها و بەدەسەڵات؟}.

ئەوەتا لەم دوو ئایەتەوە بەتەواویی بۆمان دەردەکەوێت کە پێغەمبەر یوسف _علیه السلام– ئەسڵەن دژی شەریعەتە تاغوتەکان بووە و بە قەومەکەی ڕاگەیاندووە کەوا حوکمدان و یاسادانان تەنها مافی ألله یە. تەنانەت لە ئایەتەی سەرەوە بە ئاشکرا بەو کەسانە دەڵێت "أرباب" کەوا یاسایان داڕشتبوو بۆ قەومەکە بەدڵی خۆیان.

ئایەتێکی تریشمان هەیە کە ألله –سبحانه وتعالى– فەرموویەتی: {**وكذلك مكنا ليوسف في الأرض ...**}[3]. واتە: {بە هەمان شێوە یوسفمان پایەدار و خاوەن دەسەڵات کرد لە زەویدا ...}.

**لەوانەیە بڵێن:** ئەم ئایەتە چۆن دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی یوسف حوکمی بە شەریعەتی ألله کردووە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: لە ئایەتەکەدا ألله وەسفی یوسف دەکات دەڵێت "مكنا ليوسف"،

---

(١) سوڕەتی یوسف، ئایەی ٤٠.

(٢) سوڕەتی یوسف، ئایەی ٣٩.

(٣) سوڕەتی یوسف، ئایەی ٥٦.

ئێستاش با بزانین ألله ئەگەر عەبدێکی ساڵحی خۆی لەسەر زەویدا بکاتە خاوەن هێز و تەمکین و دەسەڵات، ئیتر مانای چییە. ألله فەرموویەتی: {**الذين إن مكناهم في الأرض أقاموا الصلاة وءاتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهو عن المنكر ...**}[1]. واتە: {– عەبدە ساڵحەکان– ئەوانەن کە ئەگەر لەسەر زەویدا پایەدار و دەسەڵاتدار بکرێن ئەوا نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن ...}.

گومانیش لەوە نییە کە یوسف یەکێکە لەو عەبدە ساڵحانەی کە ألله لە ئایەتی پێشووتردا پێمانی ڕاگەیاند کەوا لەسەر زەویدا تەمکینی کردبوو، کەواتە ناکرێت حوکمی بە شەریعەتی ألله نەکردبێت و نوێژکەر و زەکاتدەر نەبووبێ، یاخود فەرمانی بە چاکە نەکردبێ و قەدەغەی خراپەکاریی نەکردبێت! بەڵکو بەپێچەوانەوە لە لاپەڕی ٢٠٩ دەیسەلمێنین کە چۆن حوکمی ألله ی جێبەجێ کردووە و سەرپێچی حوکمی پاشاکەی کردووە بەوپەڕی ئازادییەوە.

یەکێکی تر لە بەڵگە هەرە ڕۆشنەکان کەوا دەیسەلمێنێت پێغەمبەر یوسف –علیه الصلاة والسلام– حوکمی بە شەریعەتە تاغوتەکان نەکردووە، ئەوەیە کە ألله لە چەند ئایەتێکدا ناوی ١٨ پێغەمبەر دەهێنێت –علیهم الصلاة والسلام–، یەکێک لە پێغەمبەرەکانیش کە ناوی هێنراوە بریتییە لە یوسف –علیه السلام–، ئینجا لەدوای ئایاتەکانەوە ألله دەفەرمووێت: {**أولئك الذين هدى الله فبهداهم اقتده ...**}[2]. واتە: {ئا ئەوانە ئەو کەسانە بوون کەوا ألله هیدایەت و ڕێنموویی کردبوون، جا تۆش –ئەی محمد– لەسەر هیدایەت و ڕێنموویی ئەوان برۆ ...}.

کەواتە لەسەر بنەمای ئەم ئایەتەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بیروباوەڕ و مەنهەجی پێغەمبەر محمد –صلى الله عليه وسلم– هەمان ئەو هیدایەت و مەنهەجەیە کەوا بۆ

---

(١) سورەتی الحج، ئایەی ٤١.

(٢) سورەتی الأنعام، ئایەی ٩٠.

پێغەمبەرانی پێشووش نێردرابوو.

جا لێرەدا ئێمەش دەڵێین: ئەگەر پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– بەشداری لە شەریعەتە تاغوتەکەی پاشاکە کردبێت ئەوا کەواتە دەبێ ئەم کارە لەلایەن پێغەمبەر محمدیش –صلی الله علیه وسلم– ئەنجام درابێت لەبەر ئەوەی أللە پێیانی ڕاگەیاند کە هەمان ڕێنموویی و هیدایەتیان بۆ نێردرابوو.

بۆیەش دەپرسین: ئایا پێغەمبەر محمد –علیه الصلاة والسلام– لە قۆناغی مەککەدا بەهیچ جۆرێک سیاسەتی ئەنجامدا شانبەشانی قوڕەیشییەکان؟ ئایا لەگەڵ کافرەکان دەچووە دارولنەدوە تاکو لەوێدا کۆببێتەوە لەگەڵیان و سیاسەت بکەن بە هاوبەشیی؟! بێگومان نەخێر کاری وای نەکرد و هەرگیز موماڕەسەی شەریعەتە جاهیلیەت و تاغوتەکەی عەڕەبی نەکرد، ئێ کەواتە چۆن پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– موماڕەسەی شەریعەتە تاغوتەکەی سەردەمی خۆی کردووە لەکاتێکدا پێغەمبەر محمد کاری وای نەکردووە و هەمان هیدایەتیشیان بۆ نێردراوە؟!

لەم بەڵگانەوە بۆمان دەردەکەوێت بانگەوازی پێغەمبەر یوسف لەسەر ڕێبازی پیرۆزی پێغەمبەران بووە و هەرگیز ڕێگای بۆ موماڕەسە کردنی شەریعەتە تاغوتەکان خۆش نەکردووە بەڵکو ئەوەتا بینیمان قەومەکەی ئاگادار کردەوە کەوا حوکمدان و یاسادانان تەنها مافی أللە یە نەک مرۆڤ، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو پێغەمبەرە لەلایەن أللە کرایە خاوەنی دەسەڵات، ئیتر ئایەتی أللە ی جێبەجێ کرد و فەرمانی بە چاکە کرد و ڕێگریی لە خراپە کرد بەوجۆرەی کە أللە لە شەریعەتی ئەوکاتدا فەرمانی پێکردبوو، ئەمەشمان لە لاپەڕەکانی داهاتوو زۆرتر بۆ دەردەکەوێت.

ئەم ئایاتانە بەڵگەی بەهێزن بۆ تەکفیر کردنی ئیخوانییەکان؛ چونکە ئەگەر بەپێی قسەی ئەوان بێت ئەوا پێغەمبەر یوسف موماڕەسەی شەریعەتێکی تاغوتی کردووە و ئەسڵەن حوکمەکانی شەریعەتی أللە ی جێبەجێ نەکردووە بەڵکو دەستووری پاشاکەی جێبەجێ کردووە!، هەروەها بەپێی قسەیان بێت ئەوا دیارە پێغەمبەر محمد

–عليه السلام– فەرمانی ألله ی جێبەجێ نەکردووە و لەسەر هیدایەتی پێغەمبەر یوسف نەبووە و مومارەسەی شەریعەتە تاغوتەکانی نەکردووە!!! کەواتە ئیخوانییەکان ئەم هەموو ئایەتەی سەرەوە بەدرۆ دەخەنەوە کەوا دەیسەلمێنن پێغەمبەر یوسف دژی شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکان بووە.

**ڕووی دووەم:** پێغەمبەر یوسف خۆی دەستپێشخەر نەبوو بۆ ئەوەی بچێتە ناو حوکومەتی پاشاکە، بەڵکو پاشاکە داوای لێکرد کەوا بەشدار بێت لە حوکومەتەکەیدا. هەروەها پاشاکە هیچ مەرجێکیشی لەسەر پێغەمبەر یوسف دانەنابوو پێش ئەوەی بیکاتە بەشێک لە حوکومەتەکەی.

کەچی ئیخوانییەکان خۆیان دەستپێشخەرن لە مومارەسە کردنی دیمۆکراسیەت، هەروەها ئیخوانییەکان ئەسڵەن دەڵێن ئێمە باوەڕمان بە دیمۆکراسیەت هەیە! بەڵام ئایا پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– باوەڕی بە شەریعەتە تاغوتەکەی ئەوکات هەبوو؟! نەخێر هەرگیز، بەڵکو یاسادانەرەکانی ئەوکاتی بە "أرباب" (واتە پەروەردگارەکان) ناو هێنا لە ئایەتەکە! کەچی ئیخوانییەکان هەر خۆیان دەیانەوێت بگەنە پەرلەمان و لەوێدا ببن بە "أرباب" و یاسای دەستکرد دابڕێژن و دەستووری نائیسلامیی بنووسنەوە (هەروەک ئەندامەکەی حیزبی کۆمەڵی ئیخوانیی وایگووت)، ئیتر چۆن ئەمانە و یوسف وەکو یەکترن؟!

ئەمە لەلایەک، لەلایەکی تریشەوە دەڵێم: پێغەمبەر یوسف هیچ مەرجێکی کوفری لەسەر دانەنرا لەلایەن پاشاکە، کەچی ئیخوانییەکان بۆ ئەوەی حیزبیان هەبێت ئەوا دەبێ ئەم کوفرانە بکەن:

١- دەبێ باوەڕ بهێنن بە شەریعەتی دیمۆکراسیەتی تاغوت.

٢- دەبێ باوەڕی تەواویان بە دەستوورە پیسەکەی عیراق هەبێت کەوا دەیان کوفر و شیرکی گەورەی تێدایە.

٣- دەبێ باوەڕیان بە بنچینە کوفرینەکانی دیمۆکراسیەت هەبێت کەوا لە لاپەڕی

٣٥ تا ٩٠ باسکراون.

٤- دەبێ باوەڕیان بە دروشمە کوفرینەکانی دیمۆکراسیەت هەبێت، وەکو ئازادیی پارچەگەرێتیی و دەستاودەست کردنی دەسەڵات! دروشمە کوفرینەکانیش لە لاپەڕی ٩٤ تا ١٢٥ باسکراون.

خۆ ئەگەر ئەم چوار کوفرە گەورەیەی سەرەوە ئەنجام نەدەن ئەوا ئەسڵەن هەر ڕێگایان پێنادرێت حیزبیشیان هەبێت! جا ئایا پێغەمبەر یوسف ناچارکرا بۆ ئەوەی یەک دانە کوفریش ئەنجام بدات لەپێناوی گەیشتن بە دەسەڵات؟! نەخێر بەڵکو لەسەر داوای پاشاکە کرایە دەسەڵاتدار.

جا ئەم چوار کوفرەی سەرەوە تەنها تایبەتن بە مۆڵەتی هاتنە ناو دیمۆکراسیەت، بەڵام دیمۆکراسیەت هەر بەوەندە وازیان لێ ناهێنێت، ئیتر ئەگەر بیانەوێت بچنە ناو پەرلەمان ئەوا دیمۆکراسیەت فەرمانیان پێدەکات سوێندی یاسایی بخۆن، سوێندە کوفرینەکەش لە لاپەڕی ١٠٣ باسکراوە. هەروەها بەهۆی سوێندەکەوە ئیتر پەرلەمانتارە ئیخوانییەکە تووشی ئەم پێنج کوفرە گەورەیەش دەبێت سەرەڕای چوار کوفرەکەی لاپەڕی پێشوو:

١- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی ئەو ئەرکانە ئەنجام بدات کە دەستوورە پیسەکەی عیراق بۆی داناوە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە (واتە ئیخلاس). واتە بەوپەڕی ئیخلاسەوە ئەرکە کوفرەکانی دەکات!

٢- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی پارێزگاریی لە شەریعەتی دیمۆکراسیەتی تاغوت بکات لە خاکی عیراق!

٣- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی ئازادییەکان بپارێزێت، وەکو ئازادیی بیروباوەڕ و ئازادیی بیروڕا و ئازادیی بڵاوکردنەوەی بیروڕایە کوفرەکانی و هتد...!

٤- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی کار بکات لەپێناوی سەربەخۆ کردنی دادگاکان تاکو بەوپەڕی ئازادییەوە حوکم بکەن لەسەر بنەمای ئەو یاسایە دەستکردە تاغوتییانەی کە لە بینایە پیسەکەی پەڕلەمانەوە دەردەچن ئەگەرچی پێچەوانەی شەریعەتی ألله بن!

٥- سوێند دەخوات بە ألله بەوەی هەڵسێت بە جێبەجێ کردنی یاساکانی دەستوور و یاسایە دەرچووەکانی ناو پەڕلەمان، بەبێ ئەوەی لێیان لابدات، ئەگەرچی یاساکان کوفر و سەرپێچیش بن لە شەریعەتی ألله دا!

هاوار بۆ حاڵیان، ئەم پێنج کوفرە گەورەیە لەگەڵ چوار کوفرەکەی لاپەڕی پێشوو، ئەوە ٩ کوفری گەورە، ئەمە جگە لەوەی بە بەڵگەی فەرموودەی صحیح سەلماندم کە ئەگەر لەدڵیش نیەتێکی تریان هەبێت ئەوا سوودی بۆیان نییە؛ چونکە لەسەر فەرمانی دەستوور سوێندیان خواردووە. ئیتر پێم ناڵێن چۆن ئەندام پەڕلەمانێکی تاغوت هێنرایە ئاستی پێغەمبەر یوسف؟! کوا یەک بەڵگەی ئایەت و فەرموودە بهێنن کە پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– کەوتبێتە ناو یەک دانە کوفریشەوە پێش ئەوەی دەسەڵاتی پێ بدرێت؟

**ڕووی سێیەم:** ئەوکاتەی پێغەمبەر یوسف –صلى الله علیه وسلم– بوو بە دەسەڵاتدار لای پاشاکە، ئیتر ئەو پاشایە ئازادییەکی تەواوی پێدا تاکو بەو جۆرە حوکم بکات کەوا خۆی دەیویست، هەروەک ألله گوفتاری پاشاکەمان پێ ڕادەگەیەنێت کاتێک بە پێغەمبەر یوسفی گووتبوو: **{وقال الملك ائتوني به أستخلصه لنفسي فلما كلمه قال إنك اليوم لدينا مكين أمين}**[(١)]. واتە: {پاشاکە گووتی: بیهێننە لام (مەبەستی یوسف بوو) بۆ ئەوەی بیکەم بە یاریدەدەری تایبەتی خۆم، ئیتر لەوکاتەی قسەی لەگەڵ کرد، گووتی: تۆ ئەمڕۆ لەلای ئێمە کەسێکی پایەدار و ڕێگاپێدراو و جێگای متمانەی}.

---

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٥٤.

کەواتە پاشاکە ڕێگای بۆ پێغەمبەر یوسف کردەوە و پێی ڕاگەیاند کەوا ئەو ئازادە و هەرچۆنێک بیەوێت ئەوا با بەو جۆرە حوکم بکات و بجووڵێتەوە. هەر ئەمەش تەفسیری وشەی "مکین" ـە لەناو ئایەتەکە. ئیتر پێغەمبەر یوسفیش بە شەریعەتی ألله حوکمی دەکرد نەک شەریعەتە تاغوت و دەستکردەکەی پاشاکە، ئەوەیشی کە زۆرتر دەیسەلمێنێت گوفتارەکەم ڕاستە، ئەوەیە کە پێغەمبەر یوسف براکەی خۆی کرد بە کۆیلە بەهۆی دزیکردن، ئەمەش حوکمی شەرعیی دزیکردن بوو لە سەردەمی پێغەمبەر یوسف، کەچی لە شەریعەتە تاغوتەکەی پاشاکەدا نەدەبووایە کاری وا بکات! بەڵام هەر کردی!، هەروەک ألله فەرموویەتی: {... **وما كان ليأخذ أخاه في دين الملك ...**}[1]. واتە: {... لە دین و شەریعەتی پاشاکەدا یوسف بۆی نەبوو براکەی بگرێت ...}.

وشەی "دین" لە ئایەتەکە بەمانای دەستوور و شەریعەت دێت، مەبەستەکە ئەوەیە کە ئەو حوکمەی پێغەمبەر یوسف لەسەر براکەی ئەنجامیدا ئەوا ئەسڵەن لە دین و دەستووری پاشاکەی میسرِ نەبوو، بەڵکو حوکمەکەی لە شەریعەتی پێغەمبەر یعقوب وەرگرتبوو، کەواتە پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– بەجۆرێک ئازاد کرابوو لە دەسەڵاتدارییەکەی کەوا حوکمی بە شەریعەتی ألله دەکرد و کەسیش نەیدەتوانی ببێتە بەربەست لەپێش حوکمەکانی.

جا پێویستە ئەو بەناو موسڵمانانەی مومارەسەی دیمۆکراسیەت دەکەن وەڵامان بدەنەوە: ئایا ئەوانیش دەتوانن بەمجۆرەی پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– حوکم بکەن بە شەریعەتی ألله و کەسیش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا نەکات؟! ئایا ئەوانیش هاوشێوەی پێغەمبەر یوسف ڕێگایان بۆ خۆشکراوە تاکو حوکم بە شەریعەتی ألله بکەن؟

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٧٦.

بێگومان ئەسڵەن هەر ڕێگایان پێ نادرێت حوکم بە شەریعەتی ألله بکەن، بەڵکو دەبێ لەچوارچێوەی شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت و یاساکانی پەڕلەمان دەرنەچن، هەروەها ئەگەر بە زۆرینەی دەنگی پەڕلەمانتارە تاغوتەکان بڕیاردرا لەسەر ڕێگادان بە کوفرێک، ئەوا ئەم پەڕلەمانتارە بەناو موسڵمانانە هیچ هیچیان پێ ناکرێت، بەڵکو دەبێ بەوپەڕی زەلیلییەوە لە بینای پەڕلەمانەکە بڕۆنە دەرەوە و دڵیشیان خۆشە و دەڵێن ئێمە دەنگمان بە یاساکە نەداوە!

لە وەڵامدا دەڵێم: ئەی مەگەر ئێوە ناڵێن ئێمە لەسەر مەنهەجی پێغەمبەر یوسفین؟ ئەو لەلایەن پاشاکەوە ئازادییەکی تەواوی پێدرا و حوکمی بە شەریعەتی ألله دەکرد و عیززەتی هەبوو و هیچ کوفرێکیشی نەکرد، کەچی ئێوە لەپێناوی ئەوەی ومماڕەسەی دیمۆکڕاسیەت بکەن هەر زوو ٤ کوفری گەورەتان ئەنجامدا هەروەک باسم کرد، دواتر بۆ ئەوەی بگەنە پەڕلەمان ئیتر ٥ کوفری گەورەی ترتان ئەنجامدا، سەرەڕای ئەوەی کە ئەسڵەن هەر تواناتان نییە حوکم بە شەریعەتی ألله بکەن، بەڵکو وەکو بووکەشووشەیەک لەناو بیناکەن و شەڕعیەتتان داوەتە عەلمانیەکان.

سەرەڕای ئەوەی لە ٣ ڕووەوە سەلماندمان کە بەڵگەی ئیخوانییەکان سەبارەت بە پێغەمبەر یوسف بریتییە لە قیاسێکی چەوت و هەرگیز لەسەر ئەم ئیخوانییانە جێبەجێ نابێت، ئەمەشم لە سەرەوە ڕوون کردەوە الحمدلله.

**ئێستاش ئیخوانییەکان گومانێکی تر دەورووژێنن و دەڵێن:** ئەوەتا پێغەمبەر یوسف لەلای پاشاکەدا خۆی داوای لە پاشاکە کرد تاکو بیکاتە بەشێک لە حوکومەتەکەی، هەروەک خوای گەورە باسی دەکات: **{قال اجعلني على خزآئن الأرض ...}**(١). واتە: {–یوسف گووتی– بمکە بە سەرکاری گەنجینە و خەزێنەی خاکی میسڕ ...}. جا ئێمەش خۆمان دەچینە ناو حوکومەت و داوای پۆست دەکەین!

لە وەڵامدا دەڵێم: ئیخوانییەکان پێویستە دوو حاڵەت لە یەکتری جیابکەنەوە:

---

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٥٥.

**حاڵەتی یەکەم:** کارکردنی موسڵمانەکە بەشێوەیەکی دوو قۆڵیی لەگەڵ کافرەکە لەچوارچێوەی دەستوور و شەریعەتە تاغوتەکە (واتە: العمل مع الکافر). حوکمی ئەم حاڵەتەش ئەوەیە کە موسڵمانەکە پێی کافر دەبێت؛ چونکە بە هاوبەشیی لەگەڵ کافرەکە خەریکی مومارەسە کردنی شەریعەتە تاغوتەکەیە.

**حاڵەتی دووەم:** کارکردنی موسڵمانەکە لەلای کافرەکە بەشێوازێکی سەربەخۆ. بەو مەرجەی کە هیچ پەیوەست نەبێت بە دەستوور و شەریعەتە تاغوتەکە (واتە العمل عند الکافر). حوکمی ئەم حاڵەتەش ئەوەیە کە موسڵمانەکە پێی کافر نابێت بەڵام بە دوو مەرج:

١- نابێ کارەکە پێچەوانەی هیچ حوکم و ئایەتێکی شەریعەتی ألله بێت.

٢- نابێ کارەکە زیانی بۆ موسڵمانان هەبێت.

جا حاڵەتەکەی پێغەمبەر یوسف –علیە السلام– بریتی بوو لە حاڵەتی دووەم؛ چونکە پێغەمبەر یوسف هەرگیز بەشێوازێکی دوو قۆڵیی و لەژێر سێبەری شەریعەتە تاغوتەکەی پاشاکە دەسەڵاتی وەرنەگرت و سیاسەتی نەکرد، ئەو ئەسڵەن دژی حوکمە دەستکرد و تاغوتەکان بوو، ئەمەش لە لاپەڕی ١٨٧ و ١٨٨ باسکرا. بەڵکو ئەو بە شەریعەتی ألله حوکمی دەکرد بەوپەڕی ئازادییەوە و سەرپێچیی حوکمەکانی پاشاکەی دەکرد. هەروەها کارەکەی هیچ زیانێکی بۆ خۆی و موسڵمانان نەبوو.

کەچی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان تەنانەت بەڵگەکەش لەسەریان جێبەجێ نابێ؛ چونکە ئەوان کەوتوونەتە ژێر حاڵەتی یەکەم، واتە ئەوان ئەسڵەن ڕێگایان پێ نادرێت تاکو سەربەخۆ سیاسەت بکەن، بەڵکو ئیللا دەبێ بە دوو قۆڵیی لەگەڵ کافران سیاسەت بکەن، هەروەها بۆیان نییە لەم تۆزە دەسەڵاتەی پێیان دراوە بەکاری بهێنن بۆ جێبەجێ کردنی حوکمی ألله، بەڵکو ئیللا دەبێ لە چوارچێوەی دەستوور و شەریعەتە تاغوت و داڕێژراوەکەی پەرلەمان دەسەڵاتەکەیان بەکار بهێنن، ئەگینا لێپرسینەوە و سزای یاساییان بەرەو ڕوو دەکرێتەوە! ئیتر پێمان ناڵێن چۆن ئەو

حاڵەتەی پێغەمبەر یوسف –علیە الصلاة والسلام– لەگەڵ حاڵی خۆتان وەکو یەکتر سەیر دەکەن ئەی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان؟ هاوار بۆ حاڵی خۆتان و دەنگدەرە ساویلکەکانتان.

ئەگەر دەشڵێن: بەڵگە چییە کەوا پێغەمبەر یوسف –علیە السلام– بە هاوبەشیی لەگەڵ پاشاکە خەزێنەکەی بەڕێوە نەبردووە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: چەندین بەڵگەمان لەبەردەستە کە دەیسەلمێنن پێغەمبەر یوسف لە کاری بەڕێوەبردنی گەنجینەکان بەتەواویی سەربەخۆ بووە و هیچ حیسابی بۆ یاساکانی پاشای میسرِ نەکردووە، لە نموونەی بەڵگەکان:

**بەڵگەی یەکەم:** هەر خودی پاشاکە خۆی پێغەمبەر یوسفی ئازاد کرد و گووتی {**... إنك اليوم لدينا مكين أمين**}[1]. واتە: {... تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە کەسێکی پایەدار و ڕێگاپێدراو و جێگای متمانەی}. ئەوەتا پاشاکە پێغەمبەر یوسفی ئازادکرد لە کارەکەی.

**بەڵگەی دووەم:** ئەوەتا پێغەمبەر یوسف –علیە السلام– هەر خۆی لەسەر بنەمای شەریعەتی ألله سزای براکەیدا نەک لەسەر بنەمای شەریعەتی پاشاکە، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**... ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك ...**}[2]. واتە: {... لە دین و دەستووری پاشای میسرِدا نەبوو کەوا یوسف براکەی خۆی بپارێزێت و بیهێڵێتەوە ...}. ئەمەش دەیسەلمێنێ بەتەواویی سەربەخۆ بووە و حیسابی بۆ پاشاکە نەکردووە.

**بەڵگەی سێیەم:** پێغەمبەر یوسف –علیە الصلاة والسلام– لە کاروباری کڕین و فرۆشتنەکەیدا سەربەخۆیانە مامەڵەی کردووە و مەرجی داناوە بەبێ ئەوەی ئەو مەرجانە لە دەستووری پاشاکەی میسرِ هەبن، ئەوەتا {**ولما جهزهم بجهازهم قال ائتوني بأخ لكم من أبيكم ألا ترون إني أوفي الكيل وأنا خير المنزلين * فإن لم تأتوني به**

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٥٤.
(٢) سورەتی یوسف، ئایەی ٧٦.

**فلا كيل لكم عندي ولا تقربون}**[1]. واته: {کاتێک –یوسف– بارەکانی بۆیان ئامادە کرد گووتی: برا باوکییەکەتان بهێنن، ئەوە نابینن من بە تەواویی و ڕێکوپێکیی پێوانەم بۆتان کرد و هەروەها من باشترین کەس بووم کە ئێوە لەلای مابنەوە؟ * ئەگەر ئێوە ئەوم بۆ نەهێنن (واتە براکەیان) ئەوا ئیتر هیچ پێوانەیەکتان بۆ نییە و مەیەنەوە لام}.

هەروەک بینیتان، ئەوەتا کۆمەڵێک کڕیار هاتوونەتە لای یوسف، ئەویش چەند مەرجێکی بۆیان دانا، گووتی دەبێ بۆ جاری داهاتوو براکەتان بهێنن ئەگینا من کڕین و فرۆشتن لەگەڵ ئێوە ناکەم و ناشبێ بێنەوە ئێرە!!! لێرەدا دەپرسم: ئایا لە دەستووری پاشاکەی میسرِدا شتی وا هەبوو کە کڕیارەکان ناچار بن بەوەی براکانیان بهێنن ئەگینا شتیان پێ نەدرێت؟! نەخێر شتی وا نەبووە لە دەستووری پاشاکە، کەچی پێغەمبەر یوسف ئەم مەرجەی بە دڵی خۆی دانا و حیسابی بۆ دەستووری پاشاکەش نەکرد!

جا ئەی قەومەکەم، ئایا ئیخوانیی و حیزبە بەناو ئیسلامییەکان کە ئێوەیان هەڵخەڵەتاندووە، توانایان هەیە بەوەی ئاوا وەکو یوسف بە ئازادانە حوکم بە شەریعەتی ألله بکەن؟ نەخێر بەڵکو ئەسڵەن دەبێ پابەندی دەستوورە کوفرینەکە بن.

جیاوازییەکی تریش لەنێوان پێغەمبەر یوسف –علیه السلام– لەگەڵ ئەم حیزبە بەناو ئیسلامییانە ئەوەیە کە پێغەمبەر یوسف بەهیچ شێوەیەک مومارەسەی شەریعەتە تاغوتەکەی پاشای میسرِی نەکرد تاکو بگاتە دەسەڵات، بەڵکو ألله –تبارك وتعالى– خۆی هێز و دەسەڵاتی پێدا و تێکڕای بەربەستەکانی لەپێش یوسف شکاند و هەر لەناو زیندانەوە دەریهێنا بەرەو کۆشکی پاشاکە و ئینجا دەسەڵاتێکی سەربەخۆی پێدرا لەلایەن ألله، بەبێ ئەوەی بکەوێتە ناو یەک دانە کوفریش. ئەوەتا پێغەمبەر یوسف خۆی دان بەوە دەنێت کە ألله موڵک و دەسەڵاتداریی پێداوە نەک ئەوەی کە هەوڵی خۆی تێدا بووبێ، هەروەک ألله بۆمان باس دەکات: **{رب قد ءاتيتني من الملك**

---

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ٥٩ و ٦٠.

...}[1]. واتە: {ئەی پەروەردگارم، بەڕاستیی تۆ موڵک و دەسەڵاتداریت پێم گەیاند ...}.

جا ئایا ئەم حیزبە بەناو ئیسلامییانەش بەهەمان شێوەی پێغەمبەر یوسف بوون و هیچ هەوڵی موماڕەسەکردنی تاغوتیان نەداوە؟! نەخێر بەڵکو ئەوەتا پڕ بەدڵ دەڵێن باوەڕمان بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت هەیە، ئەوەتا لەپێناوی گەیشتنە دەسەڵات وا موماڕەسەی دروشمەکانی دیمۆکڕاسیەت دەکەن و تەنازولیان لە تەوحید و زۆربەی حوکمە شەڕعییەکان کردووە تەنها بۆ ئەوەی بگەنە دەسەڵات!! ئایا پێغەمبەر یوسف بەم حاڵە گەیشتە دەسەڵات؟ ئەم بەناو موسڵمانانە دەیان کوفری گەورەیان کرد تاکو بگەن بە دەسەڵات، کەچی پێغەمبەر یوسف –صلى الله عليه وسلم– ئەسڵەن تووشی تاوانیش نەبوو نەک کوفر.

بۆیەش پێویستە چیتر ئیخوانییەکان خەڵک نەخەنە ناو شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت بە بیانووی ئەوەی کە پێغەمبەر یوسف کاری وایکردووە، حاشا، ئەوەتا بەبەڵگەی قورئان سەلماندمان هەرگیز کاری وای نەکردووە. **بۆیەش ئەی قەومەکەم بگەڕێنەوە بۆ قورئان، ئەوکات کەس ناتوانێ هەڵتانخەڵەتێنێ ئەگەر ئێوە دەست بگرن بە کتێب و دەستوور و شەریعەتەکەی پەروەردگار.**

(١) سورەتی یوسف، ئایەی ١٠١.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

## گومانی دووەم: نەجاشی (پاشای حەبەشە) حوکمی بە شەریعەتی ألله نەکرد و موسڵمانیش بوو.

ئەمجارەیان ئیخوانییەکان کە وەڵامی گومانەکەی تریان وەرگرت و زانیان هەڵەن، ئیتر دەڵێن: کاکە حوکم کردن و بەشداربوون لە شەریعەتە تاغوتەکان کوفر نییە، ئەوەتا نەجاشی پاشای وڵاتی حەبەشە بوو، حوکمیشی بە شەریعەتی ألله نەدەکرد، کاتێکیش کە مرد ئەوا پێغەمبەر نوێژی جەنازەی لەسەر کرد، کەواتە ئەگەرچی حوکمی بە تاغوت دەکرد بەڵام هەر موسڵمان بوو.

لە وەڵامدا دەڵێم: بەڵێ گومان لەوە نییە نەجاشی –رحمه الله– پیاوێکی موسڵمان بوو و پاشای وڵاتی حەبەشە بوو، ئەمە شتێکە کە بەبەڵگەی شەرعیی چەسپاوە لامان. هەروەها موسڵمان بوونیشی دەگەڕێتەوە بۆ دوای ساڵی ٦ ی هیجریی، هەروەها مردنیشی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی ٨ ی هیجریی، کەواتە کەمتر لە دوو ساڵ بە موسڵمانێتیی ژیاوە.

ئەوەی کە گرینگە خوێنەران و ئیخوانییەکان بیزانن، ئەوەیە کە نەجاشی لەم ماوە کەمەی تەمەنیدا کەوا بە موسڵمانێتی ژیا، ئیتر هەرچییەکی لە پێغەمبەرەوە پێگەیشتبێت ئەوا قەبوڵی کردبوو و دانی پێدانابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی تەمەنی موسڵمانێتییەکەی کورت بوو، بۆیەش تەنها تەوحیدی پێگەیشت، لە سەردەمی پێش ئیسلامدا نەجاشی پیاوێکی گاور بوو، باوەڕی وابوو کە "ألله و عیسا و مەریەم" هەر سێکیان شایەنی پەرستنن، بەڵام کاتێک بوو بە موسڵمان، ئیتر بەیعەتی دایە پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– هەروەها ئیتر گووتی "لا إله إلا الله"، هەروەها دانی بەوەنا کەوا عیسا –عليه السلام– نێردراوی ألله یە نەک کوڕی ألله.

ئەمە تاکە بابەتی شەرعیی بوو کەوا گەیشتبووە نەجاشی –رحمه الله– و ئەویش باوەڕی پێ هێنا و موسڵمان بوو. بەڵام هیچ هیچ بابەتێکی تری شەرعیی پێنەگەیشتبوو لەمە زیاتر، بەتایبەت ئەو حوکم و ئایاتانەی کە بۆ سەر پێغەمبەر دادەبەزین لە مەدینە، نەجاشی لێیان بێ ئاگا بوو؛ چونکە زۆر دوور بوو لە موسڵمانان، تەنها ئاگاداری تەوحید بوو.

نەک هەر نەجاشی، بەڵکو ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەریش کە لە حەبەشە دەژیان، گشتیان وەکو نەجاشی بێ ئاگا بوون لەو حوکم و ئایاتانەی کە دادەبەزین لە مەدینە، ئەوەتا عبدالله بن مسعود –رضي الله عنه– کاتێک لە حەبەشە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر –صلی الله علیه وسلم–، ئیتر بەلای پێغەمبەر تێپەڕی و بینی خەریکی نوێژە، بۆیەش إبن مسعود سەلامی لە پێغەمبەر کرد لەکاتی نوێژکردنەکە، پێغەمبەریش وەڵامی نەدایەوە، بۆیەش بە پێغەمبەری گووت: ئەی نێردراوی ألله، ئێمە پێشتر سەلامان لێت دەکرد و تۆش لەناو نوێژکردن وەڵامت دەدایەوە. پێغەمبەریش فەرمووی: «**إن في الصلاة شغلا**»[1]. واتە: «**نوێژکردن سەرقاڵ بوونی تێدایە**».

هەروەک لەم بەڵگەیەوە دەرکەوت، ئەوەتا إبن مسعود یش لەوکاتەی کە لە حەبەشە بوو، ئاگاداری ئەوە نەببوو کەوا شەریعەت زۆرتر دابەزیوە و هەندێک لە حوکمەکانی پێشوو نەسخ بوونەتەوە بە حوکمی نوێ؛ چونکە پێش ئەوەی إبن مسعود بچێتە حەبەشە، هیچ کێشەیەک نەبوو کە لەناو نوێژدا وەڵامی سەلام بدرێتەوە، بەڵام لەدوای چوون و گەڕانەوەیدا ئینجا زانی حوکمە گۆڕاوە.

تەنانەت ئەو هاوەڵانەی کە لە حەبەشە دەژیان، بێ ئاگا بوون لەوەی ألله فەرمانی بە نوێژی جەنازە کردووە لەکاتی مردنی موسڵمانێک، هەر بۆیەش إبن العربي –رحمه الله– دەڵێت: هۆکاری ئەنجامدانی "نوێژی جەنازەی غائب" لەلایەن پێغەمبەرەوە بۆ نەجاشی لەبەر ئەوەبوو چونکە دەیزانی موسڵمانەکانی حەبەشە ئاگاداری ئەوە نین کە

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب مناقب الأنصار > باب هجرة الحبشة > فەرموودەی ژمارە: ٣٨٧٥.

ألله نوێژی جەنازەی شەڕعاندووە بۆ موسڵمانان، بۆیەش دەیزانی موسڵمانان لەوێ نەجاشی دەنێژن و نوێژی لەسەر ناکەن، هەر بۆیەش خۆی نوێژی جەنازەی غائب ی لەسەر کرد.

کەواتە تێکڕای ئەو موسڵمانانەی لە حەبەشە دەژیان (بە نەجاشیەوە) گشتیان بێ ئاگا بوون لە حوکمە نوێیەکان، بۆیەش تەنها باوەڕیان بەو حوکمانە هەبوو کە پێشتر زانیبوویان. هەر ئەمەش هۆکاری کارنەکردنی نەجاشیە بە حوکمی ألله؛ چونکە هیچ حوکمێکی شەڕعیی پێ نەگەیشتبوو تاکو کاری پێ بکات و ئیمانی پێ بهێنێ، جگە لە تەوحید.

هەر بۆیەش نەجاشی هەر حوکمی موسڵمانی لەسەر دەدرێت؛ چونکە بێ ئاگا بووە لە حوکمە شەڕعییە نوێیەکان، کەچی ئەم حیزبە بەناو ئیسلامیانە خۆیان هێناوەتە ئاستی نەجاشی، لەکاتێکدا ئەم جیاوازییە گەورانەیان لەگەڵ نەجاشی هەیە:

**یەکەم:** نەجاشی پشتی لە دینەکەی خۆی کرد و ئیمانی بە شەریعەتی ألله هێنا، کەچی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان پشتیان لە شەریعەتی ألله کردووە و ئیمانیان بە دیمۆکڕاسیەت هێناوە! لە لاپەڕی ١٤ تا ١٢٥ سەلماندم دیمۆکڕاسیەت شەریعەتێکی سەربەخۆیە وەکو ئیسلام، هەروەها بنچینە و دروشمەکانی گشتیان دژی ئیسلامن، کەچی ئیخوانییەکان پشتیان لە دەیان ئایەتی موحکەمی قوڕئان هێناوە لەپێناوی مومارەسە کردنی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت. ئیتر ئایا ئەم ئیخوانییانە لەسەر مەنهەجی نەجاشین یاخود ڕێک پێچەوانەی نەجاشین؟! بێگومان پێچەوانەی نەجاشی.

**دووەم:** نەجاشی دەستی نەدەگەیشتە زانستی شەڕعیی، بەڵام ئەم ئیخوانییانە خۆیان ئاگاداری حەقیقەتی ئیسلامن، خۆیان ئاگاداری ئایەت بە ئایەتی قوڕئانن. زۆرینەی ئەندام پەڕلەمانە بەناو ئیسلامییەکان پلەی دکتۆرایان هەیە لە بوارێکی عیلمی شەڕعیی، لەناویاندا هەیە قوڕئانی هەموو لەبەرە، لەناویاندا هەیە تەنانەت دەرسی تەفسیری قوڕئان و دەرسی شەڕعی دەداتەوە و ساڵانە چەندین کتێبی شەڕعیی

بڵاو دەکاتەوە و بەتەواویی زانایە بە ئیسلام! ئیتر چۆن ئەمانە لەگەڵ نەجاشی وەکو یەکترن؟! نەجاشی ئەسڵەن لە تەوحید بەلاوە ئاگاداری هیچی تر نەبوو.

**سێیەم:** نەجاشی دوور بوو لە موسڵمانان، بەڵام ئەم ئیخوانییانە لەناو جەرگەی خاکی موسڵمانانن و دەستیان دەگاتە حەقیقەتەکان و هیچ بەربەرستێکیان لەپێش نییە، بەڵام خۆیان کوێر کردووە.

**چوارەم:** نەجاشی بەپێی ئەو زانستە شەرعییەی کە پێی گەیشتبوو، ئیتر بەتەواویی بەرائەتی لە کافران کردبوو، ئەوەتا پێشووتر پارەی دەنارد بۆ "هیرەقل" ی پاشای ڕۆمەکان، بەڵام لەدوای موسڵمان بوونی دەیگووت: **لا واللە، لو سألني درهما واحدا ما أعطيته**[1]. واتە: ناواللە، ئەگەر داوای یەک درهەمیش بکات ئەوا پێی نادەم.

بەڵام ئیخوانییەکان پشتیان لە دەیان ئایەت کردووە کە أللە –عز وجل– بە ئاشکرا فەرمانمان پێدەکات تاکو بەرائەت لە کافران بکەین و شوێنیان نەکەوین و تەنانەت لە دڵیشمانەوە خۆشەویستیمان بۆیان نەبێت و هەروەها فەرمانمان پێکراوە حوکم بە شەریعەتی أللە بکەین و تەنازول لە یەک حوکمی شەرعیش نەکەین. کەچی ئیخوانییەکان حیساب بۆ ئەم ئایاتانە ناکەن و خۆیان فڕێداوەتە ناو گۆماوی شەریعەتە تاغوتەکان و هەروەها بەتەواویی خۆیان بە برای ئەو کەسانە ئەزانن کەوا أللە لە کتێبەکەی تەکفیری کردوون. کەواتە ئەم ئیخوانییانە بەقەد نەجاشی ئاگاداری "الولاء والبراء" نین و کاری پێناکەن! ئەمەش یەکێکە لە بەڵگە هەرە بەهێزەکان لەسەر تەکفیر کردنیان.

**ئیتر چۆن ئەمانە خۆیان ئەهێننە ئاستی نەجاشی؟! ئەی قەومەکەم، بە کەسانێک هەڵمەخەڵەتێن کە ئەمە حاڵیانە و بەم فێڵانە هەڵتان دەخەڵەتێنن و حەقیقەتی باسەکەتان بۆ ڕوون ناکەنەوە، بەڵکو ئەیانەوێت ڕاپێچتان بکەن بۆ ناو گێژاوی شەریعەتێکی تاغوت.**

---

(١) کتێبی زاد المعاد في هدي خير العباد > بەرگی سێیەم > لاپەڕی ژمارە ٦٣.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

## گومانی سێیەم: پێغەمبەرمان -علیه السلام- حوکمی بە تەوڕات کرد.

حیزبە بەناو ئیسلامییەکان لەپێناوی مومارەسە کردنی دیمۆکراسیەتی تاغوت، و لەپێناوی ڕاکێشانی ئەم قەومە بەرەو موشریک بوون، ئیتر گومان لەدوای گومان دروست دەکەن بۆ ئەم خەڵکە تاکو قەناعەتیان پێ بهێنن و پەنجەی شایەتومانیان بۆ مۆر بکەن! جا لەدوای ئەوەی وەڵامی هەردوو گومانەکەی سەرەوەیان وەرگرت، ئیتر گومانێکی تر دەردەبڕن و دەڵێن: کاکە ئەوەتا پێغەمبەرمان -صلى الله عليه وسلم- کاتێک ویستی سزای زیناکارە جولەکەکان بدات، داوای حوکمی زیناکاری کرد لە کتێبی تەوڕات، هەروەها زیناکارەکانی بەردباران کرد لەسەر بنەمای حوکمەکەی تەوڕات. کەواتە بۆ ئێمەش ئاساییە و مومارەسەی دیمۆکراسیەت ئەکەین!

بەر لەوەی وەڵامی گومانەکە بدەمەوە، با سەرەتا ڕووداوەکە دابنێم تاکو خوێنەر چاکتر بزانێت بابەتەکە چییە:

عبدالله بن عمر -رضي الله عنهما- بۆمان دەگێڕێتەوە: «**أن اليهود جاءوا إلى رسول الله -صلى الله عليه وسلم- فذكروا له أن رجلا منهم وامرأة زنيا، فقال لهم رسول الله -صلى الله عليه وسلم-: "ماذا تجدون في التوراة في شأن الرجم؟"، فقالوا: نفضحهم ويجلدون. فقال عبدالله بن سلام: كذبتم، إن فيها الرجم، فأتوا بالتوراة فنشروها، فوضع أحدهم يده على آية الرجم، فقرأ من قبلها وما بعدها، فقال له عبدالله بن سلام: ارفع يديك، فرفع يده فإذا فيها آية الرجم. فقالوا: صدق يا محمد، فيها آية الرجم. فأمر بهما الرسول -صلى الله عليه وسلم- فرجما ...**»[١].

---

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب المناقب > باب قول الله -تعالى-: {... يعرفونه كما يعرفون أبناءهم ...} > فەرموودەی ژمارە: ٣٦٣٥.

واته: «**جولەکەکان هاتنە لای نێردراوی ألله -صلی الله علیه وسلم-، ئینجا باسی ئەوەیان بۆ کرد کەوا پیاوێک و ئافرەتێکیان زینایان کردووە. نێردراوی ألله -صلی الله علیه وسلم- لێیانی پرسی: "لەناو کتێبی تەوڕاتدا چی هەیە لەبارەی بەردباران کردن؟"، ئەوانیش گووتیان: تەنها ئابڕووی زیناکارەکان دەبەین و قامچیان لێدەدەین (مەبەستیان ئەوەبووە کە تەوڕات هیچی تێدا نییە لەبارەی بەردباران کردن). ئینجا عبدالله بن سلام گووتی: درۆ دەکەن، لەناو تەوڕاتدا فەرمانکراوە بە بەردبارانکردن. بۆیەش کتێبی تەوڕاتیان هێنا و لاپەڕەکانیان هەڵدایەوە، لەوکاتەدا یەکێکیان دەستی خۆی خستە سەر ئایەتی بەردبارانکردنەکە و لە هەمان کاتیشدا ئایەتی پێشی و دواوەی خوێندەوە. لەوکاتە عبدالله بن سلام گووتی: کوا دەستت هەڵگرە. ئیتر جولەکەکەش دەستی لابرد و ئایەتی بەردبارانکردنەکە دەرکەوت، ئیتر جولەکەکان (بە شەرمەزارییەوە) گووتیان: ڕاست دەکات ئەی محمد، ئایەتی تێدایە لەبارەی بەردبارانکردن. ئیتر نێردراوی ألله -صلی الله علیه وسلم- فەرمانی پێیان کرد و بەردباران کران ...**».

جا ئیخوانییەکان دەڵێن: ئەوەتا پێغەمبەر لەسەر بنەمای ئایەتێکی تەوڕات حوکمی بەردبارانکردنی دەرکرد، ئێمەش سوود لە کتێب و دەستووری کافرەکان دەبینین و حوکمیان پێدەکەین!

وەڵامی ئەم گومانەشیان لە دوو ڕووەوە دەدرێتەوە:

**ڕووی یەکەم:** لەناو فەرموودەکەدا دەبینین پێغەمبەر پرسیارێکی لێکردوون و فەرموویەتی **"ماذا تجدون في التوراة في شأن الرجم؟"** واتە: "لەناو تەوڕاتدا چی هەیە لەبارەی ڕەجم؟".

ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە و دەیسەلمێنێ پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- ئاگاداری ئەوە بووە کەوا حوکمی زیناکار لە دینەکەی موسا -علیه السلام- بریتییە لە ڕەجم، واتە بەردباران کردن. هەروەک شێخ محمد الخضر الشنقیطي لە شەڕحی فەرموودەکە

دەڵێت: «**قال الباجي: يحتمل أن يكون علم بالوحي أن حكم الرجم فيها ثابت على ما شرع**»[(١)].

واتە: «**الباجي دەڵێت: دەکرێت پێغەمبەر بە وەحی ئاگادارکرابێتەوە بەوەی حوکمی ڕەجم لەناو تەوڕاتدا بوونی هەیە**».

**ڕووی دووەم:** ئەم ڕووداوە لە کاتێکدا ڕوویدا کە پێغەمبەر و هاوەڵانی –صلى الله عليه وسلم– تازە هیجرەتیان کردبوو بەرەو شاری مەدینە. هێشتا هیچ حوکمێک دانەبەزیبوو سەبارەت بە بەردباران کردن، بۆیەش نێردراوی ألله –صلى الله عليه وسلم– حوکمی بە شەریعەتی پێغەمبەری پێشی خۆی کرد، هەروەک إبن بطال –رحمه الله– دەڵێت: «**وكان ذلك أول دخوله –صلى الله عليه وسلم– المدينة**»[(٢)].

واتە: «**ئەو ڕووداوە لە سەرەتای چوونی پێغەمبەر بوو –صلى الله عليه وسلم– بۆ مەدینە**». هەروەها شێخ إبن حجر –رحمه الله– هەمان گوفتاری نەقل کردووە.

هەروەها إبن بطال –رحمه الله– دەڵێت: «**وكان حكم التوراة بالرجم على المحصن وغير المحصن، وكان النبي –صلى الله عليه وسلم– اتباعه وعمل به؛ لأن على كل نبي اتباع شريعة النبي قبله يحدث الله له شريعة تنسخها**»[(٣)].

واتە: «**حوکمی تەوڕات لەبارەی بەردبارانکردنەوە هەردوو زیناکاری خێزاندار و بێ خێزانی دەگرتەوە، پێغەمبەریش –صلى الله عليه وسلم– شوێنی حوکمەکە کەوت و کاری پێکرد؛ چونکە لەسەر هەموو پێغەمبەرێکە کە شوێنکەوتەی شەریعەتی پێغەمبەری پێشی خۆی بێت تا ئەو کاتەی ألله بە شەریعەتێکی نوێ نەسخی دەکات**».

---

(١) کتێبی کوثر المعاني الدراري في کشف خبايا صحيح البخاري > کتاب الجنائز > باب الصلاة على الجنائز بالمصلى والمسجد.

(٢) کتێبی شرح صحيح البخاري لإبن بطال > کتاب الرجم > باب أحکام أهل الذمة.

(٣) کتێبی شرح صحيح البخاري لإبن بطال > کتاب الرجم > باب أحکام أهل الذمة.

بەهەمان شێوە ئیمامی إبن حجر العسقلاني –رحمه الله– دەڵێت: «**وكان مأمورا باتباع حكم التوراة والعمل بها حتى ينسخ ذلك في شرعه**»[1].

واتە: «**پێغەمبەر فەرمانی پێکرابوو تاکو شوێنکەوتەی حوکمی تەوڕات بێت و کاری پێبکات تا ئەو کاتەی لە شەریعەتی خۆیدا ئەمە نەسخ دەبێتەوە**».

ئەم گوفتارانەی إبن بطال و إبن حجر –رحمهما الله– ڕوونی دەکەنەوە کەوا تاکە هۆکارێک بۆ ئەوەی پێغەمبەر –علیه السلام– حوکمی بە تەوڕات کردبوو ئەوەبوو کە هێشتا هیچ حوکمێک لەبارەی زیناکار دانەبەزیبوو. بۆیەش پێغەمبەر نەیویست بەدڵ و هەوا و ئارەزووی خۆی حوکم بکات، بەڵکو حوکمی بە شەریعەتی پێغەمبەری پێشی خۆی کرد.

بەڵام ئایا ئێستا ئەم هۆکارە ماوە تاکو ئیخوانییەکانیش هەمان کار بکەن؟! نەخێر، بەڵکو ئێستا شەریعەتی ألله بە کاملی دابەزیوە، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**... اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا ...**}[2]. واتە: {... ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆتان کامل کرد و نیعمەتەکانم لەسەرتان تەواو کرد و ڕازی بووم بەوەی ئیسلام دینتان بێت ...}.

نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو تەنانەت ئەم فەرموودەیە نەسخ بووەتەوە، واتە چیتر نابێ کاری پێبکرێت؛ چونکە لەکۆتاییدا ألله ئایەتی دابەزاند و فەرمووی: {**وأن احكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع أهواءهم ...**}[3]. واتە: {–ئەی محمد– دادگەرێتیی لەنێوانیان بکە بەوەی ألله دایبەزاندووە، نەکەی شوێنی ئارەزوو و خواستەکانیان بکەویت ...}. تەنانەت ئەم ئایەتە دووبارە لەسەر جولەکەکان دابەزی کاتێک هاتن و

---

(١) کتێبی فتح الباري شرح صحيح البخاري > كتاب الرجم > باب أحكام أهل الذمة.

(٢) سورەتی المائدة، ئایەی ٣.

(٣) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٩.

داوای دادگەرێتیان لە پێغەمبەر کرد. ئەمجارەیان ألله فەرمانی پێکرد کەوا حوکم بە هیچ نەکات (تەنانەت تەوڕاتیش) جگە لە قوڕئان.

هەروەک چۆن ئیمامی ماوردي –رحمه الله– لە تەفسیرەکەی بۆ ئەم ئایەتە دەفەرمووێت: «**وهذا يدل على وجوب الحكم بين أهل الكتاب بما أنزل الله إذا تحاكموا إلينا، ولا نحكم بينهم بتوراتهم ولا بإنجيلهم**»[١].

واتە: «**ئەمە (واتە ئایەتەکە) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی واجبە دادگەرێتیی لەنێوان ئەهلی کیتاب بەو شەریعەتە بکرێت کە ألله دایبەزاندووە (واتە قوڕئان)، نابێ دادگەرێتییان بکرێت بە تەوڕات و ئینجیلەکەیان**».

هەروەها شێخ أبو محمد الغيتابي –رحمه الله– لە شەرحەکەیدا بۆ فەرموودەکە دەڵێت: «**هذا منسوخ؛ لأنه –صلى الله عليه وسلم– ما كان يحكم بعد نزول القرآن إلا بما فيه**»[٢].

واتە: «**ئەم فەرموودەیە نەسخ بووەتەوە (واتە حوکمی پێ ناکرێت)؛ چونکە پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– لەدوای دابەزینی قوڕئانەوە ئیتر حوکم و دادگەرێتیی نەدەکرد تەنها بە قوڕئان نەبێت**».

کەچی ئیخوانیەکان لەپاش تێپەڕینی زۆرتر لە ١٤٠٠ ساڵ بەسەر یەکلابوونەوەی تێکڕای حوکمەکان، کەچی هاتوونە و فەرموودەیەک دەکەنە بەڵگە کەوا ئەسڵەن هەر حوکمەکەی نەسخ بووەتەوە و نابێ بکرێتە بەڵگە لەبارەی حوکمکردن و دادگەرێتیی!

لێرەدا ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئیخوانییەکان دەیانەوێت لەڕێگای ئەم فەرموودەیەوە کار بە دیمۆکراسیەتی تاغوت بکەن و بگەنە دەسەڵات، ئەگەریش گەیشتنە دەسەڵات ئەوکات ئەگەر هەمان ئەم فەرموودەیان پیشان بدەیت لەبارەی

---

(١) تەفسیری الماوردي –رحمه الله– بۆ سورەتی المائدة، ئایەی ٤٩.

(٢) کتێبی عمدة القاري شرح صحيح البخاري > كتاب الجنائز > باب صلاة الصبيان مع الناس على الجنائز.

حوکمی بەردباران کردن، ئەوا ڕەتی دەکەنەوە و دەڵێن حوکمی پێناکەین و باوەڕمان بە حوکمی بەردباران کردن نییە! کەواتە تەنها لەپێناوی مەسڵەحەتی خۆیان ئەم فەرموودەیەتان پیشان ئەدەن تاکو هەڵتانخەڵەتێنن و پەنجەتان بۆیان مۆر بکەن.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

### گومانی چوارەم: ئیمامی عمر -رضي الله عنه- حوکمی دەستبڕینی دزی ڕاگرت.

ئەمەش دانەیەکی ترە لە گومانە پووچەڵەکانی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان، کە دەڵێن: کاکە ئەوەتا ئیمامی عومەر ئەو سزایەی ڕاگرت کە ألله فەرمانی پێکردووە لەبارەی حوکمی دزی کردن، کە بریتییە لە دەستبڕین. بۆیەش زۆر ئاساییە ئەگەر حوکمەکانی ئیسلام بووەستێنرێت و حوکمی تری بخرێتە شوێنەوە.

لە وەڵامی ئەم گومانەیان دەڵێم: لەخوارەوە لە ٣ ڕووەوە وەڵامی ئەم گومانەیان دەدەمەوە بەبەڵگەی شەرعیی؛ تاکو تۆی خوێنەر زۆرتر هەست بە فێڵبازیی حیزبییەکان بکەیت:

**ڕووی یەکەم:** گەورەترین جیاوازیی لەنێوان حاڵەتەکەی ئیمام عمر -رضي الله عنه- لەگەڵ ئەم ئیخوانییانە ئەوەیە کە ئیمامی عمر بەهیچ جۆرێک باوەڕی بەوە نەبووە کەوا شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوت بخرێتە شوێنی شەریعەتی ألله، هەروەها تەنانەت باوەڕی بەوە نەبووە کە حوکم و دادگەرێتیی بگەڕێندرێتەوە بۆ لای شەریعەتێک لە غەیری شەریعەتی ألله.

تەنانەت ئەوەتا بەڵگەمان بۆ ماوەتەوە کە چۆن ئیمامی عمر پیاوێک دەکوژێت کە خۆیشی بەلاوە موسڵمان ببوو، بەڵام هەر کوشتی تەنها لەبەر ئەوەی حوکمی گەڕاندەوە بۆ لای شەریعەتێکی دەستکرد لەبری شەریعەتی ألله. هەروەک ئیمامی البغوي -رحمه الله- لە تەفسیری ئایەتی **{ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم ءامنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا}**[1].

---

(١) سوڕەتی النساء، ئایەی ٦٠. بۆ زانینی مانا و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکە بگەڕێوە بۆ لاپەڕی ٧ بەدواوە.

ئیتر ئیمامی البغوي باسی هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: «**عن ابن عباس: نزلت في رجل من المنافقين يقال له بشر، كان بينه وبين يهودي خصومة فقال اليهودي: ننطلق إلى محمد، وقال المنافق: بل إلى كعب بن الأشرف، وهو الذي سماه الله الطاغوت، فأبى اليهودي أن يخاصمه إلا إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم، فلما رأى المنافق ذلك أتى معه إلى رسول الله، فقضى رسول الله صلى الله عليه وسلم لليهودي، فلما خرجا من عنده لزمه المنافق وقال: انطلق بنا إلى عمر رضي الله عنه فأتيا عمر فقال اليهودي: اختصمت أنا وهذا إلى محمد فقضى لي عليه فلم يرض بقضائه وزعم أنه مخاصم إليك، فقال عمر رضي الله عنه للمنافق: أكذلك؟ قال: نعم، قال لهما: رويدكما حتى أخرج إليكما فدخل عمر البيت وأخذ السيف واشتمل عليه ثم خرج فضرب به المنافق حتى برد، وقال: هكذا أقضي بين من لم يرض بقضاء الله وقضاء رسوله. فنزلت هذه الآية. وقال جبريل: إن عمر رضي الله عنه فرق بين الحق والباطل، فسمي الفاروق**»[1].

واتە: «**لە إبن عباسەوە فەرمووی: ئەم ئایەتە دابەزی لەسەر موونافیقێک بەناوی بشر، ئەو لەگەڵ جولەکەیەک کێشەی هەبوو، جولەکەکە گووتی: با بچینە لای محمد (واتە بۆ چارەسەری کێشەکە)، کەچی موونافیقەکە گووتی: با بچینە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف، هەر ئەویشە کە ألله ناوی لێنا "تاغوت". جولەکەکەش ڕازی نەبوو بەوەی ئەو دادگەرێتی بکات جگە لە محمد -صلى الله عليه وسلم-، جا کە موونافیقەکە ئەمەی بینی ئیتر -بە ناچارییەوە- لەگەڵی ڕۆیشت بۆ لای نێردراوی ألله، ئیتر پێغەمبەریش لە بەرژەوەندی جولەکەکە حوکمیدا، کاتێک هەردووکیان لەلای پێغەمبەر ڕۆیشتن، ئەمجارە موونافیقەکە گووتی: با بچینە لای عمر -رضي الله عنه- تاکو دادگەریمان بکات. ئیتر پێکەوە چوونە لای و جولەکەکە بە عمری گووت: من و ئەم پیاوە چووینە لای محمد و ئیتر ئەویش لە بەرژەوەندی من حوکمیدا، ئەم پیاوەش ڕازی نەبوو بە دادگەرییەکەی و داوای کرد تۆ دادگەرێتی بکەیت. ئیتر عمر بە موونافیقەکەی گووت:**

---

(١) تەفسیری البغوي -رحمه الله- بۆ سورەتی النساء، ئایەی ٦٠.

**ئەم قسانە ڕاستن؟ ئەویش گووتی بەڵێ. ئیمامی عمر پێیانی گووت: بووەستن تا دەگەڕێمەوە لاتان، ئیتر چووەوە ماڵی خۆی و شمشێرەکەی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ لایان و لە ملی مونافیقەکەیدا تاکو سارد بووەوە. هەروەها گووتی: ئاوا حوکمی کەسێک دەدەم کە ڕازی نەبووبێت بە حوکمی ألله و نێردراوەکەی. ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی، جوبرائیلیش فەرمووی: بەڕاستیی عمر -رضي الله عنه- حەق و ناحەقی لەیەکتر جیاکردەوە. ئیتر ناوی لێنرا "فارووق".»**.

هەروەک لەم ڕووداوە بۆمان دەرکەوت ئیمام عمر -رضي الله عنه- بەهیچ جۆرێک باوەڕی بە حوکم کردن بە شەریعەتە تاغوتەکان نەبووە، هەر کەسێکیش ئەم باوەڕەی هەبووبێت ئەوا بەلایەوە خوێنی حەلالە و کافرە، هەر بۆیەش بە شمشێرەکەی ئەو پیاوە دووڕووەی سەربڕی ئەگەرچی خۆیشی بە موسڵمان دەزانی، بەڵام هەر کوشتی لەبەر دوو هۆکار: یەکەم: ڕازی نەبوو بە حوکمەکەی نێردراوی ألله. دووەم: باوەڕی بە حوکمکردن هەبوو بە شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکان. بۆیەش لە سەرەتادا دەیویست کەعبی کوڕی ئەشڕەف حوکمیان لەنێواندا بدات (کە پیاوێکی جولەکە بوو)، هەروەها دواتریش حوکمی پێغەمبەری ڕەتکردەوە و دەیویست عمر بن الخطاب حوکمیان لەنێوان بدات. هەر بۆیەش بەم کارەی کافر بوو و کوژرا؛ چونکە حوکمی ألله و نێردراوەکەی ڕەتکردەوە و ڕووی لە حوکمێکی تاغوت کرد.

ئەمەش وەڵامێکی بەهێزی تێدایە بۆ ئیخوانییەکان؛ چونکە ئیخوانییەکان وای پیشان دەدەن کەوا ئەوان دەیانەوێت وەکو عمر بن الخطاب حوکمە شەڕعییەکان هەڵوەشێننەوە!! بەڵام ئەوەتا بۆمان دەرکەوت ئەسڵەن ئیمام عمر -رضي الله عنه- باوەڕی بە هیچ شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوت نەبووە لەبری شەریعەتی ألله. ئەوەشمان بیرنەچێت کە ئیمام عمر -رضي الله عنه- حوکمی بە شەریعەتی ألله دەکرد لە هەموو ڕوویەکەوە، تەنازولی لە هیچ حوکمێک نەکرد جگە لە حوکمی دەستبڕین، لە لاپەڕی داهاتوودا زۆرتر وەڵامی ئەم گومانە دەردەکەوێت.

لێرە دەپرسم: ئایا ئیخوانییەکانیش لەسەر ڕێبازی عمر بن الخطاب دەڕۆن و باوەڕیان بە شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکان نییە؟! ئایا ئیخوانییەکان کێشەیان تەنها لەگەڵ یەک حوکمی قوڕئانە یان ئامانجیان بریتییە لە حوکمکردن بە دیمۆکڕاسیەت؟! بێگومان نەخێر، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئیخوانییەکان و حیزبە بەناو ئیسلامییەکان باوەڕیان بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت هەیە و بە باشتری دەزانن لە شەریعەتی ألله، لەکاتێکدا ئەم شەریعەتە تاغوتە لە دەیان خاڵدا دژی شەریعەتی ألله یە و لەسەر کۆمەڵێک بنچینە دامەزراوە کەوا گشتیان کوفری گەورەن، ئەمەشم لە لاپەڕی ١٤ تا ١٢٥ سەلماند. هەروەها حیزبە ئیخوانییەکان کێشەکەیان تەنها لەوە بچووک نەبووەتەوە کە تەنها حوکمێک هەڵوەشێننەوە، بەڵکو ئامانجیان بریرتییە لە حوکم کردن بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت تاغوت، هەروەک یوسف القرضاوي گووتی: ئێمە کوشتار دەکەین لەپێناوی دیمۆکڕاسیەت!!

**ڕووی دووەم:** یەکێک لە مەرجەکانی بڕینی دەستی دز ئەوەیە کە دەبێ هیچ شوبهەیەکی نەبێت، بۆ نموونە وایزانیبێ شتەکە موڵکی خۆیەتی بۆیە بردبێتی!، یاخود نابێ شوبهەی ئایەت و فەرموودەیشی هەبووبێت کە ڕێنموویی کردبێت بەرەو ئەم کارە!

لەوانەیە خوێنەر بڵێت: جا چۆن ئایەت و فەرموودەکان ڕێنموویی موسڵمان دەکەن تاکو دزی بکات؟!

لە وەڵامدا دەڵێم: لە کتێبەکەی ألله ئایەتێک هەیە کەوا ألله دەفەرمووێت: {... **فمن اضطر في مخمصة غير متجانف لإثم فإن الله غفور الرحيم**}[1]. واتە: {... هەر کەسێکیش بەهۆی برسیەتییەوە ناچاربوو بە خواردنی یەکێک لەوانەی باسکران بەبێ ئەوەی ئامانجی تاوان و زیادەڕەویی بێت، ئەوا بەڕاستیی ألله لێبووردە و بەبەزەییە}.

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٣.

بەبێ هیچ دوودڵییەک دەتوانین بڵێین ئەم ئایەتە پیرۆزە وایکرد بەشێکی زۆر لە موسڵمانان لە وشکەساڵییەکەدا بەهۆی "ناچاریی و برسیەتییەکی زۆرەوە" هانا ببەن بەرەو خواردن و بردنی شتانێک کە موڵکی خۆیان نییە؛ چونکە ڕێژەی هەژاریی و برسیەتیی زۆر زۆر بەرز ببووەوە و زۆرینەی خەڵک تووشی هەژاریی بوون. هەر بۆیەش ئەمە وایکرد ئیمام عمر حوکمی بڕینی دەستی دز بووەستێنێت لەکاتی وشکەساڵیی؛ چونکە دەیزانی زۆرێک لە موسڵمانان شوبهەی ئایەتەکەی سەرەوە هانیان دەدات بۆ ئەوەی بە هەر جۆرێک بێت خۆراک و پارە بەدەست بهێنن، ئەم شوبهەیەش لەڕووی شەرعەوە دەبێتە بەربەستێک لەبەردەم جێبەجێ کردنی سزای دەست بڕین.

هەربۆیەش ئیمام عمر –رضي الله عنه– فەرمووی: «**لا قطع في عذق، ولا في عام سنة**»[1]. واتە: «**دەستی دز نابڕێتەوە لە دزینی خورما، هەروەها لە وشکەساڵیی**».

ئەمەش چونکە لە کاتی وشکەساڵیدا موسڵمانان وادەزانن ئایەتەکەیان لەسەر جێبەجێ دەبێت بۆیەش لەسەر بنەمای ئایەتە پیرۆزەکەوە شتانێک دەبەن کە موڵکی خۆیان نییە.

کەواتە لێرەوە خوێنەر سێ خاڵی بۆ دەردەکەوێت:

١- ئیمامی عمر بەردەوام بوو لە حوکم کردن بە شەریعەتی ألله، بەڵام تەنها یەک دانە حوکمی وەستاند.

٢- ئیمامی عمر –رضي الله عنه– بەشێوازێکی هەمیشەیی حوکمی دەستبڕینی دزی نەوەستاند، بەڵکو وەستاندنەکە بۆ ماوەیەکی کاتیی بوو.

٣- ئیمامی عمر –رضي الله عنه– هۆکاری وەستاندنی دەستبڕینی ڕوون کردەوە کە بەهۆی "قەیران و وشکەساڵیی" بووە، نەک بەبێ هۆکار.

---

(١) کتێبی المصنف لابن أبي شيبة > كتاب الحدود > في الرجل يسرق الثمر والطعام > فەرموودەی ژمارە: ٢٩٠٦٢.

بەڵام ئەی ئیخوانییەکان؟! ئایا حاڵیان لەگەڵ حاڵی ئیمام عمر یەکدەگرێتەوە؟ ئایا گومانەکەیان ڕاست بوو؟! نەخێر، ئەسڵەن هەر لە خاڵی یەکەمەوە دەدۆڕێن؛ چونکە ئەسڵەن حیزبە بەناو ئیسلامییەکان دەیانەوێت شەریعەتی دیمۆکڕاسیەت سەروەر بکرێت نەک شەریعەتی ألله!

ئیمام عمر –رضي الله عنه– حوکمەکەی وەستاند و هۆکارەکەش وشکەساڵیی بوو، بەڵام ئیخوانییەکان دەیانەوێت تێکڕای شەریعەتی ألله بووەستێنن لەپێناوی دیمۆکڕاسیەت! وەک بڵێی بەلایانەوە ئیسلام کەڵکی حوکمڕانیی نییە. جا ئیتر حیزبە بەناو ئیسلامییەکان ئەسڵەن دەیانەوێت حوکمی دەستبڕین (هەروەها حوکمەکانی تریش) بەشێوەیەکی هەمیشەیی بووەستێنن نەک بۆ ماوەیەکی کاتیی. هاوار بۆ حاڵیان لەگەڵ دەنگدەرانیشیان.

هەندێکجاریش دەڵێن: کاکە ئەوەتا ئێمەش لە قەیرانین! منیش دەڵێم: کاتێک سەیری ژیاننامەی پێغەمبەر –صلی الله علیە وسلم– دەکەین، دەبینین ئەوکاتیش هەژاریی هەر هەبووە، ئەسڵەن نێردراوی ألله خۆی یەکێک بووە لەوانەی زۆر هەژار بووە. کەچی حوکمی دەستبڕین هەر جێبەجێ کراوە و نەوەستێنراوە.

بەڵام ئیخوانییەکان حیساب بۆ ئەو بەڵگانە ناکەن؛ چونکە تەنها حاڵەتەکەی ئیمام عمر لەگەڵ بانگەوازە تاغوتپەرستییەکەیان یەکدەگرێتەوە لەکاتێکدا ئەسڵەن حوکمەکەی ئیمام عمر تەنها بۆ ماوەیەکی کاتیی بوو.

**ڕووی سێیەم:** ئیمامی عمر –رضي الله عنه– لەدوای ئەوەی بە ناچاریی و بەهۆی وشکەساڵییەکی توندەوە حوکمی دەستبڕینی بۆ ماوەیەکی کاتیی وەستاند، ئیتر سزایەکی تری دانەنا لەبری حوکمی دەستبڕین. ئەوانەیشی کە دەڵێن گوایە ئیمام عمر دزەکانی زیندانی دەکرد، ئەمانە ڕاست ناکەن و بەڵگەیان نییە، تەنها بوهتانێکە و

بەدەمی ئیمام عمر هەڵیانبەستووە؛ چونکە ئیمام عمر تەنها حوکمی دەستبڕینی وەستاند و هەرگیز سزاکەی نەگۆڕی بە سزایەکی تر!

بەڵام ئیخوانییەکان هەر بەوە ناوەستن کە حوکم و سزایە شەڕعییەکان پەک بخەن، بەڵکو هەر باوەڕیان پێی نییە و دەیانەوێت بەعەقڵی خۆیان سزا دروست بکەن و بیخەنە شوێنی سزایە شەڕعییەکان، پەنا بە ألله. ئەوەتا شێخ ناصر الفهد –حفظه الله– زیادتر لە ٤ کاژێر گفتوگۆی لەگەڵ یەکێک لە ئیخوانییەکان کرد تەنها بۆ ئەوەی قەناعەتی پێ بهێنێت کەوا ڕەجم لە ئیسلامدا هەیە! کەچی لەدوای پیشاندانی چەندین بەڵگە و فەرموودەی صحیح، هەر قەناعەتی نەکرد و ڕەتی کردەوە! ئیخوانییەکان دەیانەوێت لەسەر ڕێبازی حوکومەتە دیمۆکڕاسیخوازەکانی ئەوڕوپا و ئەمریکا بڕۆن، هەروەک چۆن بەلای ئەوانەوە بەهێزترین سزا بریتییە لە زیندان، ئاواش دەیانەوێت بەناوی ئیسلامەوە حوکمە شەڕعییەکانی ألله ڕەت بکەنەوە و بیگۆڕن بە سزای بەندکردن! چی کوفرێک هێندەی ئەمە گەورەیە؟ مەگەر ئەمەش شیرک بڕیاردان نییە بۆ ألله لەڕووی یاسادانان؟! هاوار بۆ حاڵیان، هاوار بۆ حاڵی دەنگدەران و ئەوانەیشی پێیان هەڵخەڵەتاون.

ئەی خوێنەری بەڕێز، دەپرسم: کوانێ چۆن حاڵەتی ئیمام عمر لەگەڵ حاڵەتی ئەم ئیخوانییانە یەک دەگرێتەوە؟! ئەسڵەن ئەم ڕووداوی وشکەساڵییە هەر نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی ئیخوانییەکان حوکم و شەریعەتی ألله بەتەواویی پەک بخەن بەبێ هیچ هۆکارێک تەنها لەپێناوی گۆڕینی شەریعەتی ألله بۆ دیمۆکڕاسیەت! ئیمام عمر لەدوای تەواوبوونی وشکەساڵییەکە حوکمەکەی چەسپاندەوە و جێبەجێی دەکرد، بەڵام ئیخوانییەکان دەیانەوێت بۆ هەمیشە بیوەستێنن.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

### گومانی پێنجەم: پێویستە لەژێر جەماعەتێک کۆببینەوە.

ئەمەش دانەیەکی ترە لە گومانەکانی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان. کە دەڵێن: کاکە ئەوەتا ألله لە کتێبەکەیدا فەرمانمان پێدەکات تاکو لەژێر یەک ئەمیر و یەک حیزب کۆببینەوە، بۆیەش ئێمە حیزبمان دروست کردووە!

لە وەڵامی ئەم قسەیەیان دەڵێم: سەرەتا پێویستە ئیخوانییەکان ئەم قسەیە لەسەر خۆیان جێبەجێ بکەن، لە ئیسلامدا فەرمان بە یەکگرتنی موسڵمانان کراوە، کەچی ئیخوانییەکان لە هەموو وڵاتێکدا ئیللا خەڵکیان پارچە پارچە کردووە بۆ سەر چەند حیزب و پارچەیەک!

بە پێویستی دەزانم چەند جیاوازییەکی جەماعەتی شەرعیی لەگەڵ ئەم حیزبە بەناو ئیسلامییانە باس بکەم، کە ئەمانەن:

**جیاوازیی یەکەم:** جەماعەتی شەرعیی ئەوەیە کە لەناو دارولکوفر دروست بکرێت و هیچ پەیوەندییەکی بە حوکومەتە تاغوتییەکەوە نەبێت، نابێ لەژێر سەرپەرشتی ئەم حوکومەتە تاغوتپەرستانە بێت. کەچی ئیخوانییەکان سوودیان لەوە بینیوە کە ئەم خاکە دارولکوفرە، ئیتر هاتوونە و خۆیان تەسلیمی ئەم حوکومەتە تاغوتپەرستەی کوردستان کردووە و لەژێر سەرپەرشتی و مۆڵەتی ئەواندا حیزبیان دروست کردووە و ڕازی بوونە بە تێکڕای مەرجە کوفرینەکانیان هەروەک لە لاپەڕی ١٠٧ تا ١١٢ باسکراوە، ئینجا هاتوونە و ناویان لێناوە "جەماعەی شەرعیی"! ئەمانە حیزب و جەماعەتی شەیتانن.

**جیاوازیی دووەم:** جەماعەتی شەرعیی ئەوەیە کە تەنها یەک دانە بێت و تەنها یەک ئامانجیشیان هەبێت کە بریتییە لە گەڕاندنەوە و چەسپاندنی حوکمی ألله،

هەروەها لەسەر یەک مەنهەج بن ئەویش بریتییە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم-، هەروەها تێکڕای موسڵمانانی ئەهلی تەوحید لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و نابێ بەهیچ جۆرێک ڕێگا خۆشبکات بۆ ئەهلی تەوحید و ئیسلام کەوا بیر لە جەماعەتی تر بکەنەوە، کەچی ئیخوانییەکان هەر لەناو کوردستاندا ٣ پارچەن!، هەروەها لەژێر سەرپەرشتی حوکومەتە تاغوتپەرستەکەی کوردستان مۆڵەتیان پێدراوە، هەروەها هەریەکێک لەم پارچانەش جۆرەها بیروباوەڕی پووچەڵیان تێدایە کە بەناوی موسڵمانەوە کۆکراونەتەوە لەکاتێکدا ئەم بیروباوەڕانە هەرگیز بەیەکەوە کۆناکرێنەوە و دژی یەکترن و زۆرێکیان لەناو قورئان تەکفیر کراون، وەکو گۆڕپەرستەکان و عەلمانییەکان و قورئانییەکان و چەندین بیروباوەڕی پووچەڵی تر. لەکاتێکدا کەوا جەماعەتی شەرعیی پێویستە پاکترین بیروباوەڕیان هەبێت و نابێ هیچ موشریک و مولحیدێک لەناویان بێت تەنها لەبەر ئەوەی خۆی داوەتە پاڵ ئیسلام!

**جیاوازیی سێیەم:** جەماعەتی شەرعیی پێویستە لەسەر بنەمای چاکسازیی موسڵمانان دابمەزرێت، هەروەها ببێتە قەڵغانێک بۆ پاراستن و خزمەتکردنی موسڵمانان، لە هەمان کاتیش ببێتە دڕکێک بۆ کافرانی شەڕخواز، هەروەها پرۆژە و پلانی ستراتیژی هەبێت بۆ لەناوبردنی شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکانی خاکەکە، هەروەها دەبێ ئامادەکاریی بکەن لەڕووی زانست و هەروەها لەڕووی جەستە و چەکدارییەوە بۆ ئەنجامدانی فەڕیزەی جیهاد و جێبەجێ کردنی شەریعەتی ألله و بڵاوکردنەوەی تەوحید. کەچی ئیخوانییەکان ئەسڵەن خۆیان باوەڕیان بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوت هەیە و مومارەسەی دەکەن، هەروەها ئەسڵەن ئەوەندەی کێشەیان لەگەڵ ئەهلی تەوحید هەیە، نیو ئەوەندەش کێشەیان لەگەڵ ئەهلی کوفر نییە، ئیتر چۆن حوکم و شەریعەتی ألله دەگەڕێننەوە؟! کوانێ هەوڵ و کۆششیان بۆ جێبەجێ کردنی حوکمی ألله؟! تەنانەت لە هەشتاکانەوە پارتی و یەکێتیان بە برای خۆیان زانیوە و پەیوەندییان لەگەڵیان هەبووە، ئەمەش بە دانپێدانانی عەلی باپیر لە کاناڵی NRT.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

## گومانی شەشەم: پەرڵەمانتار یەکسانە لەگەڵ "أهل الحل والعقد".

ئەمەش دانەیەکی ترە لە گوفتارە پووچەڵەکانی حیزبە ئیخوانییەکان کە زۆرجار خەڵکێکی ساویلکەی پێ چەواشە دەکەن، دەڵێن: کاکە هەروەک چۆن لە دیمۆکراسیەتدا "پەرڵەمانتار" بوونی هەیە، ئاواش لە ئیسلامدا "أهل الحل والعقد" بوونیان هەیە. هەروەها "پەرڵەمان" یەکسانە لەگەڵ "مجلس الشوری".

لە وەڵامدا دەڵێم: سبحان الله، سەرەڕای کافر بوونی ئەندام پەرڵەمانەکان بەهۆی ٩ دانە کوفری گەورە (لە لاپەڕی ٢٠٧ و ٢٠٨ باسکراون)، کەچی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان هێشتا دەیانەوێ ئەم پەرڵەمانتارە کافرانە بهێننە ڕیزی أهل الحل والعقد.

لە گوفتارەکەیاندا دوو خاڵ دەردەکەوێت کە پێویستە وەڵامیان بدەینەوە:

١- دەڵێن پەرڵەمانتار یەکسانن لەگەڵ أهل حل والعقد!

٢- دەڵێن پەرڵەمان یەکسانە لەگەڵ مجلس الشوری!

پێویستە وەڵامی هەردوو خاڵەکە بدەینەوە:

**وەڵامی خاڵی یەکەم:**

فەرموون خوێنەرانی بەڕێز، ببینن "أهل الحل والعقد" چەندە جیاوازن لە ئەندامەکانی پەرڵەمان. سەرەتا با پێناسەیان بکەین.

**أهل الحل والعقد:** بریتین لە ژمارەیەک زانای موسڵمان کەوا توانای زانستیان گەیشتووەتە ئاستی ئیجتیهاد، هەروەها دیار و ناسراون لەناو موسڵمانان، هەروەها هێز و دەسەڵاتیان پێدراوە و لەلایەن خەلیفەی موسڵمانانەوە دیاری کراون بۆ ئەنجامدانی کۆمەڵێک ئەرکی دیاریکراو (لە لاپەڕەکانی داهاتوو قسە لەم بارەیە دەکەین).

ئەگەرچی پێناسەی تریشیان بۆ کراوە، بەڵام ئەمەیان گونجاوترین پێناسەیە بۆیان، هەروەها بژاردەی ئیمامی نەوەوییە –رحمه الله–[1].

لە گرینگترین تایبەتمەندییەکانی أهل الحل والعقد ئەمانەن:

١- موسڵمان بێت، بەو مانایەی کوفری بە تاغوتەکان کردبێت و تەوحیدی هەبێت بەوجۆرەی ألله باسیکردووە لە کتێبەکەی، ئەمەش دەیسەلمێنێت ئەهلی هیچ دینێکی تر یاخود هیچ مولحیدێک نابێ بخرێنە ڕیزی أهل الحل والعقد.

٢- عاقڵ بێت و باڵغ بێت، بەو مانایەی کە بتوانێت لە شتەکان تێبگات و بیرکردنەوەی فراوان بێت، هەروەها لە قۆناغی منداڵیی دەرچووبێت، ئەمەش دەیسەلمێنێت مرۆڤی شێت یاخود نابینا و نابیست نابێ بخرێنە ڕیزی أهل الحل والعقد، بەهەمان شێوە منداڵیش نابێت.

٣- زانا بێت، بەو مانایەی کە موسڵمانێکی تەواو زانا بێت لە بابەتە عەقیدەییە بناغەییەکان، هەروەها بەتەواویی ئاگاداری مانا و تەفسیری تێکڕای ئایاتەکانی قورئانی پیرۆز بێت، بە هەموو زانستەکانی قورئانیشەوە، بەتایبەت ناسخ ومنسوخ. هەروەها ئاگاداری زانستی أصول الفقه بێت (بەلایەنی کەمەوە). هەروەها پێویستە زانا بێت بە سیاسەتی شەرعیی و ئەزموونی هەبێ. ئەمەش دەیسەلمێنێت ئەو مرۆڤانەی کە بێ ئاگان لە عەقیدەی ئیسلامیی (بەتایبەت تەوحید و الولاء والبراء) ئەوا هەر بۆیان نییە بکرێن بە أهل الحل والعقد؛ چونکە ئەمانە هێشتا هەر نەبوونەتە موسڵمان! هەروەها کەسانێک کە ئاگاداری عیلمەکانی قورئان نەبن و شارەزای سیاسەتی شەرعیی نەبن ئەوا هەر نابێ بخرێنە ئەم ڕیزە؛ چونکە ئەم کەسانە نەزانترین چینی کۆمەڵگەن، نابێ کاروباری موسڵمانان بکەوێتە بەردەستیان.

(١) کتێبی منهاج الطالبين وعمدة المفتين في الفقه > كتاب البغاة > فصل: شرط الإمام.

٤- ڕەگەزی نێر بێت، ئەمەش دەیسەلمێنێت نابێ موسڵمانی ڕەگەزی مێ بخرێتە ڕیزی أهل الحل والعقد، ئەمەش لەسەر قیاسی ئایەتی ألله –عز وجل–: {**الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض ...**}[1]. واتە: {پیاوان سەرکردە و بەهێز و بەڕێوەبەرن بەسەر ئافرەتان بەوەی کە ألله فەزڵ و پلەوپایەی هەندێکیانی داوەتە سەر هەندێکیان ...}. ئەمەش دەچێتە قاڵبی دانانی کەسی شیاو لە شوێنی شیاو، نەک ئەوەی کە عەلمانییەکان خستوویانەتە قاڵبی نادادپەروەریی. بەڵکو ئافرەت لەڕووی شەرعەوە کۆمەڵێک ئەرکی پیرۆز و ئاسانی بۆ دانراوە ئەوانیش بەڕێوەبردنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵەکانیەتی، هەروەها مانەوەیەتی لەنێو ماڵەوە (مەگەر بۆ حاڵەتی گەشت و پیاسە و کڕینی پێداویستی). بۆیەش ئەم ئەرکە بە پیاو ڕاسپێردراوە.

**جا لێرەدا دەپرسم:** ئایا لە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتدا هەمان ئەم مەرجانە دانراون بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێتە پەڕلەمانتار؟! بێگومان نەخێر، بەڵکو لە ماددەی ٤٩ لە خاڵی دووەم لەناو دەستووورە تاغوتەکەی عیراق هاتووە: مەرجە ئەو کەسەی خۆی دەپاڵێوێت بۆ ئەندامێتی ئەنجومەنی نوێنەران، عیراقیی بێت و بەتەواویی شایەنی ئەو پۆستە بێت.

کوانێ مەرجی موسڵمانێتی؟ کوانێ مەرجی هەبوونی زانستی شەرعیی؟ کوانێ مەرجی ڕەگەزی نێر؟ ئەسڵەن لە هەمان مادده لە خاڵی چوارەم نووسراوە: یاسای هەڵبژاردن ڕێژەیەک بۆ بەشداربوونی ئافرەتان دادەنێت بەجۆرێک کە لە چارەکی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران کەمتر نەبێت!

کەواتە هەروەک بینیمان لە مەرجەکانی ئەندامی پەڕلەماندا ئەسڵەن هیچ نیشانەیەکی ئەهلی "حل وعقد" ی تێدا نییە!، هیچ کێشەیەک نییە لەوەی پەڕلەمانتار بێدین بێت، یاخود عەلمانی و دژە ئیسلام بێت، هیچ کێشەیەک نییە پەڕلەمانتار با هیچ زانستی شەرعیی نەبێت، گرینگ ئەوەیە عیراقییە و بە پێی دەنگی خەڵک

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٣٤.

هەڵبژێردراوە. بۆیەش دەبینین پەڕلەمان پڕیەتی لە ئافرەت، پڕیەتی لە دژە دینەکان، پڕیەتی لە مرۆڤی نەزان و جاهیل و کەم ئەزموون و بێ ئاگا لە شەریعەتی ألله.

بەڕاستیی ئەوەی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان دەیکەن، سووکایەتییە بە أهل الحل والعقد؛ چونکە بەم قسەیەیان ئیتر کۆمەڵێک مرۆڤی کافری دژە دین دەهێننە ئاستی کۆمەڵێک مرۆڤی موسڵمانی تەقواداری خاوەن زانست و خیبرە. هەروەها بەم قسەیەیان شەریعەتی ألله دەهێننە ڕیزی شەریعەتێکی تاغوت و دەستکردی مرۆڤەکان.

با بەردەوام بین بۆ ئەوەی زۆرتر هەست بە جیاوازییەکانی أهل الحل والعقد بکەین لەگەڵ پەڕلەمانتارە کافرەکان. بۆیەش با بزانین ئەرکە زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەهلی حل وعقد چین زۆر بەکورتیی.

**ئەرکە زانستییەکانی أهل الحل والعقد:**

١- گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەمیری موسڵمانان لەبارەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی حوکمە شەرعییەکان و هەروەها لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ پێشهاتە نوێیەکان لەڕووی شەرعەوە.

٢- ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر ئاستی زانستیی موسڵمانان تاکو بزانن لە چ ڕوویێکی شەرعەوە زانستیان کەمە، ئیتر لەڕێگای بنکەی توێژینەوە و فەتوادان (مركز البحوث والإفتاء) کتێب و نامیلکە و دەرسی شەرعیی لەبارەیەوە بڵاو بکەنەوە.

**ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی أهل الحل والعقد:**

١- سەرپەرشتیکردنی دیوانی "الحسبة" بۆ فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریی کردن لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر).

٢- چاکسازیی و بانگەوازکردنی موسڵمانە سنووربەزێنەکان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ناو کۆمەڵەی موسڵمانان و یەکڕیزیی ئەهلی ئیسلام بپارێزن.

**ئەركە سیاسییەكانی أهل الحل والعقد:**

١- ئەركی دیاریكردنی ئیمام و خەلیفەی موسڵمانان لە ئەستۆیانە.

٢- ڕێنمایی كردنی ئیمامی موسڵمانان و ڕاستكردنەوەی كەموكوڕییەكانی لەپێناوی پاراستنی موسڵمانان لە فیتنە و دووبەرەكیی.

ئەوەی باسمكرد بریتین لە كەمینەیەكی ئەركەكانی أهل الحل والعقد. بەڵام ئایا پەڕڵەمانتاریش هەمان ئەم ئەركانە جێبەجێ دەكات هەروەك ئەوەی ئیخوانییەكان دەڵێن؟! ئایا لە هیچ كتێبێكی فیقهیدا باسی ئەوە كراوە كەوا أهل الحل والعقد ئەركیان بریتی بێت لە یاسادانان؟! نەخێر، ئەسڵەن لە شەریعەتی أللە دا ئەهلی الحل والعقد ئەركی زۆر لەوە فراوانترە و لەخزمەتی شەریعەتی أللە یە، لەخزمەتی موسڵمانانە. بەڵام لە شەریعەتی دیمۆكڕاسیەتدا پەڕڵەمانتار ئەركی بریتییە لە یاسادانانی بێسنوور، یاسایەك كە دژی شەریعەتی أللە بێت یاخود لەسەر بنەمای دینەكەی أللە نەبێت ئەگەرچی لە ئیسلامدا حوكمی شەرعیش هەبێت لەبارەیەوە.

كەواتە ئەی قەومەكەم، ئەوە بۆتان دەركەوت پەڕڵەمانتار كێیە و ئەركی چییە، هەروەها بۆشتان دەركەوت أهل الحل والعقد كێن و ئەركیان چییە لەڕووی زانستیی و كۆمەڵایەتیی و سیاسیی. ئیتر ئایا ئیخوانییەكان ڕاستیان كرد كە گووتیان ئەم دووانە یەكسانن؟! ناواللە ڕاستیان نەكرد، بەڵكو ئەوە بۆمان دەركەوت ئەم ئیخوانییانە لەپێناوی شەڕعیەتدان بە دیمۆكڕاسیەت ئامادەن ناحەق بكەن بە حەق.

بۆ زانینی ڕاستی تریش لەمبارەیە، فەرموون بگەڕێنەوە بۆ كتێبەكانی ئەهلی عیلم لەم بارەیەوە: [الأحكام السلطانية للماوردي]، [الأحكام السلطانية لأبي يعلى]، [مآثر الإنافة في معالم الخلافة للقلشندي]، [غياث الأمم في التياث الظلم للجويني]، [الحسبة في الإسلام أو وظيفة الحكومة الإسلامية لإبن تيمية]. ئەمانە كتێبی زانایانی پێشینن –رحمهم الله–، خۆتان بیانخوێننەوە تاكو زۆرتر بزانن أهل الحل والعقد كێن.

**وەڵامی خاڵی دووەم:**

ئەوە بەفەزڵی ألله زانیمان أهل الحل والعقد جیاوازن لە پەڕلەمانتاران، ئەمجارەیان ئیخوانییەکان دەڵێن: پەڕلەمان یەکسانە لەگەڵ مجلس الشوری!

هەربۆیەش دەبینین لە وڵاتانی بەناو ئیسلامیدا لەناو پەڕلەمان بە گەورەیی و بەبێ هیچ شەرمێک ئایەتی ألله دانراوە کە فەرموویەتی: {... **وأمرهم شورى بينهم** ...}[1]. واتە: {... کاروبارەکانیان بە پرس و ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن ...}.

با بزانین لەمەیان ڕاست دەکەن یاخود هەروەکو ئەوەی پێشووتر تەنها چەواشەکاریی و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکە.

سەرەتا بەر لە وەڵامدانەوەی گومانەکەیان، دەمەوێ هەڵوەستەیەکی کورت لەسەر ئایەتەکە بکەین و بزانین ئایا ئەسڵەن دیمۆکراسیخوازەکان و ئیخوانییەکانیش ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوە یان نا.

ألله لە ئایەتەکە باسی موسڵمانان دەکات و لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: {**والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شورى بينهم ومما رزقناهم ينفقون**}[2]. واتە: {ئەوان ئەو کەسانەن کە وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاریان دایەوە و نوێژ دەکەن و کاروبارەکانیان بە پرس و ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن و لەو ڕۆزیەی کە پێمان داون دەیبەخشن}.

کە سەیری ئایەتەکە دەکەین، بۆمان دەردەکەوێ ئەسڵەن ئەم ئایەتە پیرۆزە لەسەر پەڕلەمان و پەڕلەمانتاران و دیمۆکراسیخوازان جێبەجێ نابێت، ئەمەش چونکە:

١- ألله لە ئایەتەکەدا تەنها وەسفی "موسڵمان" دەکات و دەڵێت پرس و ڕاوێژ دەکەن لەنێوان خۆیان، کەچی لەناو پەڕلەماندا جولەکە و گاور و ئێزدی و کاکەیی و

(١) سورەتی الشورى، ئایەی ٣٨.

(٢) سورەتی الشورى، ئایەی ٣٨.

عەلمانی و ئیخوانیشی تێدایە کە هیچیان موسڵمان نین و هەموویان لەژێر چەتری دێمۆکڕاسیەتی تاغوت کۆبوونەتەوە و ئیمانیان پێیەتی لەکاتێکدا ألله فەرموویەتی کوفری پێ بکەن (بگەڕێوە لاپەڕی ٧ بەدواوە). ئیتر چۆن ئەم ئایەتە لەسەر پەڕلەمان جێبەجێ دەبێت؟!

٢- ألله وەسفی موسڵمان دەکات کە یەکەم مەرج ئەوەیە دەبێت وەڵامی داواکاریی ألله بداتەوە، باشە یەکەمین و گرینگترین داواکاری ألله چییە؟ بێگومان بریتییە لە تەوحید، هەروەک لەبارەی پەیامی تێکڕای پێغەمبەران –علیهم الصلاة والسلام– فەرموویەتی: **{ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ...}**[1]. هەروەها لە ئایەتی دوای ئایەتی کورسی پێمان دەڵێت چۆن ببین بە موسڵمان، هەروەک فەرموویەتی: **{... فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ...}**[2]. هەروەها پێمان دەڵێت یەکێک لەو جۆرانەی تاغوت کە پێویستە کوفری پێ بکرێت بریتییە لە تاغوتی شەریعەتە دەستکردەکان (وەکو دێمۆکڕاسیەت)، هەروەک فەرموویەتی: **{ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم ءامنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا}**[3]. کەچی پەڕلەمان گەورەترین و گرینگترین دامەزراوەی دێمۆکڕاسیەتی تاغوتە و پەڕلەمانتارە تاغوتەکانیش گرینگترین ئەرکیان لە ئەستۆیە ئەویش بەرەو پێش بردنی دێمۆکڕاسیەتە. کەواتە چۆن ئەم ئایەتە لەگەڵ پەڕلەمان دەگونجێت؟!

ئیتر چۆن ئەم ئایەتەتان لەگەڵ پەڕلەمانە بۆگەنەکەتان تێک هەڵکێشا؟! پەڕلەمان شوێنی دانانی یاسایە دەستکردەکانە، ئەندامەکانی پەڕلەمان سیفەتی تەشریعیان لە ألله زەوت کردووە بۆخۆیان، هەروەها ٩ دانە کوفری گەورەیان کردووە ئینجا

---

(١) سورەتی النحل، ئایەی ٣٦. بۆ زانینی مانا و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکە بگەڕێوە بۆ لاپەڕی ٢١ بەدواوە.
(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦. بۆ زانینی مانا و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکە بگەڕێوە بۆ لاپەڕی ٧ بەدواوە.
(٣) سورەتی النساء، ئایەی ٦٠. بۆ زانینی مانا و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکە بگەڕێوە بۆ لاپەڕی ٧ بەدواوە.

گەیشتوونەتە ناو پەڕڵەمان، ئیتر چۆن پەڕڵەمانتاران موسڵمانن؟! چۆن پەڕڵەمان یەک دەگرێتەوە لەگەڵ مەجلیسی شوڕا؟! با بزانین "مجلس الشوری" چییە...

**مجلس الشوری:** بریتییە لەو کۆڕەی کە تێیدا ئەهلی الحل والعقد کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی پرس و ڕاوێژ بکەن لەبارەی چەند بابەتێکی پەیوەست بە دانیشتووانی دارولئیسلامەکە، یاخود لەبارەی کاروباری دەوڵەت گفتوگۆ دەکەن و هەوڵی یەکلایی کردنەوەی کێشەکان دەدەن لەسەر بنەمای شەریعەتی ألله، ئەگەریش لە شەریعەتی ألله هیچیان دەست نەکەوت ئەوا لەسەر بنەمای ئیجتیهادی خۆیان ڕێکدەکەون بەبێ ئەوەی ئیجتیهادەکەیان دژی تاکە ئایەتێکی قورئانیش بێت.

ئەمەیە شوڕا، بەڵام ئایا پەڕڵەمانیش وەکو مەجلیسی شوڕایە؟! ئایا ئەندامەکانی پەڕڵەمان هەمان مەرجەکانی "ئەهلی الحل والعقد" ـیان تێدایە؟! ئایا پەڕڵەمانتاران لەسەر بنەمای قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر –علیه الصلاة والسلام– یاساکانیان دادەنێن؟! ئایا ئەندامەکانی پەڕڵەمان لەکاتی کۆبوونەوەیاندا هیچ یاسایەک دروست ناکەن کەوا دژی شەریعەتی ألله بێت؟! ئایا هیچ پەڕڵەمانێک هەیە لە دەوڵەتانی بەناو ئیسلامیی کە ئەندامی پەڕڵەمانەکانی هەمان سیفەتی "ئەهلی الحل والعقد" لەخۆ بگرن؟!

وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە بریتییە لە "نەخێر". ئەی کەواتە چۆن پەڕڵەمانێکی پیس هێنراوەتە ڕیزی مەجلیسی شوڕا؟ لە مەجلیسی شوڕادا ئەسڵەن کافر و موشریک بۆیان نییە دابنیشن، ئەسڵەن ئەندامانی مەجلیسی شوڕا قسە لەسەر شتێک ناکەن کە لە قورئان و سوننەدا یەکلا کرابێتەوە، بۆ نموونە حەلال و حەڕامەکان هەرگیز قسەیان لەسەر ناکرێت لەلایەن ئەهلی الحل والعقد؛ چونکە ألله فەرمانی کردووە و کۆمەڵێک شتی حەلال و حەڕام کردووە، ئەوانیش پابەند دەبن و قسەی لەسەر ناکەن. کەچی ئەندامەکانی پەڕڵەمان قسە لەسەر هەموو شتێک دەکەن بەبێ سنوور، ئەسڵەن پەڕڵەمان دەیان و سەدان یاسای تێدا دەرچووە کە تیایدا بەرپەرچی ئایەتی ألله دراوەتەوە، چەندین حەلالیان حەڕام کردووە و چەندین حەڕامیان حەلال کردووە.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

### گومانی حەوتەم: هەموو شتێک بە نیەتە.

ئەمەش دانەیەکی تری گوفتارە پووچەڵەکانی ئیخوانییەکانە کە زۆرێک لەم قەومە نەزانەیان پێی هەڵخەڵەتاندووە و دەڵێن: کاکە ئەگەر دیمۆکراسیەت تاغوتیش بێت ئەوا خۆ ئێمە نیەت و دڵمان باشە و دەمانەوێ حوکمی ألله بگەڕێنینەوە.

سەرەتا بەر لەوەی وەڵامی گومانەکە بدەم، دەڵێم: ئەگەر دان بەوە دەنێن کە دیمۆکراسیەت تاغوتە، ئەوا چۆن و بە چ جورئەتێک مومارەسەی دەکەن؟ مەگەر ألله تێکڕای پێغەمبەرانی نەناردووە تاکو خەڵک خۆیان لە تاغوت بەدوور بگرن؟! ئەوەتا فەرموویەتی: {**ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ...**}[١]. واتە: {بەڕاستیی ئێمە لەناو هەموو ئوممەتێک نێردراوێکمان ناردووە کە –پێیان دەڵێت–: ألله بپەرستن و دووركەونەوە لە تاغوت ...}.

چۆن دان بەوە دەنێن دیمۆکراسیەت تاغوتە و لە هەمان کاتیشدا مومارەسەی دەکەن؟ مەگەر ئەم کارە پێچەوانەی فەرمانی ألله نییە کاتێک فەرمانی کردووە: {**... فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ...**}[٢]. واتە: {... جا هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بهێنێت بە ألله ئەوا خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}. کەواتە مەرجی یەکەمی موسڵمان بوون ئەوەیە کوفر بە تاغوت بکرێت، کەچی ئێوەی دیمۆکراسیخوازی بەناو ئیسلامیی مومارەسەی تاغوت دەکەن و دانیش بەوە دەنێن تاغوتە، کوانێ کوفر بەتاغوت؟!

---

(١) سورەتی النحل، ئایەی ٣٦.

(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

سەبارەت بەوەیشی کە دەڵێن گوایە دەتانەوێت حوکمی ألله بگەڕێننەوە، ڕاست ناکەن سوێند بە ألله؛ چونکە دەیان جار بیستوومانە لە زانا و سەرکردە ئیخوانییەکانی میسڕ و ناوچەکانی تریش (بە کوردستانیشەوە) کە دەڵێن ئێمە دیمۆکڕاسیەتی ڕاستەقینەمان دەوێت، ئێمە دەستووری نائیسلامی دەنووسینەوە، ئێمە کوشتار دەکەین لەپێناوی دیمۆکڕاسیەت، ئێمە دەوڵەتی دینیمان ناوێت و دەوڵەتی مەدەنیمان دەوێت! ئەمە گوفتارەکانی خۆتانە و دەیان جار لە پێگەکان کەوتووەتە بەر گوێم، ئیتر لە ألله ناترسن ئەم خەڵکە چەواشە دەکەن؟

ئێستاش با بێینە سەر وەڵامدانەوەی ئەسڵی گومانەکە، با بزانین ئایا نیەتی دڵ هیچ سوودی بۆ مرۆڤەکە هەیە ئەگەر لە ڕواڵەتدا خەریکی کارێکی کوفر بێت؟!

لە ڕووی شەرعەوە، بۆ ئەوەی موسڵمانێکی موەحید کردەوەکان و عیبادەتەکانی لێ قەبوڵ بکرێت و بچێتە سەر تەرازووی چاکەی، ئەوا پێویستی بە دوو مەرج هەیە:

**مەرجی یەکەم:** پێویستە نیەتی دڵی پاک بێت و بەوپەڕی ئیخلاسەوە تەنها لەپێناوی ألله کارەکەی بکات، دوور لە بەرچاویی (واتە ڕیا)، هەروەها دوور لە بەرگوێیی (واتە سومعە)، هەروەها دوور لە بەدەستهێنانی ناوبانگ (واتە شوهرە). کەواتە نابێ نیەتی هیچ کامێک لەم سێیەی هەبێ، بەڵکو تەنها لەپێناوی ألله –سبحانە وتعالی– کارەکەی بکات. ئەمەش بەبەڵگەی فەرمایشتی نێردراوی ألله –صلی الله علیه وسلم–: «**إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوى ...**»[1]. واتە: «**بەڕاستیی کردەوەکان لەسەر نیەتەکان وەستاون، هەموو مرۆڤێکیش پاداشتی بەپێی نیەتی خۆیەتی ...**».

(١) کتێبی صحيح البخاري > باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله –صلى الله عليه وسلم؟ > فەرموودەی ژمارە: ١.

**مەرجی دووەم:** پێویستە کردەوەکەی هاوتا بێت لەگەڵ قورئانی پیرۆز و سوننەتی نێردراوی ألله –صلی الله علیه وسلم–، نابێ کارێک بکات بەناوی ئیسلامەوە لەکاتێکدا هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی لەسەر نەهاتبێ لە قورئان و سوننەت، هەروەک نێردراوی ألله فەرموویەتی: «**من أحدث في أمرنا هذا ما ليس فيه فهو رد**»[1]. واتە: «**هەر کەسێک نوێکاریی لە کاروبارمان بکات (واتە نوێکاری لە ئیسلام بکات) لەکاتێکدا شتی وای تێدا نەبووبێ ئەوا ڕەت دەکرێتەوە**».

مەبەستی پێغەمبەر –علیه الصلاة والسلام– لە "نوێکاریی" ئەوەیە کە عیبادەتێک یان کردەوەیەک بەناوی ئیسلامەوە بکرێت لەکاتێکدا لەناو ئیسلامدا ئاماژە بە شتی وا نەکرابێت.

ئەم دوو مەرجەی باسکران تەواوکەری یەکترن، هیچ موسڵمانێکی ئەهلی تەوحید عیبادەتەکانی لێ قەبوڵ ناکرێت ئەگەر بەناوی ئیسلامەوە بیکات و یەکێک لەم دوو مەرجەی تێدا نەبێت.

کەچی ئیخوانییەکان لەمەشدا خیانەت لەم قەومە بەستەزمانە دەکەن و تەنها باسی مەرجی یەکەمیان بۆ دەکەن و دەڵێن کاکە هەموو کارێک بە نیەتی دڵە. کەچی باسی مەرجی دووەمیان بۆ ناکەن کەوا نێردراوی ألله هۆشداریان پێدەدات و دەڵێت نابێت کردەوەیەک بەناوی دینەوە بکەن کە لەدین نەبێت.

لێرەدا ئێمە بە ئیخوانییەکان دەڵێین: ئێوەی تاغوتپەرست و دێمۆکڕاسیخواز هاتوونە و کارە پیسەکەتان داوەتە پاڵ ئیسلام و ئیتر چەند حیزبێکتان دروست کردووە و سیاسەت بە شەریعەتێکی تاغوت دەکەن و پاشگری "ئیسلامی" ـتان لکاندووە بەخۆتانەوە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ألله –عز وجل– هۆشداریان پێدەدات کە کوفر بە تاغوتی شەریعەت بکەین، ئەگەر وامان نەکرد ئەوا موسڵمان نین ئەگەرچی خۆشمان بە موسڵمان بزانین.

---

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الصلح > باب إذا اصطلحوا على صلح جور > فەرموودەی ژمارە: ٢٦٩٧.

فەرموون با بەیەکەوە سەیری چەند بەڵگەیەک بکەین و بزانین ئایا ئەگەر کەسێک نیەتی دڵی باش بوو بەبێ ئەوەی کردەوەکەی لەسەر سوننەت بێت ئەوا سوودی بۆ هەیە یان نا.

ألله –عز وجل– فەرموویەتی: {**قل هل ننبئكم بالأخسرين أعمالا * الذين ضل سعيهم في الحياة الدنيا وهم يحسبون أنهم يحسنون صنعا**}(1). واتە: {–ئەی محمد– پێیان بڵێ: ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەوەی کێن ئەوانەی دۆڕاوترینن لەڕووی کارکردن؟! * ئەو کەسانەن کەوا هەموو کردەوە و کۆششەکانی دونیایان پووچەڵ بووەتەوە لەکاتێکدا وادەزانن خەریکی ئەنجامدانی کارێکی چاکن}.

هەروەها ألله –سبحانه وتعالى– باسی کەسانێکمان بۆ دەکات کە شەیتانەکان گومڕایان کردوونە و خۆیشیان وادەزانن لەسەر حەقن، هەروەک دەفەرمووێت: {**وإنهم ليصدونهم عن السبيل ويحسبون أنهم مهتدون**}(2). واتە: {ئەوان (واتە شەیتانەکان) ڕێگریی لەو کەسانە دەکەن لەبەردەم ڕێگا ڕاستەکە، ئیتر ئەوانیش (واتە مرۆڤەکان) وادەزانن هیدایەت دراون}.

هەروەها فەرموویەتی: {**فريقا هدى وفريقا حق عليهم الضلالة إنهم اتخذوا الشياطين أولياء من دون الله ويحسبون أنهم مهتدون**}(3). واتە: {ألله دەستەیەکیانی هیدایەتدا و دەستەیەکیش گومڕایی لەسەریاندا جێگیر بوو، ئەوان شەیتانەکانیان کردبووە پاڵپشتی خۆیان لەبری ألله، لە هەمان کاتیش وایان دەزانی هیدایەت دراون}.

کە سەیری ئەم ئایاتانە دەکەین، دەبینین ألله باسی کەسانێکمان بۆ دەکات کەوا کەوتوونەتە ناو کوفرەوە و لە ناو دڵیشیاندا خۆیان بە ڕاست و چاکەکار زانیوە، ئیتر ألله بەدرۆیان دەخاتەوە لەبەر ئەوەی لە کردەوەکانیاندا پابەندی شەریعەتی ألله نین

---

**(١)** سورەتی الكهف، ئایەی ١٠٣ و ١٠٤.

**(٢)** سورەتی الزخرف، ئایەی ٣٧.

**(٣)** سورەتی الأعراف، ئایەی ٣٠.

و سەرپێچی دەکەن. لێرەدا لە حیزبە بەناو ئیسلامییەکان دەپرسین: ئایا ئەو کەسانە نیەتی دڵیان هیچ سوودێکی بۆیان هەبوو؟ ئایا نیەتی دڵیان دەربازی کردن؟ نەخێر بەڵکو هەر بە "گومڕا" وەسفکران و حیساب بۆ نیەتی دڵیان نەکرا.

ئەوەتا زۆرینەی ئەو جەماعەتانەی لە کۆمەڵەی موسڵمانان جیابوونەوە نیەتی دڵیان پاک و باش بوو، وەکو جەهمییەکان و قەدەرییەکان و ئەوانی تریش، هەموویان لە ڕووی نیەتەوە کێشەیان نەبووە و وایان زانیوە لەسەر حەقن، بەڵام تەکفیرکراون و تەنانەت کوشتاریشیان کراوە لەلایەن ئەمیرەکانی موسڵمانان؛ چونکە کردەوە و گوفتارەکانیان کوفر بووە و نەیانویستووە حەقەکە قەبوڵ بکەن.

بۆیەش حیزبە بەناو ئیسلامییەکان هەرچەند نیەتیان پاک بێت، تەنانەت ئەگەر نیەتیشیان گەڕاندنەوەی حوکمی ألله بێت لەڕێگای دیمۆکراسیەتەوە ئەوا ئەمە نابێتە بەربەست لەپێش تەکفیر کردنیان؛ چونکە مەرجی دووەمیان تێدا نییە و پشتیان بە سوننەتی پێغەمبەران –علیهم السلام– نەبەستووە بۆ ئەوەی لەسەر مەنهەجی ئەوان بانگەواز بکەن. پێغەمبەران گشتیان بانگەوازیان بۆ ئەوە بووە کە خەڵک لە هەموو جۆرێکی تاغوت بەدوور بکەونەوە، کەچی ئیخوانییەکان خۆیان مومارەسەی تاغوت دەکەن.

## بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.

## گومانی هەشتەم: پەیماننامەی حودەیبییە (صلح الحدیبیة).

ئیخوانییەکان دەڵێن: پێغەمبەر –علیه السلام– لەگەڵ کافرەکان دانیشت و پەیماننامەی بەست و لەسەر کۆمەڵێک شتی شەرعیی تەنازولی کرد، بۆ ئێمەش ئاساییە کەوا لەگەڵ دیمۆکراسیخوازە کافرەکان دابنیشین و تەنازول لە کۆمەڵێک بابەتی شەرعیی بکەین.

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێم: سبحان الله، ئیخوانییەکان قسەی وا دەکەن ئەسڵەن هیچ پەیوەندییەکی بە مومارەسە کردنی شەریعەتی دیمۆکراسیەت نییە، زۆرینەی گومانەکانیان ئەسڵەن دژی ئەوەیە بچنە ناو پەرلەمان، کەچی –بە حیسابی خۆیان– کردوویانەتە بەڵگە بۆ ئەوەی بچنە ناو پەرلەمان!

دەمەوێ وەڵامی ئەم گومانەیان لە ٢ ڕووەوە بدەمەوە:

**ڕووی یەکەم:** لەناو مەرجەکانی پەیماننامەکەدا هیچ خاڵێکی تێدا نەبوو کە دینی موشریکەکانی قورەیش بووبێ و دژی شەریعەتی أللە بێت کەچی پێغەمبەریش پێی ڕازی بووبێ! شتی وای تێدا نەبوو بەهیچ جۆرێک.

سەبارەت بەوەیشی کە ڕێگایان نەدا لە پەیماننامەکە بنووسرێت "بسم الله الرحمن الرحیم"، ئەمە هەر نابێتە بەڵگە تاکو بڵێین پێغەمبەر تەنازولی کردووە لە ئیسلام؛ چونکە ڕاستە ئەوان ڕێگایان نەدا بەوەی بنووسرێت "بسم الله الرحمن الرحیم"، بەڵام خۆ پێغەمبەر داوای کرد بنووسرێت "بسمك اللهم"، بۆیەش ئەمەیان قەبوڵ کرد و نووسیان. جا لێرەدا دەپرسین: ئایا دەستەواژەی "بسمك اللهم" دژی شەریعەتی أللە یە؟! ئایا دژی کامە ئایەت و فەرموودەیە؟! هیچیان.

تەنانەت کاتێک عمر بن الخطاب –رضي الله عنه– گلەیی کرد و وایزانی ئەم پەیماننامەیە تەنازول کردنی تێدایە، ئیتر پێغەمبەریش –صلی الله علیه وسلم– وەڵامی دایەوە و پێی فەرموو: «**یا إبن الخطاب، إني رسول الله ولن یضیعني الله أبدا**»[1]. واتە: «**ئەی کوڕی الخطاب، من نێردراوی ألله م، هەرگیز ألله پشتم لێ ناکات**».

مەبەستی نێردراوی ألله –علیه الصلاة والسلام– ئەوەیە کە هەرگیز ألله جێی ناهێڵێت تاکو لەخۆیەوە کردەوەکان بکات و گومڕا ببێت، بۆیەش هەرگیز کردەوەیەک ناکات کەوا پێچەوانەی شەریعەتی ألله بێت، خۆ ئەگەر هەر کردەوەیەکی کردبێت کە ألله –تبارك وتعالی– پێی هەڵە بووبێ ئەوا ئایەتی لەسەر دابەزاندووە و هەڵەکەی بۆ ڕاست کردووەتەوە، هەروەک چۆن لەبارەی پیاوە کوێرەکەوە ألله گلەیی لە پێغەمبەر کرد. یاخود ئەو کاتەی موشریکەکان داوایان لە پێغەمبەر کرد کە تا ماوەیەک پەیکەرەکانی ئەوان بپەرستێت، ئەوا ألله سوڕەتی "الکافرون" ی دابەزاند و تیایدا فەرمانی بە پێغەمبەر کرد تا پێیان بڵێت هەرگیز کاری وا ناکات.

جا ئەگەر پەیماننامەی حودەیبییە (صلح الحدیبیة) هەڵە و تەنازولێکی تێدا بووایە ئەوا ألله –عز وجل– پێغەمبەرەکەی خۆی ئاگادار دەکردەوە. ئەمەش درۆ و کوفر و سنووربەزاندنی ئیخوانییەکانمان بۆ ئاشکرا دەکات کەوا دەڵێن پێغەمبەر تەنازولی لە دینی ألله کردووە لە پەیماننامەکە! پەنا بە ألله.

جا با ئێمە بەراوردێک بکەین لەگەڵ حاڵی حیزبە ئیخوانییە فێڵبازەکان، ئایا ئیخوانییەکان ڕێگریان کردووە لەوەی لە پەڕلەماندا هیچ یاسایەکی کوفر دەرنەکرێ؟! ناواللە، بەڵکو هەر یاسایەک لەو ٢٧ ساڵەی ڕابردوودا لە پەڕلەمان دەرهێنرابێت ئەوا ئیللا لە سەردێڕەکەیدا نووسراوە "بەناوی گەل"!، کەچی ئیخوانییەکان ٢٧ ساڵە لەنێو پەڕلەمانن و بوونیان هەیە لە گۆڕەپانی سیاسەتی تاغوتپەرستن. کەچی خۆیان هێناوەتە ئاستی پێغەمبەر و وای دەردەخەن پێغەمبەر وەکو ئەوان تەنازولی کردووە لە دین!

---

(١) کتێبی صحیح البخاري > کتاب الجزیة > فەرموودەی ژمارە: ٣١٨٢.

**ڕووی دووەم:** لەکاتی بەستنی پەیماننامەی حودەیبییە (صلح الحديبية) هێشتا شەریعەتی ألله بەتەواویی کامل نەببوو و دانەبەزیبوو، بۆیەش ئەگەر هەر ئایەتێک دابەزیایە کە پێچەوانەی پەیماننامەکە بووایە ئەوا نێردراوی ألله –علیه الصلاة والسلام– پابەند و گوێڕایەڵی فەرمانی ألله دەبوو و هیچ حیسابێکی بۆ پەیماننامەکە نەدەکرد.

بەڵگەشمان ئەوەیە کە البراء بن عازب –رضي الله عنهما– باسی یەکێک لە خاڵەکانی پەیماننامەکەمان بۆ دەکات کە تیایدا نووسرابوو: «**أن من أتاه من المشركين رده إليهم، ومن أتاهم من المسلمين لم يردوه**»[١]. واتە: «**هەر کەسێک لە موشریکەکان ببێتە موسڵمان و بچێتە لای محمد ئەوا دەبێ بیگەڕێننەوە بۆ لای قوڕەیش، ئەگەریش هەر کەسێک لە موسڵمانان ببێتەوە موشریک و بچێتەوە لای قوڕەیش ئەوا نایگەڕێننەوە بۆ لای محمد**».

کەواتە مەرجەکەیان ئەوەبوو کە هەر کەسێک ببێتە موسڵمان ئینجا هیجرەت بکات بەرەو مەدینە، ئەوا دەبێ پێغەمبەر –علیه السلام– بینێرێتەوە لای کافرانی قوڕەیش، بەڵام ئەگەر یەکێک لە موسڵمانان هەڵگەڕایەوە (واتە موڕتەد بوویەوە) ئینجا بگەڕێتەوە بۆ مەککە، ئەوا کافرانی قوڕەیش ناینێرنەوە.

پێغەمبەر –صلى الله عليه وسلم– بەم مەرجە ڕازی بوو، بەڵام لەدوای ماوەیەک ئافرەتێک بوو بە موسڵمان و لە شاری مەککەوە خۆی گەیاندە شاری مەدینە، ئیتر مێردەکەی هات و داوای لە پێغەمبەر کرد تاکو ئافرەتەکەی بداتەوە لەسەر بنەمای پەیماننامەکە، لەو کاتەدا ألله ئایەتی دابەزاند و گووتی: {**يأيها الذين ءامنوا إذا جآئكم المؤمنات مهاجرات فامتحنوهن ألله أعلم بإيمانهن فإن علمتموهن مؤمنات فلا ترجعوهن إلى الكفار ...**}[٢]. واتە: {ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، ئەگەر

---

(١) کتێبی صحيح البخاري > كتاب الصلح > باب الصلح مع المشركين > فەرمموودەی ژمارە: ٢٧٠٠.
(٢) سوڕەتی الممتحنة، ئایەی ١٠.

ئافرەتانێکی ئیماندار هیجرەتیان بۆ لاتان کرد ئەوا تاقیان بکەنەوە، ألله زاناترە بە ئیمانەکەیان، ئەگەر زانیتان کەوا ئیماندارن ئەوا مەیانگەڕێننەوە لای کافرەکان ...}.

بۆیەش ئیتر پێغەمبەر –صلی الله علیه وسلم– ئافرەتەکەی نەگەڕاندەوە بۆ لایان، بەڵکو پابەندی فەرمانی ألله بوو، ئەگەرچی پێشتر پەیمانی پێدابوون بەڵام کاتێک حوکمێکی نوێ دابەزی، ئیتر نێردراوی ألله پشتی لەو خاڵەی پەیماننامەکە کرد لەپێناوی ألله.

جا کاتێک ئەم ڕووداوە بەراورد دەکەین بە حاڵی حیزبە بەناو ئیسلامییەکان، ئیتر بۆمان دەردەکەوێت ئەم فێڵبازانە قەرزاریش دەبنەوە؛ چونکە پێغەمبەر پشتی لە هەر خاڵێکی پەیماننامەکە دەکرد ئەگەر ئایەتێک دابەزیایە و پێچەوانەی خاڵێکی پەیمانەکە بووایە، کەچی ئێستا لەدوای تێپەڕینی زیادتر لە ١٤٠٠ ساڵ، هەروەها کامل بوونی شەریعەتی ألله، هەروەها لەدوای دابەزینی چەندین ئایەت کە دەیسەلمێنن شەریعەتە دەستکردەکان تاغوتن، کەچی ئیخوانییەکان حیساب بۆ ئەم هەموو ئایەتە موحکەمە ناکەن و دڵیان بۆ شەریعەتێکی تاغوت لێدەدات کە لە دەیان و سەدان خاڵدا دژی شەریعەتی ألله یە.

ئیخوانییەکان ئەگەر موسڵمان بوونایە ئەوا لەوکاتەی کە زانیان دیموکراسیەت بە مانای "حوکمی گەل" دێت، ئەوا یەکسەر بەڕائەتیان لەم شەریعەتە تاغوتە دەکرد، هەروەها ئەگەر موسڵمان بوونایە ئەوا لەوکاتەی زانیان دیموکراسیەت واتە ئازادیی بیروباوەڕ و ڕادەربڕینی بێسنوور، ئەوا یەکسەر بەڕائەتیان لەم شەریعەتە پیسە دەکرد، نەک دڵیان بۆی لێبدات و مومارەسەی بکەن و هەوڵی تێکەڵکردنی بدەن لەگەڵ ئیسلام و هەروەها کوشتار بکەن لەپێناوی دیموکراسیەت –هەروەک یوسف قەرزاویی وای گووت.

**بابەتی سێیەم: وەڵامدانەوەی گومانەکان.**

**گومانی نۆیەم: ڕێککەوتننامەی الفضول (حلف الفضول).**

ئیخوانییەکان دەڵێن: کاکە ئێمە دەمانەوێت زوڵم و ستەمکاریی هەڵگرین، ئەوەتا پێغەمبەر پێش ئیسلام بەشداربوو لە ڕێککەوتننامەیەک بۆ سەرخستنی ستەملێکراو، لەدوای هاتنی وەحیش هەر شانازیی بەم جۆرە ڕێککەوتننامەیە کرد و گووتی لەئیسلامیشدا دووبارەی دەکەمەوە. جا ئێمەش بەشدار دەبین لە پەڕلەمان بۆ ئەوەی ستەمکاریی هەڵگرین.

لە وەڵامی ئەمەشدا دەڵێم: بەڵێ لەدوای ئەوەی ستەم لە بازرگانێک کرا لە شاری مەککە، ئیتر قورەیش کۆبوونەوە و ڕێککەوتنێکیان مۆر کرد بۆ ئەوەی هەمیشە ڕێگریی بکەن لە ستەمکاریی و ماف خواردن، پێغەمبەریش –علیه السلام– لەکاتی ڕێککەوتنەکەدا ئامادەبوو، لەدوای هاتنی وەحیش پێغەمبەرمان –صلى الله عليه وسلم– هەر ستایشی ئەم ڕێککەوتننامەیەی کرد. بەڵام با بزانین بۆچی ئەم ڕووداوە نابێتە بەڵگە بۆ موماڕەسەکردنی دیمۆکڕاسیەت و چوونە نێو پەڕلەمان، وەڵام لە چەند ڕوویێک:

**ڕووی یەکەم:** بەڵێ لەدوای وەحیش پێغەمبەرمان هەر ئەم گوفتارەی فەرموو، بەڵام هێشتا شەریعەتی ألله بەتەواویی دانەبەزیبوو، بەڵام دواتر هێواش هێواش ئایاتەکان دابەزین و ألله –عز وجل– باسی جۆرەها زوڵمی کرد و سزای تایبەتیشی بۆ هەر یەکێکیان دیاریکرد، وەکو سزای دزی و داوێنپیسی و بوهتان و مەیخۆریی و کوشتنی ناحەق و جۆرەها زوڵمی تریش، بۆیە پێغەمبەریش –صلى الله عليه وسلم– فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ دەکرد و لەسەر بنەمای فەرمانی ألله سزای هەر کەسێکی دەدا کەوا یەکێک لەمجۆرە زوڵمانەی ئەنجام بدایە. هەر بۆیەش دوای کامل بوونی شەریعەتی ئیسلامەوە ئیتر نە پێغەمبەر و نە هاوەڵەکانی و نە چوار خەلیفەکەش

–رضي الله عنهم– هەرگیز لەبارەی هەڵگرتنی زوڵمەوە ڕێککەوتنیان نەکردووە لەگەڵ موشریک و کافران؛ ئەمەش چونکە ئیتر شەریعەتی ألله کامل بوو و سزای جۆرەها زوڵمی دیاریکردووە.

**ڕووی دووەم:** بەڵگەیەکی تریش کە دەیسەلمێنێت موسڵمانان لەدوای کامل بوونی دینەکەیانەوە ناتوانن ڕێککەوتن بکەن لەگەڵ کافران لەبارەی هەڵگرتنی زوڵم، ئەوەیە کە ئەو شتانەی لە شەریعەتی ألله وەکو زوڵم و ستەم دانراون ئەوا ئەسڵەن لەلای ئەهلی کوفرەوە پێیان ناگووترێت زوڵم. بۆ نموونە لە شەریعەتی ألله گەورەترین زوڵم بریتییە لە شیرک، هەروەک ألله لە زاری لوقمانەوە دەفەرموویێت: {**... یابني لا تشرك بالله إن الشرك لظلم عظیم**}[1]. واتە: {... کوڕەکەم هاوەڵ بۆ ألله دامەنێ، بەڕاستی شیرک و هاوەڵبڕیاردان بریتییە لە زوڵمە گەورەکە}.

لە ئیسلامدا هاوەڵبڕیاردان بۆ ألله بریتییە لە گەورەترین زوڵم، پێویستیشە لاببرێت و لەناوببرێت، کەچی لەلای دێمۆکڕاسیخوازە تاغوتپەرستەکاندا ئەمە پێی دەگووترێ ئازادیی بیروباوەڕ، کە تێیدا مرۆڤ ئازادە لەوەی موماڕەسەی هەر دینێک بکات یانیش هەر نەیکات. ئەمەش لە لاپەڕی ٤١ تا ٤٩ باس کرا.

ئەسڵەن بەپێچەوانەوە، زۆر بابەت هەیە کە ألله ئایەتی لەسەر دابەزاندووە کەچی دێمۆکڕاسیخوازەکان بە نادادپەروەری دەزانن! بۆ نموونە بەلای ئەوانەوە مەیخۆریی و داوێنپیسی بابەتێکی هێندە گەورە نییە بەڵکو پەیوەستە بە ڕەزامەندیی بکەرەکانی! بۆیەش بە زوڵمی دەزانن مرۆڤێک قامچی لێبدرێت ئەگەر داوێنپیسی بکات یاخود مەی بخواتەوە! ئیتر دەبینین حوکمە شەڕعییەکان ڕەت دەکەنەوە لەبارەی ئەم کارە قێزەونانە.

ئەی ئیخوانییەکان، پێمان ناڵێن چۆن لەڕووی شەڕعەوە دەتوانرێت ڕێککەوتن لەگەڵ دێمۆکڕاسیخوازەکان بکرێت لەکاتێکدا ئەوەی کە بەلای ئێوەوە زوڵمە ئەوا

---

(١) سورەتی لقمان، ئایەی ١٣.

ئەسڵەن ئەوان بە زوڵمی نازانن، هەروەها ئەوەی کە لە شەریعەتی ألله وەکو زوڵم وەسف کراوە ئەوا ئەوان بە ئازادیی و مافی مرۆڤی دەزانن! ئەگەر ئەمە عەقڵیەتی کەسانێکی تاغوتپەرست بێت ئیتر چۆن لەگەڵیان ڕێکدەکەون بۆ لەناوبردنی زوڵم؟!

**ڕووی سێیەم:** فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە (واتە الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ئەهلی ئیسلام و تەوحید، هەرگیز ألله -تبارك وتعالى- باسی موشریکەکان ناکات بەوەی ئەم ئەرکە پیرۆزە لە ئەستۆ بگرن، بەڵکو ئەم ئەرکە پیرۆزەی داوەتە پاڵ ئەهلی ئیسلام، هەروەک فەرموویەتی: {**كنتم خير أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف وتنهون عن المنكر وتؤمنون بالله ...**}[1]. واتە: {ئێوە باشترین ئوممەت بوون کە بۆ ئەم خەڵکە هاتن، بەوەی کە فەرمان بە چاکە دەکەن و قەدەغەی خراپە دەکەن، هەروەها باوەڕتان بە ألله هەیە ...}.

مادام ئەم ئەرکە پیرۆزە تایبەت بێت بە ئەهلی تەوحید و ئیسلام، ئیتر چۆن کەسێک موسڵمانە لەکاتێکدا کافرێکی موشریکی تاغوتپەرست بهێنێت و ڕێککەوتنی لەگەڵدا بکات بۆ ئەوەی بەیەکەوە زوڵم لەناو ببەن؟!

گریمان ڕێککەوتنیان کرد و دەرکەوت کەسێک دزی کردووە، ئەوەی کە خۆی پێ موسڵمانە دەڵێت: پێویستە دەستی دزەکە ببڕدرێت. لەلایەکی تریشەوە کافرەکەی کەوا ڕێککەوتنی لەگەڵ کراوە دەڵێت: نەخێر دەستبڕین کارێکی نامرۆڤانەیە بەڵکو دەبێ بیخەینە زیندان!

ئێستا بەگوێی کێ بکەین؟! ئەگەر دەڵێین: بەگوێی ألله دەکەین و حیساب بۆ گوفتاری کافرەکە ناکەین. ئەوا دەپرسم: کەواتە چۆن دەڵێین ئاساییە ڕێککەوتن لەگەڵ کافران بکرێت بۆ لەناوبردنی زوڵم؟! دەبێ لەم گوفتارەشتان پەشیمان ببنەوە چونکە هەرگیز کافران دان بە حوکمە شەرعییەکان نانێن، بۆیەش ئەسڵەن ئەگەر خۆتان بە موسڵمان دەزانن ئەوا نابێ موناقەشە لەسەر جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکان بکەن.

---

(١) سورەتی آل عمران، ئایەی ١١٠.

**ڕووی چوارەم:** ئیخوانییەکان دەڵێن ئاساییە ڕێککەوتن لەگەڵ ئەهلی کوفر بکرێت بۆ ڕێگریکردن لە زوڵم، ئەمەش لەکاتێکدا کە هەر خودی ئەهلی کوفر بریتین لە زاڵمترین مرۆڤەکانی سەر زەوی؛ چونکە موشریکن و هەروەها دان بە شەریعەتی ألله نانێن ئامادەنین تەسلیمی ألله ببن لەکاتێکدا هەر ئەو دروستکاریانە. هەروەها هەوڵی بڵاوکردنەوەی کوفر و شیرک و تاوانەکان دەدەن بەناوی ئازادیی بیروباوەڕ و تاکەکەسی و ڕادەبڕین!

کەواتە هەر خودی ئەو کافرانە پێویستە لەناوببرێن چونکە ستەمکار و دەستدرێژن، ئیتر چۆن تۆیەکی ئیخوانیی خۆت بە موسڵمان دەزانی و لە هەمان کاتدا لەگەڵ کافرێکی دەمدرێژی دەستدرێژکار دادەنیشیت و گوایە دەتانەوێت زوڵم لەناوببەن؟! هەرگیز ڕێککەوتن لەگەڵ ستەمکار ناکرێت بۆ لەناوبردنی ستەم.

# پەیامی تەوحیدم بۆتان ئامادەکردووە ئەی قەومەکەم

**پێشەکیی: پەیامی تەوحید.**

ئەی قەومەکەم، هاوزمانەکانم، پەیامێکم پێیە، ئەویش پەیامی تەوحیدە، هەموو شتێکم لەبارەیەوە باس کردووە بەشێوازێکی پوخت و بە بەڵگەوە، ئەمەی باسم کردووە دەتوانم بڵێم ناوەڕۆکی تەوحیدە و هەر چ کەسێک بیزانێت و دانی پێدابنێ ئەوا ئەهلی تەوحیدە و پایەدارە إن شاء الله سبحانه.

ئەم بەشە لە ١٠ بابەتی پوخت پێکهاتووە کە هەموویان گرێدراوی یەکترن، فەرموو بەناوی ألله بیخوێنەوە و ئیمانی پێ بهێنە:

**بابەتی یەکەم: مانای "توحید" لەڕووی زمانەوانیی و هەروەها لەڕووی شەڕعیی.**

**وشەی "التوحید" لەڕووی زمانەوانییەوە واتە:** بە تەنها دانان و جیاکردنەوەی شتێک لەناو کۆمەڵێک شت. بەعەڕەبیی واتە: جعل المتعدد واحدا.

بۆ نموونە ئەگەر بڵێی "کەس لەماڵ نییە تەنها أحمد نەبێت"، لە نموونەکەدا ڕستەکە بەسەر دوو بڕگە دابەش بووە:

بڕگەی یەکەم: بریتییە لە پارچەی "کەس لە ماڵ نییە"، لەم پارچەیەدا کەسمان لە ماڵەکە نەهێشتەوە، ئەمەش پێی دەگووترێ "نفي".

بڕگەی دووەم: بریتییە لە پارچەی "تەنها أحمد نەبێت"، لەم پارچەیەدا تەنها یەک کەسمان لەناو ماڵەکە جێگیر کرد ئەویش بریتییە لە أحمد، ئەمەش پێی دەگووترێ "إثبات".

لەمەوە دەگەینە ئەنجامێک: ئەویش ئەوەیە کە تەوحید دوو مەرجی هەیە: "نفي" و "إثبات"، ئەگەر ئەم دوو مەرجە پێکەوە هاتنە دی ئەوا تەوحیدەکە تەواوە. لە بابەتی سێیەمدا بەدرێژیی ئەمە لەڕووی شەرعەوە شیدەکەمەوە.

**وشەی "التوحيد" لەڕووی شەرعییەوە واتە:** تەنهاکردن و تەوحید کردنی ألله لە سێ ڕووەوە: لەڕووی پەروەردەکارێتی (الربوبية)، هەروەها لەڕووی پەرستراوێتی (الألوهية)، هەروەها لەڕووی ناو و سیفەتەکانیەوە (الأسماء والصفات). لە بابەتی هەشتەم و نۆیەم و یازدەهەمدا بەپوختیی هەر سێکیان باس دەکرێن.

ئەوەی لەم بابەتەدا مەبەستم بوو تەنها ئەوەیە مانای تەوحید بزانیت لەڕووی زمانەوانیی و لەڕووی شەرعیی.

## بابەتی دووەم: بۆچی تەوحید بابەتێکی هێندە گرینگە بەلامانەوە؟

ئەهلی تەوحید جیاوازن لە تێکڕای ئەو جەماعەتانەی کە بانگەوازی ئیسلام و موسڵمانێتی خۆیان دەکەن؛ چونکە هیچیان حەقیقەتی تەوحید بە خەڵک ناگەیەنن هەروەها تەوحید لە گوفتار و فەتوا و هەڵوێستەکانیان بەدی ناکرێت. بۆیەش هیچیان هێندەی ئێمە نەیانتوانیوە ئەم پەیامە بە سەربەرزییەوە بگەیەنن؛ چونکە ئەم پەیامە زۆرێکیان بەدرۆ دەخاتەوە.

هەر بۆیەش هەمووکات ئامانجی لەپێشینەمان بریتی بووە لە گەیاندنی تەوحید بەم قەومە، نەک هەڵخەڵەتاندنیان بە کۆمەڵێک شتی لابەلا.

با بزانین گرینگی تەوحید لە چییە و بۆچی هێندە بەلامانەوە جێگەی بایەخە، بەپوختی لەبەر چەند هۆکارێک:

١- تەوحید بانگەوازی تێکڕای پێغەمبەران بووە –علیهم الصلاة والسلام–، واتە ئەگەر سەد هەزار پێغەمبەر هەبووبن ئەوا هەر هەموویان ئەم تەوحیدەیان گەیاندووە، هەروەک ألله –عز وجل– فەرموویەتی: **{ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ...}**[1]. واتە: {بەڕاستیی ئێمە لەناو هەموو ئوممەتێک نێردراوێکمان ناردووە کە –پێیان دەڵێت–: ألله بپەرستن و دوورکەونەوە لە تاغوت ...}.

٢- تەوحید هۆکاری سڕانەوەی تێکڕای تاوانە گەورە و بچووکەکانە، هەر کەسێک بزانێت تەوحید چییە و پاشانیش باوەڕی پێ بهێنێ ئەوا بەسیەتی بۆ ئەوەی ألله لە کەمتەرخەمیی و تاوانەکانی خۆشبێت ئەگەر تاوانەکانی بە حەلال نەزانیبێ و نەگەیشتبێتە ئاستی کوفر و شیرک، هەروەک لە فەرموودەیەکی قودسیدا ألله –تبارك وتعالى– بە مرۆڤایەتیی ڕادەگەیەنێ: «**... ومن لقيني بقراب الأرض خطيئة لا يشرك بي شيئا، لقيته بمثلها مغفرة**»[2]. واتە: «**... هەر کەسێک بەقەد پڕاوپڕی زەوی تاوانی کردبێت و پێم بگاتەوە (واتە لە قیامەت) بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی کردبێتە هاوبەشی من، ئەوا منیش هێندەی تاوانەکانی لێی دەبوورم**».

٣- زانین و باوەڕهێنان بە تەوحید تاکە هۆکارە بۆ ئەوەی موسڵمانەکە عیبادەتەکانی لێ قەبوڵ بکرێت لەلای ألله، هەر کەسێک تەوحیدی تێدا نەبێت و هەوڵ نەدات بۆ زانینی (لەکاتێکدا دەستی بگاتە زانستی شەرعیی و قورئان) ئەوا ئەو کەسە موشریکە، بێگومان شیرکیش هەر ئەوە نییە کە سوجدە بۆ مرۆڤێک یان پەیکەرێک ببرێت، بەڵکو شیرک جۆری زۆرە و زانایان باسیان کردووە، بۆیەش هیچ کەسێک لە شیرکەکان پارێزراو نابێت تاکو بەتەواویی نەزانێت تەوحید چییە، ئەگینا

---

(١) سوڕەتی النحل، ئایەی ٣٦.

(٢) کتێبی صحيح مسلم > كتاب الذكر والدعاء والتوبة والإستغفار > باب فضل الذكر والدعاء والتقرب إلى الله –تعالى– > فەرموودەی ژمارە: ٢٦٨٧.

هەمیشه لەسەر لێواری ئەوەیە کە بکەوێتە ناو جۆرێک لە جۆرەکانی شیرک، خۆ ئەگەر تێیکەوت –پەنا بە ألله– ئەوا هیچ پەرستن و هەوڵ و ماندووبوونێکی لێ قەبوڵ ناکرێت، هەروەک ألله فەرموویەتی: {**... ولو أشركوا لحبط عنهم ما كانوا يعملون**}[1]. واتە: {... خۆ ئەگەر هاوەڵیان بڕیاردایە بۆ ألله ئەوا سەرجەم کردەوەکانیان لێ هەڵدەوەشایەوە}.

٤- هەر هەموو ئایاتەکانی قورئان پەیامی تەوحیدیان هەڵگرتووە بەبێ جیاوازیی! هەروەک شێخ إبن القیم –رحمه الله– لەم بارەیەوە دەڵێت: «**إن كل آية في القرآن فهي متضمنة للتوحيد، شاهدة به، داعية إليه، فإن القرآن: إما خبر عن الله، وأسمائه وصفاته وأفعاله، فهو التوحيد العلمي الخبري، وإما دعوة إلى عبادته وحده لا شريك له، وخلع كل ما يعبد من دونه، فهو التوحيد الإرادي الطلبي، وإما أمر ونهي، وإلزام بطاعته في نهيه وأمره، فهي حقوق التوحيد ومكملاته، وإما خبر عن كرامة الله لأهل توحيده وطاعته، وما فعل بهم في الدنيا، وما يكرمهم به في الآخرة، فهو جزاء توحيده وإما خبر عن أهل الشرك، وما فعل بهم في الدنيا من النكال، وما يحل بهم في العقبى من العذاب، فهو خبر عمن خرج عن حكم التوحيد.**»[2].

واتە: «**بەڕاستیی هەموو ئایەتێک لە قورئاندا لەژێر سێبەری تەوحیدە و شایەتی لەسەر دەدات و بانگەوازی بۆ دەکات، بەگشتیی قورئان یان ئەوەتا هەواڵێکمان لەبارەی ألله و ناو و سیفەتەکان و کردەوەکانی پێدەگەیەنێت کە ئەمەش تەوحیدێکی عیلمی و ئەخبارییە. یانیش بانگەوازکردنە بۆ پەرستنی ئەو بەبێ هیچ هاوبەشێک و هەروەها دابڕینیەتی لەهەموو ئەوانەی دەپەرسترێن لەبری ئەو، ئەمەش تەوحیدی ئیرادی و داواکارییە. یانیش ئەوەیە کە فەرمان و قەدەغەکردنە، هەروەها پابەند بوونە بە گوێڕایەڵ بوونی ألله لە فەرمانەکانی و قەدەغە کردنەکانی، ئەمەش حەق و تەواوکەرەکانی**

---

(١) سوورەتی الأنعام، ئایەی ٨٨.

(٢) کتێبی مدارج السالكين بين منازل إياك نعبد وإياك نستعين > فصل التوحيد > فصل أنواع التوحيد الذي دعت إليه الرسل.

**تەوحیدن. یانیش ئەوەیە کە ألله هەواڵمان پێدەدات لەبارەی پلەوپایەی ئەهلی تەوحید و گوێڕایەڵەکانی و پاداشتەکانی بۆیان، هەروەها چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیان لە دونیا، هەروەها پلەوپایەیان لە دوارۆژ، کە ئەمەش بریتییە لە پاداشتی تەوحید. یانیش ئەوەیە کە باسی ئەهلی شیرک دەکات کە چۆن ناڕەحەتییان دەهێنێتە سەر ڕێگا لە دونیا، هەروەها چ سزایەکیان بەسەردێت لە قیامەت، ئەمەش هەواڵە لەبارەی ئەو کەسانەی کە دەردەچن لە حوکمی تەوحید»**.

## بابەتی سێیەم: دوو مەرجەکەی تەوحید و بەڵگەکانیان.

لە بابەتی یەکەمدا زانیمان کەوا تەوحید لەڕووی زمانەوانییەوە دروست نابێ ئەگەر "نفي" و "إثبات" ی تێدا نەبێت بەیەکەوە، ئێستاش با بزانین لەڕووی شەرعییەوە ئاخۆ دەبێ چ شتێک "نفي" بکەین و چیش "إثبات" بکەین تاکو تەوحید لەخۆماندا بچەسپێنین، فەرموون...

ألله لە کتێبەکەیدا لەدوای ئایەتی کورسی فەرموویەتی: {**... فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى ...**}[1]. واتە: {... هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە ألله بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}.

تێبینی: زانایانی تەفسیر لە مانای "العروة الوثقى" دەڵێن واتە: لا إله إلا الله.

کەواتە لەم ئایەتەدا دوو مەرجەکەی تەوحید باسکراوە، کە ئەوانیش:

مەرجی یەکەم: کوفر کردن بە تاغوتەکان، کە ئەمەش یەکسانە بە بڕگەی "لا إله".

مەرجی دووەم: باوەڕهێنان بە ألله، کە ئەمەش یەکسانە بە بڕگەی "إلا الله".

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

کەواتە ڕستەی تەوحید (واتە لا إله إلا الله) پێویستی بەم دوو مەرجە هەیە کە باسکران، لەم ڕۆژگارەدا زۆرێک لە خەڵک دەبینین مەرجی دووەمیان تێدایە، واتە نوێژ بۆ أللە دەکەن و هەر لە أللە دەپاڕێنەوە و ڕۆژوو بۆ أللە دەگرن و زۆر شتی تریش، بەڵام هیچ ئاگاداری مەرجی یەکەم نین، بۆیەش ئەو کەسانە موسڵمان نین؛ چونکە ئەسڵەن لە بنەڕەتەوە ئاگاداری بناغەی تەوحید و مەرجەکانی نین.

لە بابەتەکانی داهاتوودا بەدرێژیی دەچینە سەر باسی ئەم دوو مەرجە، لەم بابەتەدا تەنها ئامانجم ئەوەبوو تۆی خوێنەر بزانیت تەوحید دوو مەرجی هەیە و هیچیان بەبێ ئەوەی تریان سوودی نییە بۆ کەسەکە و نایکاتە موسڵمان.

## بابەتی چوارەم: مانای "طاغوت" لەڕووی زمانەوانیی و لەڕووی شەڕعیی.

لە بابەتی پێشوودا زانیمان تەوحید دوو مەرجی هەیە، ئیتر لەم بابەتە و دوو بابەتی داهاتوو دێینە سەر شیکردنەوەی مەرجی یەکەمی تەوحید، ئەویش بریتییە لە کوفرکردن بە تاغوتەکان.

پێویستە لە سەرەتادا بزانین تاغوت مانای چییە، هەروەها تاغوت چ شتێک دەگرێتەوە و هەروەها چۆن کوفری پێدەکرێت، ئەگەر مرۆڤ ئەم زانیارییە بنچینەییە نەزانێت ئەوا چۆن دەتوانێ بڵێت کوفرم کردووە بە تاغوت؟!

**وشەی تاغوت لەڕووی زمانەوانییەوە:** لەسەر کێشی "فعلوت" ـە، ئەمەش کێشێکە کە تایبەتە بە سنووربەزاندن و زیادەڕەویی (واتە المبالغة). هەر بۆیەش وشەی تاغوت لەڕووی زمانی عەرەبییەوە بەمانای "سنووربەزاندن" دێت، هەروەک أللە –عز وجل– فەرموویەتی: {**... لما طغى الماء ...**}[1]. واتە: {... ئەو کاتەی ئاوەکە سنووری بەزاند و زۆربوو ...}.

(١) سورەتی الحاقة، ئایەی ١١.

**وشەی تاغوت لەڕووی شەرعییەوە:** ئەم وشەیە چەند پێناسەیەکی بۆ کراوە لەلایەن ئەهلی عیلم، هەر هەموویشیان لەژێر پێناسە پوختەکەی شێخ إبن القیم –رحمه الله– کۆدەبنەوە، کاتێک گووتی: «**والطاغوت كل ما تجاوز به العبد حده من معبود أو متبوع أو مطاع**»[1]. واتە: «**تاغوت هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە عەبد سنووری تێدا بەزاندووە، جا لەڕووی پەرستنەوە بێت یان لەڕووی شوێنکەوتنەوە بێت یان لەڕووی گوێڕایەڵکردنەوە بێت**».

**بابەتی پێنجەم: جۆرەکانی تاغوت کە أللە لە قورئاندا باسی کردوون.**

لەدوای ئەوەی لە بابەتی پێشوودا زانیمان مانای وشەی "طاغوت" چییە، ئێستاش با بزانین أللە –سبحانە وتعالی– لە کتێبەکەیدا چ شتێک بە تاغوت دەزانێت.

أللە –جل وعلا– لە قورئاندا باسی کۆمەڵێک شتمان بۆ دەکات و پێمان ڕادەگەیەنێ کە تاغوتن و موسڵمان دەبێ بیانناسێت و کوفریان پێ بکات، کە ئەمانەن:

١- شەیتان: شەیتان سەرۆکی هەموو تاغوتەکانە، مەبەستیش لە "شەیتان" تەنها ئیبلیس نییە، بەڵکو أللە پێمان ڕادەگەیەنێت کەوا شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە بوونیان هەیە[2]. بەڵگەش لەسەر تاغوت بوونی شەیتان ئەوەیە کە أللە –تبارك وتعالی– لەبارەیەوە دەفەرموێت: {**ألم أعهد إليكم يابني ءادم أن لا تعبدوا الشيطان إنه لكم عدو مبين**}[3]. واتە: {مەگەر پەیمانم لێتان وەرنەگرت ئەی نەوەکانی ئادەم کەوا شەیتان مەپەرستن؟! بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە}.

---

(١) کتێبی إعلام الموقعين عن رب العالمين > الأمر بالرد دليل على أن الكتاب والسنة يشتملان على حكم كل شيء > الرد إلى الله والرسول من موجبات الإيمان.

(٢) سوڕەتی الأنعام، ئایەی ١١٢.

(٣) سوڕەتی يس، ئایەی ٦٠.

٢- هەر کەسێک کە بانگەوازی زانستی غەیب بکات: بێگومان هەر کەسێک ئەگەر بڵێت من دەزانم لە داهاتوودا چی دەبێت، یاخود بە خەڵک بڵێت ئەگەر ئاوا بکەن ئاوا ئەو شتە ڕوودەدات و ئەگەریش نەیکەن ئەوا ئەو شتە ڕوودەدات، ئەمجۆرە کەسە تاغوتە و بانگەشەی غەیبی کردووە، لەکاتێکدا تەنها ألله ئاگاداری زانستی غەیبە، هەروەک فەرموویەتی: **{عالم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا}**[1]. واتە: {ألله زانای غەیبە و کەسیش ناتوانێت غەیب و زانستە شاراوەکانی ئاشکرا بکات}.

دەتوانین بڵێین "ساحیر" و "فاڵچی" بریتین لە دوو نموونە لەسەر ئەمجۆرە تاغوتە، هەروەها بورجەکان و ئەوانەیشی کە پێیان دەگووترێ "فەلەکناس"؛ چونکە هەموو ئەمانە بەوپەڕی یەقین و دڵنیاییەوە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گوایە شتانێک دەزانن کە هێشتا ڕووینەداوە.

هەر کەسێک باوەڕی وابێت کەوا ئەم تاغوتانە قسەکانیان ڕاستە ئەوا ئەویش وەک ئەوان کافرە، هەروەک نێردراوی ألله فەرموویەتی: «**من أتى كاهنا، أو عرافا، فصدقه بما يقول، فقد كفر بما أنزل على محمد**»[2]. واتە: «**هەر کەسێک بچێتە لای کاهینێک یاخود عەڕافێک، ئینجا گوفتارەکانی بە ڕاست بزانێ، ئەوا بەدڵنیاییەوە کافر بووە بەو کتێبەی کە دابەزیوەتە سەر محمد**».

مەبەست لە "کاهن": ئەو کەسەیە کە بانگەشەی غەیب بکات.

مەبەست لە "عراف": ئەو کەسانەن کە پێیان دەگووترێ فەلەکناس.

---

(١) سورەتی الجن، ئایەی ٢٦.

(٢) مسند الإمام أحمد بن حنبل > مسند أبي هريرة –رضي الله عنه– > فەرموودەی ژمارە: ٩٥٣٦. پلەی فەرموودەکە "حسن"ـە.

٣- هەر شەریعەتێک لە غەیری شەریعەتی ئیسلام: یەکێکی تر لەو جۆرانەی تاغوت کە ألله لە قورئاندا باسی کردوون، بریتییە لە "تاغوتی شەریعەت"، واتە هەر شەریعەتێک جگە لە شەریعەتی ئیسلام.

ألله لەم بارەیەوە فەرموویەتی: {**ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم ءامنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا**}(١). واتە: {–ئەی محمد– ئەوە تۆ ئەو کەسانەت نەبینیوە کە وای پیشان دەدەن گوایە باوەڕیان بەو کتێبە هەیە کەوا بۆتۆ دابەزیوە هەروەها باوەڕیان بەو کتێبانەیشی پێشی تۆ هەیە –کەچی لە هەمان کاتدا– دەیشیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای تاغوت لەکاتێکدا فەرمانیان پێکراوە تاکو کوفری پێ بکەن، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور}.

نموونەی شەریعەتە تاغوتەکان زۆرن، وەکو ڕێبازی "شیوعیەت"، هەروەها "دێمۆکڕاسیەت" هەروەها "لیبڕاڵیەت"، هەروەها "ئیشتیراکی" و زۆری تریش، هەر یەکێک لەم شەریعەتە تاغوتانە خاوەنی کۆمەڵێک بنچینە و دروشم و بنەمان کە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامن، ئەوەتا بەدرێژایی ئەم کتێبە باسی دانەیەکمان کرد ئەویش شەریعەتی دێمۆکڕاسیەتی تاغوتە، ئەوەتا تۆی خوێنەر خۆت بینیت ئەم شەریعەتە دژی چەند ئایەتی قورئانە.

هەروەها لە لاپەڕی ٧ تا ١٣ بەدرێژی ڕوونکردنەوەمدا لەسەر تاغوتی شەریعەت.

هەر کەسێک باوەڕی بە یەکێک لەم شەریعەتە تاغوت و دەستکردانە هەبێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم کەسە کوفری بە تاغوت نەکردووە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم کەسە درۆ دەکات ئەگەر بڵێت "من موسڵمانم!"، لەڕاستیدا ئەو کەسە تاغوتپەرستە و ئەهلی تاغوتە نەک ئەهلی ئیسلام و تەوحید.

---

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٦٠.

٤- هەر "دەسەڵاتدار" و "دادوەرێک" ئەگەر بە شەریعەتێکی تاغوت حوکم بکەن: ئەم دوو کەسەش دەبن بە تاغوت، بۆ نموونە دەسەڵاتدارێک بڕیاردەدات بەوەی شەریعەتێکی تاغوت بکرێت بە سیستەمی حوکمڕانیی لە خاکەکەیدا بۆ بەڕێوەبردنی خەڵک و کۆمەڵگا و خاک.

یاخود هەر دادوەر و قازییەک کەوا لە خاکێکدا کار دەکات کە ئەو خاکە بە شەریعەتێکی تاغوتی دەستکرد حوکمڕانی دەکرێت، کەچی هەر سوورە لەسەر کارەکەی، هەروەها کێشەی خەڵکیش بە یاسایە دەستکردەکانی پەڕلەمان چارەسەر بکات لەبری شەریعەتی ئیسلام.

لەو حاڵەتەدا جگە لەوەی شەریعەت و یاسایە دەستکردەکان تاغوتن، لە هەمان کاتیشدا خودی دەسەڵاتدار و دادوەر و قازییەکەش دەبن بە تاغوت.

ألله لەبارەی ئەم جۆرە کەسانەوە فەرموویەتی: {**... ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون**}[١]. واتە: {... جا هەر کەسێک حوکم نەکات بەوەی کە ألله دایبەزاندووە ئەوا ئەو کەسانە کافرن}.

هۆکاری کافربوونەکە ئەوەیە کە ئەم دەسەڵاتدار و دادوەر و قازییە حوکمیان بە شەریعەتێکی دەستکرد و تاغوت کردووە لەکاتێکدا توانای حوکمکردنیان هەبووە بە شەریعەتی ئیسلام، هەر بۆیەش ئەو کەسانە تاغوتپەرستن و تەوحیدیان تێدا نییە و کوفریان بە تاغوت نەکردووە، بۆیەش موسڵمان نین.

٥- هەر کەسێک بانگەشەی پەرستن بکات بۆخۆی: ئەمەش یەکێکە لەجۆرەکانی تاغوت کە تێیدا کەسێک بانگەشەی خەڵک بکات تاکو بیپەرستن، یانیش پەرستنی بۆ بکرێت و خۆی بێدەنگ بکات و ڕازی بێت، ئەوا ئەو کەسانە هەر تەنها کافر نین، بەڵکو تاغوتن، پۆلی تاغوتەکەشیان بەپێی پێناسەکەی شێخ إبن القيم بریتییە لە "معبود".

---

(١) سورەتی المائدة، ئایەی ٤٤.

بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله –عز وجل– کە فەرموویەتی: **{ومن يقل منهم إني إله من دونه فذلك نجزيه جهنم كذلك نجزي الظالمين}**[1]. واتە: {جا هەر کەسێک لەوان بڵێت من پەرستراوی حەقم لەبری ئەو (واتە لەبری ألله) ئەوا پاداشتی بە دۆزەخ دەدەینەوە، ئێمە ئاوا پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە}.

ئەگەریش کەسێک پەرستنی بۆ بکرێت و خۆیشی ڕازی نەبێت ئەوا نابێتە تاغوت، وەکو پێغەمبەر "عیسا" و "عوزەیر" –صلی الله علیهما وسلم–، یاخود شێخ عبدالقادر گەیلانی –رحمه الله–، ئەمانە کەسانێکی موەحید بوونە و بانگەوازیان بۆ تەوحید بووە و خەڵکیان ترساندووە لە جۆرەکانی شیرک و تاغوت، بۆیەش ئەوان تاوانیان نییە کەوا لەلایەن موشریکەکانەوە دەپەرسترێن و هاواریان بۆ دەکرێت.

ئەم پێنج خاڵەی باسم کرد بریتین لە جۆرەکانی تاغوت کەوا ألله لە قوڕئاندا باسی کردوون، هەر کەسێک یەکێک لەم خاڵانەی لەسەر جێبەجێ بێت یان بەڕاستیان بزانێت ئەوا با چاک بزانێت موسڵمان و موەحید نییە، ئەگەرچی بڵێت "من موسڵمانم" یاخود نوێژ و شەونوێژ بکات، هیچی لێ قەبوڵ ناکرێت؛ چونکە تەوحیدی تێدا نییە و تاغوتپەرستە.

## بابەتی شەشەم: چۆنیەتی کوفر کردن بە تاغوت.

لە بابەتی چوارەم و پێنجەمدا زانیت تاغوت مانای چییە، هەروەها زانیت جۆرەکانی تاغوت چین کە ألله –سبحانه وتعالی– باسی کردوون، ئێستا تۆ بەتەواویی دەزانیت تاغوت چییە. بۆیەش کاتی ئەوەیە بزانیت چۆن کوفر بە تاغوت دەکرێت.

سەرەتا با دووبارە بزانین بەڵگە چییە لەسەر واجبێتی کوفرکردن بە تاغوت، ألله فەرموویەتی: **{... فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى**

(١) سوڕەتی الأنبياء، ئایەی ٢٩.

...}[1]. واتە: {... هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە ألله بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}.

ئەم ئایەتەش بەڵگەیەکی ڕۆشنە لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە خۆیان لە تەکفیر دەدزنەوە و دەڵێن: ئێمە لەسەرمان واجب نەکراوە تەکفیری تاغوتەکان و تاغوتپەرستەکان بکەین مادام دەڵێن ئێمە موسڵمانین!

بەڵێ ڕاستە ئەوان بە دەم دەڵێن ئێمە موسڵمانین، بەڵام لە ڕووکەشدا ئێمە دەیانبینین کەوا کوفریان بە تاغوت نەکردووە و تەوحیدیان نییە، بۆیەش کافرن و موسڵمان نین ئەگەرچی نوێژ بکەن و ڕۆژووش بگرن. خۆ ئەگەر تاغوتپەرستەکان بە موسڵمان بزانین ئەوا دیارە ألله بەدرۆ دەخەینەوە!

هەر کەسێک بیەوێت ئایەتەکەی سەرەوە جێبەجێ بکات و کوفر بە تاغوت بکات ئەوا دەبێ ئەم سێ هەنگاوە لەخۆیدا جێبەجێ بکات:

**هەنگاوی یەکەم:** تەکفیر کردنی خودی تاغوتەکە: واتە واجبە خودی تاغوتەکە تەکفیر بکرێت کە ألله لە کتێبەکەیدا باسی کردووە، بەڵگەش لەسەر ئەم هەنگاوە بریتییە لە فەرمایشتی ألله: {**... فمن یكفر بالطاغوت ویؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقی ...**}[2]. واتە: {... هەر کەسێک کوفر بە تاغوت بکات و ئیمان بە ألله بهێنێت ئەوا بێگومان خۆی گرتووە بە پەتێکی پتەو ...}.

**هەنگاوی دووەم:** تەکفیر کردنی تاغوتپەرستەکان: مەبەست لە "تاغوتپەرست" ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە یەکێک لەو جۆرانەی تاغوت هەیە کە لە بابەتی پێنجەمدا بەبەڵگەوە باسمکرد.

---

(١) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

(٢) سورەتی البقرة، ئایەی ٢٥٦.

هەر کەسێک باوەڕی بە یەکێک لە جۆرەکانی تاغوت هەبێت، بۆ نموونە تاغوتی پەرستن، وەکو شەخسپەرستن و گۆڕپەرستن، ئەم کەسانە تاغوتپەرستن، یاخود کەسێک باوەڕی بە تاغوتی شەریعەت هەبێت، وەکو "پارتی" و "یەکێتی" و حیزبە عەلمانییەکان و شیوعی و لیبراڵییەکانی تریش. یان باوەڕی بە تاغوتی شوێنکەوتن هەبێت، وەکو باوەڕکردن بە ساحیر و فاڵگرەکان و مەلایە دینفرۆشەکان[١].

ئەمانە هەموویان تاغوتپەرستن و هیچ جیاوازییەک لە کافرێتییەکەیان نییە، تەنها ئەوە نەبێت کە جۆری تاغوتەکانیان جیاوازە. ئەوەتا ألله لە کتێبەکەیدا باسیانمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: **{ألم تر إلى الذين أوتوا نصيبا من كتاب الله يؤمنون بالجبت والطاغوت ويقولون للذين كفروا هؤلاء أهدى من الذين ءامنوا سبيلا}**[٢]. واتە: {–ئەی محمد–، مەگەر ئەو کەسانەت نەدیوە کە بەشێک لە کتێبی ألله پێیان گەیشتووە (واتە تەوڕات)، لە هەمان کاتیشدا باوەڕیان بە پەیکەر و تاغوت هێناوە؟! هەروەها بە کافرەکانیش دەڵێن کەوا ئەوان (واتە کافرەکان) ڕێبازەکەیان باشتر و ڕاستترە لە ڕێبازی ئیمانداران}.

ألله لەم ئایەتەدا نموونەی بە جولەکەکان هێنایەوە کە سەرەڕای ئەوەی تەوڕاتیان پێگەیشتبوو کەچی باوەڕیان بە "پەیکەر" و "تاغوت" هەبوو. بێگومان ئەو کەسانە کافرن و نەفرەتیان لێکراوە، هەروەک ألله –عز وجل– لە ئایەتی دواتردا دەفەرمووێت: **{أولئك الذين لعنهم الله ومن يلعن الله فلن تجد له نصيرا}**[٣]. واتە: {ئا ئەمانە ئەو کەسانەن کە ألله نەفرەتی لێکردوون، هەر کەسێکیش ألله نەفرەتی لێبکات ئەوا هیچ سەرخەرێکی بۆ نادۆزیتەوە}.

---

(١) بەڵێ مەلایە دینفرۆشەکانیش دەبن بە تاغوت ئەگەر حوکمە شەرعییەکان پەکخەن و حەق بکەن بە ناحەق و ناحەقیش بکەن بە حەق، هەر کەسێکیش بەشێوازێکی کوێرانە و بەبێ هیچ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەیەک شوێنیان بکەوێت ئەوا بووەتە تاغوتپەرست. هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو ساحیرەی کەوا فەرمان بە خەڵک دەکات بۆ ئەنجامدانی شتانێک و ئیتر ئەوانیش بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک فەرمانیان جێبەجێ دەکەن.

(٢) سورەتی النساء، ئایەی ٥١.

(٣) سورەتی النساء، ئایەی ٥٢.

بەناو سەلەفییەکان لەم هەنگاوەی دووەمدا تێکەوتوونە و دۆڕاون؛ چونکە بەلای ئەوانەوە ئەگەر باوەڕت بە شەریعەتی دیمۆکڕاسیەتی تاغوتیش هەبێت ئەوا هەر موسڵمانی!، ئەگەر سوجدە بۆ غەیری ألله ببەیت ئەوا تاغوتپەرست نیت و هەر موسڵمانی مادام دەڵێی "لا إله إلا الله"!. هەر بۆیەش مەدخەلیەکان مەرجی یەکەمی تەوحیدیان تێدا نییە کە بریتییە لە "کوفر بە تاغوت"، چونکە ئەوەتا ألله بەدرۆ دەخەنەوە –پەنا بە ألله–، ئەوەتا ألله لە قورئاندا پێمان دەفەرمووێت مرۆڤ نابێتە موسڵمان ئەگەر کوفر بە تاغوت نەکات، هەروەها ئەوەتا کەسانێکی بە نەفرەت کرد کە باوەڕیان بە تاغوت هەبوو. کەچی ئەم بەناو سەلەفییانە دەڵێن: نەخێر هەر موسڵمانە مادام دەڵێت لا إله إلا الله!

**هەنگاوی سێیەم:** تەکفیر کردنی تەو تاغوتپەرستانەی کە بەناوی ئیسلامەوە موماڕەسەی جۆرێک لە جۆرەکانی تاغوت دەکەن: ئەم هەنگاوەیان زۆر گرینگە و ئیمانی مرۆڤ لەم هەنگاوە دەردەکەوێت؛ چونکە زۆرێک لەوانەی کە خۆیان بە موسڵمان دەزانن دەترسن لەوەی کەسانێک تەکفیر بکەن کە خۆیان وەکو موسڵمان پیشان دەدەن! وادەزانن ئەگەر بەدەمیان بڵێن "ئێمە موسڵمانین" ئەوا کوفر و شیرکیش ئیمانیان هەڵناوەشێنێتەوە!

بۆ نموونە بەلای زۆرێک لە خەڵکەوە قورسە کەوا کەسانێکی گۆڕپەرست تەکفیر بکەن تەنها لەبەر ئەوەی دەڵێن "لا إله إلا الله"! یاخود بەلایانەوە قورسە ئەگەر عبدالرحمن کذاب تەکفیر بکەن کەوا فەرموودە سەحیحەکانی پێغەمبەر ڕەت دەکاتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی دەڵێت "لا إله إلا الله"!، یاخود بەلایانەوە قورسە ئەگەر حیزبە بەناو ئیسلامییەکان تەکفیر بکەن لەکاتێکدا باوەڕیان بە شەریعەتە دەستکرد و تاغوتەکان هەیە و هیچ بەڵگەیەکیشیان نییە و وەڵامی گومانەکانیشیان دراوەتەوە! کەچی هەر ناوێرن تەکفیریان بکەن چونکە دەڵێن "لا إله إلا الله".

ئێستا با بزانین ئایا ئەم کەسانەی لە سەرەوە باسم کردن دەتوانرێت تەکفیر بکرێن یان بەهۆی گووتنی "لا إله إلا الله" ناتوانین تەکفیریان بکەین! با بزانین...

بێگومان هەر کەسێک ئەگەر خۆی بە موسڵمان بزانێت و لە هەمان کاتیشدا مومارەسەی یەکێک لە جۆرەکانی تاغوت بکات، ئەوا ئەو کەسە تاغوتپەرستە و موسڵمان نییە و کافرە ئەگەرچی بشڵێت موسڵمانم، فەرموون ئەوەتا ألله لە کتێبەکەیدا چۆن باسی ئەمجۆرە کەسانەمان بۆ دەکات و چۆنیش بەدرۆیان دەخاتەوە، هەروەک فەرموویەتی: {**ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم ءامنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا**}[1]. واتە: {-ئەی محمد- ئەوە تۆ ئەو کەسانەت نەبینیوە کە وای پیشان دەدەن گوایە باوەڕیان بەو کتێبە هەیە کەوا بۆتۆ دابەزیوە هەروەها باوەڕیان بەو کتێبانەیشی پێشی تۆ هەیە -کەچی لە هەمان کاتدا- دەیشیانەوێت حوکم بگەڕێننەوە بۆ لای تاغوت لەکاتێکدا فەرمانیان پێکراوە تاکو کوفری پێ بکەن، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور}.

هەروەک بینیمان، ألله -عز وجل- ئیمانی ئەو کەسانەی بەدرۆ خستەوە کە خۆیان بە موسڵمان زانیوە تەنها لەبەر ئەوەی حوکمیان گەڕاندووەتەوە بۆ شەریعەتێکی تاغوت و قازییەکی تاغوت! ئەوەتا ئەگەرچی گووتیان ئێمە موسڵمانین بەڵام ألله هەر تەکفیری کردن و بەدرۆی خستنەوە.

بۆیەش ئەی خوێنەری بەڕێز، ئەوەتا بەڵگەکانیشت بینی، بزانە هەنگاوی سێیەمی کوفر بە تاغوت ئەوەیە کە ئەمجۆرە کەسانە تەکفیر بکەیت کەوا خۆیان وا دەردەخەن کە موسڵمانن کەچی باوەڕیان بە تاغوت هەیە! جا هەر کەسێکیش ئامادە نەبێ تەکفیریان بکات ئەوا ئەویش کافرە؛ چونکە ألله بەدرۆ دەخاتەوە لەکاتێکدا ألله تەکفیری کردوون.

---

(١) سورەتی النساء، ئایەی ٦٠.

**بابەتی حەوتەم: باوەڕهێنان و تەوحید کردنی أللە لەڕووی "الربوبیة".**

لە بابەتی "چوارەم و پێنجەم و شەشەم" هەڵسام بە باسکردنی مەرجی یەکەمی تەوحید ئەویش بریتی بوو لە "کوفر بە تاغوت"، ئیتر لەم بەشەوە تاکو کۆتایی باس لە مەرجی دووەمی تەوحید دەکەم ئەویش بریتییە لە "باوەڕهێنان بە أللە".

ئەمەش واتە پێویستە أللە تەوحید بکرێت لە سێ ڕووەوە:

١- توحید الربوبیة.

٢- توحید الألوهیة.

٣- توحید الأسماء والصفات.

لەم بابەتەدا هەڵوەستە لەسەر "توحید الربوبیة" دەکەم:

**توحید الربوبیة:** واتە تەوحید کردن و تەنها کردنی أللە لەڕووی کارە تایبەتییەکانی خۆی.

بۆ نموونە: دەبێ باوەڕمان وابێت تەنها أللە دروستکارە و باشترین دروستکاریشە (واتە الخلق)[١]. هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت تەنها أللە ڕۆزیمان پێدەدات و سەرچاوەی هەموو ڕۆزییەکانیش هەر لەلای أللە یە (واتە الرزق)[٢]. هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت کاروباری ئەم گەردوونە بەتەنها لەلایەن أللە بەڕێوەدەچێت و هیچ هاوبەشێکی نییە (واتە الإدارة)[٣]. هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت کەوا دانانی شەریعەت و یاساکان تەنها مافی أللە یە و نابێ هیچ مرۆڤێک خۆی بکاتە هاوبەشی أللە لەڕووی یاسادانان و داڕشتنی شەریعەت (واتە الحاکمیة)[٤]. هەروەها دەبێ

---

(١) سورەتی المؤمنون، ئایەی ١٤.

(٢) سورەتی الملك، ئایەی ٢١.

(٣) سورەتی یونس، ئایەی ٣.

(٤) سورەتی یوسف، ئایەی ٤٠.

باوەڕمان وابێ تێکڕای ئەم گەردوونە موڵکی ألله یە و هیچ کەسێک لە موڵکایەتییەکەیدا هاوبەشی نییە (واتە الملك)[1].

هەر بۆیەش ألله لەبارەی گاور و جولەکەکان ڕایگەیاند کەوا ئەوان قەشە و حاخامەکانیان کردبووە "أرباب"، ئەم وشەیەش کۆی وشەی "الرب" ـە.

ألله مەبەستی ئەوەیە کە ئەو گاور و جولەکانە یەکێک لە سیفەتەکانی ألله ـیان دابووە قەشەکانیان، ئەویش سیفەتی "الحاكمية" بوو. بەمەش موشریک بوون.

نموونەی تریش زۆرن لەو کارانەی ألله –تبارك وتعالى– کەوا لە کتێبەکەیدا باسی کردوونە و تەنها کاری ئەون و موسڵمان دەبێت بەتەواویی لەو کارانەیدا ألله بە پێشەنگ بزانێت، نابێ باوەڕمان وابێت کەسێک هاوبەشە لەگەڵ ألله لە یەکێک لەم کارانە. هەر کەسێک باوەڕی وابێت کەوا کەسێک هەیە و دەتوانێت بوونەوەرەکان دروست بکات، یان یاسا و شەریعەت دابڕێژێ، یان موڵکی ئەم گەردوونەی لەژێر دەستە و هتد...، ئەوا ئەو کەسە تەوحیدی نییە و موشریکە نەک موسڵمان؛ چونکە ئەم کارانە تەنها مافی ألله ـن.

## بابەتی هەشتەم: باوەڕهێنان و تەوحید کردنی ألله لەڕووی "الألوهية".

**توحيد الألوهية:** بریتییە لە تەنها کردنی ألله لە هەموو پەرستنێکمان، بۆیەش هەندێک لە زانایان پێی دەڵێن "توحيد العبادة".

واتە ئەگەر هەر پەرستن و عیبادەتێکمان ئەنجامدا ئەوا دەبێ تەنها و تەنها بۆ ألله بیکەین، نابێ هیچ مرۆڤێک یان گۆڕێک یان درەختێک یان مەزارێک بکەینە هاوبەشی ألله لەکاتی پەرستنەکانمان. خۆ ئەگەر هەر کەسێک پەرستنێک بۆ غەیری ألله بکات ئەوا شیرکی گەورەی ئەنجامداوە و لە چوارچێوەی ئیسلام دەچێتە دەرەوە.

---

(١) سوڕەتی الملك، ئایەی ١.

بێگومان پەرستنیش بە چوار جۆر ئەنجام دەدرێت و پێویستە بە هەر چوار جۆرەکەیەوە تەنها مەبەستمان ألله بێت، کە ئەمانەن:

١- پەرستن بە دڵ: بێگومان پەرستنی دڵ بریتییە لە "نیەت"، جا پێویستە ئەو نیەتەی لەناو دڵمانە بەجۆرێک پەروەردەی بکەین کە ئیتر ئەگەر بمانەوێ هەر قسە و کارێک بکەین ئەوا نیەتەکەمان تەنها لەپێناوی ألله بێت، واتە دەبێ ئیخلاس لەنێو دڵمان بچێنین.

بۆ نموونە "نووستن" کارێکی ئاساییە، بەڵام ئەگەر موسڵمانێک لەپێش نووستنیدا نیەتی ئەوەبێت کە خۆی بەهێز بکات تاکو دواتر شەونوێژ و عیبادەتی زۆرتر بکات، ئەوا تەنانەت نووستنەکەیشی بە خێر بۆی تۆمار دەکرێت.

٢- پەرستن بە دەم: نموونەی پەرستنەکانی دەم وەکو زیکر و سەڵەوات و خوێندنی قورئان و دوعا و پاڕانەوە و بانگەوازکردن و هتد...، پێویستە تێکڕای ئەم پەرستنانە بۆ ألله بکرێن، نابێ لەپێناوی هیچ کەسێکی تر بکرێن.

٣- پەرستن بە جەستە و کردار: نموونەی پەرستنە کردارییەکان وەکو نوێژ و ڕۆژوو و قوربانیکردن و جیهادکردن و حەج و هتد...، پێویستە ئەم پەرستنانە تەنها بۆ ألله بکرێن، نابێ لەپێناوی هیچ کەسێکی تر بکرێن.

٤- پەرستن بە ماڵ و سامان: نموونەی ئەم پەرستنانەش وەکو سەدەقە و خێر و زەکات، دەبێ نیەتمان لەمجۆرە پەرستنەش تەنها ڕەزامەندیی ألله بێت، ڕاستە تۆ پارەکەت دەدەیتە مرۆڤێک، بەڵام دەبێ نیەتت ئەوە بێت کەوا تۆ ئەم پەرستنە بۆ "ألله" دەکەیت نەک ڕەزامەندیی مرۆڤەکە.

ئاگاداربە خوێنەری بەڕێز، واجبە لەسەرت کەوا بەهەر چوار جۆرەکەی پەرستنەوە تەنها نیەتت ألله بێت، نابێ هیچ کەسێک یان شتێک بکرێتە هاوبەشی ألله لە پەرستنەکان، هەر کەسێک پەرستن بۆ غەیری ألله بکات ئەوا موشریکە بەبێ هیچ عوزر و بیانوویێک جگە لە "إکراه"، واتە زۆرلێکردن.

ألله له وەسفی کافرانی قورەیش فەرموویەتی: {**ألا لله الدين الخالص والذين اتخذوا من دونه أوليآء ما نعبدهم إلا ليقربونا إلى الله زلفى إن الله يحكم بينهم في ما هم فيه يختلفون إن الله لا يهدي من هو كاذب كفار**}[1]. واتە: {مەگەر دینداریکردنێکی دڵسۆزانە هەر شایەنی ألله نییە؟ ئەوانەیشی کە لە غەیری ألله ڕوویان کردووەتە کۆمەڵێک شتی تر ئەوا دەڵێن: ئێمە نایانپەرستین تەنها دەمانەوێ لە ألله نزیکمان بکەنەوە. بەڕاستیی ألله لە قیامەتدا حوکمیان لەنێوان دەدات لەو بابەتانەی کە تیایدا جیاوازبوون، بەڕاستی ألله هیدایەتی کەسێک نادات کە درۆزنێکی کافرە}.

ئەی قەومەکەم، ئەوەتا خۆ بینیتان ئەوانە باوەڕیشیان بە ألله هەبووە، هەروەها خۆیان وا پیشانداوە کە پەیکەرەکان ناپەرستن بەڵکو تەنها تەوەسولیان پێدەکەن بۆ لای ألله. بەڵام ألله لە ئایەتەکەدا بە "درۆزن" و "کافر" ناویانی هێنا؛ چونکە پەرستنیان بۆ غەیری ألله ئەنجامدەدا.

کەواتە ئەو کەسانەی کە لەم سەردەمەدا پەرستن بۆ "گۆڕ" و "ئیمام علي" و "عبدالقادر گەیلانی" دەکەن ئەوا هەموویان موشریکن؛ چونکە دوعا و پاڕانەوە یەکێکە لە پەرستنەکانی دەم، بۆیەش دەبێ تەنها بۆ ألله بکرێت، هەر چ کەسێک لە غەیری ألله بپاڕێتەوە یاخود ئاژەڵی بۆ سەربڕێ ئەوا موشریکە و تەوحیدی تێدا نییە.

## بابەتی نۆیەم: سێ مەرجەکەی پەرستنی ألله (حب وخوف ورجاء).

لە بابەتی پێشوودا زۆر بەکورتیی باسی "توحيد الألوهية" مان کرد، گووتمان دەبێ هەموو پەرستنەکان بۆ ألله ئەنجام بدرێن بەهەموو جۆرەکانیانەوە.

لەم بەشەدا باسی سێ ڕوکنەکەی پەرستن دەکەین، پێویستە لە هەموو پەرستنێکدا موسڵمان بەم سێ ڕوکنەوە پەرستنەکانی بکات:

---

(١) سورەتی الزمر، ئایەی ٣.

١- پەرستنەكان بە خۆشەویستییەوە بكات. (الحب).

بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله: **{ومن الناس من يتخذ من دون الله أندادا يحبونهم كحب الله والذين ءامنوا أشد حبا لله}**[(١)]. واتە: {لەناو خەڵكیدا كەسانێك هەن كەوا پەرستراوی تر دەپەرستن لە غەیری ألله، هەروەها خۆشیان دەوێن وەكو خۆشویستنی ألله، بەڵام ئەو كەسانەی ئیمانیان هێناوە (واتە موسڵمانان) ئەوا زۆر زیادتر خۆشەویستییان بۆ ألله هەیە}.

٢- پەرستنەكان بە ترسەوە بكات. (الخوف).

بەڵگەش بریتییە لە فەرمایشتی ألله: **{أولئك الذين يدعون يبتغون إلى ربهم وسيلة أيهم أقرب ويرجون رحمته ويخافون عذابه إن عذاب ربك كان محذورا}**[(٢)]. واتە: {ئەوانەی كە موشریكەكان لێیان دەپاڕێنەوە، ئەوانە خۆیشیان دەیانەوێ زۆرتر لە ألله نزیك ببنەوە، هەروەها ئومێدیان بە ڕەحمەتی ألله هەیە و لە سزاكەی دەترسن، بەڕاستی –ئەی محمد– سزای پەروەردگارت سزایەكی مەترسیدارە}.

مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە كە ئەو موشریكانەی "عیسا و عوزێر و فریشتە" دەپەرستن ئەوا با بزانن كەوا ئەم دوو پێغەمبەرە –علیهما السلام– لەگەڵ تێكڕای فریشتەكانیش خۆیان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەن زۆرتر لە ألله نزیك ببنەوە و داوای ڕەحمەتی ألله دەكەن و لە سزاكانی دەترسن سەرەڕای ئەوەی فریشتەن یاخود پێغەمبەرن.

٣- پەرستنەكان بە ئومێدی قەبوڵ بوونەوە بكات. (الرجاء).

بەڵگەش لەسەر ئەم ڕوكنەی پەرستن زۆرە، هەر ئایەتەكەی خاڵی دووەم بەڵگەی تێدایە لەبارەی ئەنجامدانی پەرستنەكان بە ئومێدەوە.

---

(١) سوڕەتی البقرة، ئایەی ١٦٥.

(٢) سوڕەتی الإسراء، ئایەی ٥٧.

لێرەدا دەبێ ئەوەش بزانین کەسانێکی چەواشەکار هەن و دەڵێن: پێویست ناکات لە ألله بترسین، بەڵکو پەرستنەکانمان تەنها لەبەر ئەوە دەکەین کەوا ألله مان خۆشدەوێت نەک لەبەر ئەوەی لێی بترسین.

پەنا بە ألله، نازانم ئەم کەسانە چۆن دەوێرن قسەی وابکەن، مەگەر لە لاپەڕی پێشوو لە خاڵی دووەمدا ألله پێمانی ڕانەگەیاندووە کە پێغەمبەر و فریشتەکان لە ألله دەترسن؟! ئیتر تۆیەک کەوا نە پێغەمبەریت و نە فریشتەی، چۆن دەتەوێ ڕوکنی ترسان (الخوف) تەرک بکەیت؟!

ئەی قەومەکەم، لەڕاستیدا پەرستن ئەو کاتە قەبوڵە کە موسڵمانە موەحیدەکە هەر سێ ڕوکنەکەی پەرستنی پێکەوە تێدا بێت.

**بابەتی دەیەم: باوەڕهێنان و تەوحید کردنی ألله لەڕووی "الأسماء والصفات".**

**توحيد الأسماء والصفات:** بریتییە لە تەوحید کردنی ألله لەڕووی ئەو ناو و سیفاتانەی کە لە قوڕئاندا وەسفی خۆی پێکردووە.

دەبێت بەجۆرێک لەم ناو و سیفاتانە تێبگەین کە ألله تیایاندا پێشەنگە و هیچ کەسێک هاوشێوە و هاوبەشی نییە.

ئەم تەوحیدەش بەشێکە لە تەوحیدی "الربوبية"، بەڵام زانایان لە کتێبەکانی بیروباوەڕدا وەکو لقێکی سەربەخۆ باسیان کردووە؛ بەهۆی فراوانییەکەیەوە.

خوێنەری بەڕێز، بزانە تێکڕای ئەو جەماعەتانەی کەموکوڕیان لە تەوحید هەیە ئەوا بە چوار شێواز هەڵساون بە ڕەتکردنەوەی ناو و سیفاتەکانی ألله، کە ئەمانەن:

١- تعطيل: واتە ڕەتکردنەوەی ناوێک یان سیفەتێکی ألله! –پەنا بە ألله–، بۆ نموونە ئەو کەسانەی کە دەڵێن ألله دەستی نییە لەکاتێکدا ألله لە کتێبەکەیدا پێمانی ڕاگەیاندووە کە دەستی هەیە(١). نەک هەر تەنها دەست، بەڵکو زۆر ناو و سیفەتی تریشیان لە ألله سەندووەتەوە لەکاتێکدا ألله –عز وجل– لەناو کتێبەکەیدا باسی سیفەتەکەی خۆی کردووە.

بۆیەش لەسەرمان واجبە هەر کاتێک لەناو قوڕئاندا ناوێک یاخود سیفەتێکی ألله مان خوێندەوە ئەوا دەبێ پڕ بەدڵمان دانی پێدابنێین و نەیخەینە تەرازووی عەقڵە سنووردارەکەمان.

٢- تكييف: واتە بە عەقڵی خۆمان بڵێین سیفەتەکانی ألله ئاوان و ئاوان! –پەنا بە ألله–، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بڵێت: بەرزیی ألله ئەوەندەیە...، یان بڵێت: ألله بەم شێوازە لەسەر کورسییەکەیەتی...، هەر چ کەسێک ئاوا بە عەقڵی خۆی بیر لە سیفەتەکانی ألله بکاتەوە ئەوا پێی دەبێتە تاغوت؛ چونکە قسەی لەسەر غەیبیاتی ألله کردووە.

٣- تحريف: واتە شێواندنی ناوێک یان سیفەتێکی ألله! –پەنا بە ألله–، زۆرجار ألله لە کتێبەکەیدا باسی ناوێک یان سیفەتێکی خۆی دەکات، کەچی کەسانێک دەڵێن: نا کاکە وانییە، ألله مەبەستێکی تری هەیە! بۆ نموونە: لە عەقیدەی ئەهلی سوننەدا ئێمە دانمان بەوەدا ناوە کەوا ألله –تبارك وتعالى– لەسەر عەرشەکەیەتی و لە ئاسماندایە، ئەمەش بەبەڵگەی ئایەت(٢) و فەرموودەی صحيح(٣)، کەچی کەسانێک دەڵێن: نەخێر ألله لە هەموو شوێنێک هەیە!، کەواتە ئایەت و سیفەتی ألله تحريف کرا. ئێمە دەڵێین ألله –جل وعلا– بە زانست و زانیارییەکەی لە هەموو شوێنێکە، بە

---

(١) سورەتی الفتح، ئایەی ١٠.
(٢) سورەتی طه، ئایەی ٥.
(٣) کتێبی صحيح مسلم > كتاب المساجد ومواضع الصلاة > باب تحريم الكلام في الصلاة ونسخ ما كان من إباحة > فەرموودەی ژمارە: ٥٣٧.

بیستن و بینینەکەی لە هەموو شوێنێکە[1]، بەڵام خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی، ئەمەیە ڕووکەشی ئایەتی قورئان و ئێمەش بۆمان نییە بیشێوێنین و بڵێین ألله مەبەستێکی تری هەیە!

٤- تمثیل: واتە لێکچوواندنی سیفەتێک یاخود ناوێکی ألله لەگەڵ بوونەوەرێکی تر! –پەنا بە ألله–، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک بڵێت: دەستەکانی ألله وەکو دەستی مرۆڤن و لە گۆشت و ئێسک پێکهاتوون! ئەوا ئەو کەسە کوفری کرد؛ چونکە سیفەتێکی پەروەردگار دەچووێنێت بە سیفەتێکی مرۆڤ!

خوێنەری ئەزیزم، بزانە ألله فەرموویەتی کەوا هیچ شتێک هاوشێوەی ئەو نییە و لە ئەو ناچێت[2].

بێگومان بابەتی "الأسماء والصفات" زۆر فراوانە، بەڵام لێرەدا پێویستە بڵێمەوە: دەبێ باوەڕمان وابێت کە ألله تاک و تەنهایە لە تێکڕای ناوەکانی و سیفەتەکانیدا، هیچ هاوبەشێکی نییە، هەروەها پێشەنگیشە لە تێکڕای سیفەتەکانیدا؛ ئەمەش چونکە بەشێک لە سیفەتەکانی ألله لە مرۆڤیش هەن، بەڵام لای مرۆڤ سنووردارە و کۆتایی پێدێ، کەچی لەلای ألله سیفەتەکە زۆر فراوانە و بێسنوورە و پێشەنگە. بۆ نموونە ألله زاتێکی بەبەزەییە (الرحمن)، هەروەها مرۆڤیش ڕەحم و بەزەیی لە دڵیدا هەیە، بەڵام ئایا بەزەیی ألله لەگەڵ مرۆڤەکان وەکو یەکترن؟ نەخێر. هەروەها ألله زاتێکی زیندووە (الحي)، هەروەها مرۆڤیش بوونەوەرێکی زیندووە، بەڵام ئایا مرۆڤ دەتوانێ وەکو ألله زیندوو و نەمر بێت؟ نەخێر.

هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێت سیفەتەکانی ألله هیچیان دروستکراو (مخلوق) نین، بەڵکو تایبەتمەندییەکی خودی ئەون (صفة)، بێگومان لەم باسەشدا کۆمەڵێک کەس دەڵێن: گوفتارەکان و سیفەتەکانی ألله بریتین لە دروستکراوی خۆی! ئەم

---

(١) سورەتی طه، ئایەی ٤٦.

(٢) سورەتی الفتح، ئایەی ١٠.

بیروباوەڕە کوفرە بە ئیجماعی زانایان هەر لە سەلەفەوە تاکو ئێستا. بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەم گومانەش، زانایان چەندین کتێبیان نووسیوە و خەڵکیان لە حەقیقەتی باسەکە هۆشیار کردووەتەوە.

خوێنەری ئازیزم، تاکە سەرچاوەیەک بۆ زانینی ناو و سیفەتەکانی ألله، بریتییە لە "قورئان" و "فەرموودەی صحیح"، بۆیەش هۆشداریتان پێدەدەم نەکەن گوێ لە کەسانێک بگرن ئەگەر باسی ناو و سیفاتەکانی ألله بکەن بەبێ هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی.

# ناوەڕۆکی کتێب

## بەشی دووەم

## وەڵام و هەڵوێستی ئێمە بەرامبەر دێمۆکڕاسیەت و دەنگدان، لەگەڵ وەڵامی گومانەکان

## بەشی سێیەم

## پەیامی تەوحیدم بۆتان ئامادە کردووە ئەی قەومەکەم

# کتێب و پەیامەکانی تری نووسەر

- پەیامێک لەبارەی حوکمی بەشداربوون لە هەڵمەتی گشتپرسیی. (کلیک لێرە بکە بۆ خوێندنەوەی).

وێنەی بەرگی کتێب

